ناوی کتێب: ئیناس
ناوی نووسەر: ئەیاد قونەیبی
وەرگێڕانی: ئەیاد فەهمی، ڕۆژان عادل وەرمەزیار
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٢٢٥)ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێ دراوە.







**ناوەندی ڕێنوێن**


**07511408868 - 07501269689**


**hakem1423@yahoo.com**
**renwen2009@yahoo.com**


**سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم**
**بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)**



# پێڕست



# پێشەکی

ئـەم ڕۆمانـە بـۆ ئـەو کەسـانەیە بـە دوای سـوود و چێـژ بینینـدا دەگەڕێـن.

ڕۆمانێکـی واقعییـە، وانـەی قوڵـی تێدایـە کـە گوشـراوی چەندیـن ئەزمـوون و دیمەنـە.

ئـەو برایانـەی ئـەم ڕۆمانـەم نیشـان داون کۆکبوون لەسـەر ئـەوەی لەگـەڵ بـەرەو پێشـچوونت لـە خوێندنـەوەی چیرۆکەکـەدا پەرۆشـییت زیـاد دەکات، بەجۆرێک پەیوەست دەبیت بە کۆتاییەکەیـەوە و ناتوانی بـەر لـە تـەواو کردنـی چیرۆکەکـە واز لـە خوێندنـەوەی بهێنیـت... خوێندنـەوەی ئـەم ڕۆمانـە تایبـەت نییـە بـە تەمەنێکـی دیاریکـراوەوە، بەڵکوو پێمـان وایە کە خوێندنـەوەی ئەم ڕۆمانە گونجاوە بۆ کەسـانی دوازدە و سـیانزە سـاڵ بەسـەرەوە...

ئـەم ڕۆمانـەم بەجۆرێـک نووسـیووە کـە خوێنـەر بتوانـێ بەتەنیـا بیخوێنێتـەوە، یـان بـاوک یـان دایک لەگـەڵ ڕۆڵەکانیـان بەشـێوەی بـەش بـەش ڕۆژانـە بیخوێننـەوە، ئـەو دەمـە خانەوادەکـە لەسـەر شـتێکی بەسـوود و چێژبەخـش کۆدەبنـەوە، پاشـان دەتوانـن مشـتومڕ لەسـەر هەڵوێسـت و سـوودەکانی بکـەن، دایبابیـش واتـاکان سـادە تـر بکـەن بـۆ منداڵـە بچوکەکانیـان... دابەشـم کـردووە بـۆ (٢٦) بـەش، هـەر بەشـێکیان نزیکـەی پـازدە خولـەک خوێندنـەوەی دەوێ...

**تێبینی:** ئەو ناوانەی لەناو ڕۆمانەکە ئاماژەیان پێ دراوە تەنیا بۆ نموونەن، گەر لێکچوونێک لەنێوان ناوەکان هەبوو، ئەوا مەبەست لە هیچ کەسێکی دیاری کراو نییە، مەبەستیشمان خراپ ناوبردنی هیچ بازرگانییەک نییە، چونکە هەر هەڵسوکەوت و کارێکی تێدا باس کرابێت ئەوا زۆر خەڵکی تریش تێی دەکەون.

**د. ئەیاد قونەیبی**



# لەکوێوە دەست پێ بکەم؟!

- صادق، من لە ڕێگام، تاکو پێکەوە بچین بۆ پێشوازی ئەشرەفی برات...

ئەمڕۆ خۆشیەکەمان دوو خۆشییە: لە تاقیکردنەوەکانت سەرکەوتو بوویت، ئەو چەرمەسەریەی ئەشرەف کە سێ ساڵی خایاند کۆتایی هات...

- ئااااهـ سێ ساڵ، گۆڕانکاری و ڕووداوەکانی ناوی چەندە زۆربوون، سەبارەت بە هەموو تەمەنی ڕابردووم! ئەوەتا سەرم سپی بووە و لەگەڵ ئەوەشدا هەمووی چەند مانگێکە سەر لە نوێ لەدایکبوومەتەوە!

- چۆن پێشوازی لە ئەشرەف بکەم؟ دەبێت زۆر بە ئاگابم بۆ ئەوەی بێزاری نەکەم!

هەرگیز سەرزەنشتی ناکەم لەسەر ئەو سەرشۆڕییەی هێنایە ڕێم، بەڵکوو قەرەبووی هەموو ئەو سۆز و گرنگی پێدانەی بۆ دەکەمەوە کە بەدرێژایی چەندین ساڵ لە دووری من بێبەش بووە لێی.

چۆن کاریگەری بخەمە سەری بۆ ئەوەی ڕێگا ڕاستەکە هەڵبژێرێت لە نێوان لایەکی دڵڕفێنی کۆشکەکەی باپیری و ژوورێکی شوقەیەکی سادە؟!

چۆن هـاوکاری بـم لـە دیـاری کردنـی ڕێگای ڕاسـت و بەرزکردنـەوەی خواسـتەکانی؟ تاکـو ئـەوەی پێشـتر تێیکەوتبـوو، لەمـەودوا تێینەکەوێتـەوە؟

گەنجێکی تەمـەن بیست و یـەک سـاڵ... هەمـان تەمەنی من کاتێک چوومـە نـاو گۆڕەپانی کێبڕکێیەکی هەڵـەوە! چۆن بـاوەڕی پێ بهێنـم کە نەچێتـە نـاو هەمـان گۆڕەپان و هەڵەکەی باوکی دووبـارە نەکاتەوە؟

صادقـی بـرای بکـەم کـە ئێسـتا هـەژدە سـاڵە چـۆن ئامـۆژگاری بکـەم لـەدوای سـەرکەوتنی لـە قۆناغـی ئامادەیی لەدەست نەچێت و ئەویـش نەکەوێتـە نـاو هەمـان گۆڕەپانـی هەڵـەوە؟!

ئامۆژگاری ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەم گەنجانـە سوودی نییـە... با بـە چیرۆک لەگەڵیان بدوێم...

چیـرۆک؟! حـەزە دڵخوازەکـەی ئیناسـی خوشـکیان، خوێندنـەوەی چیرۆکـە لەسـەر قەنەفـە، لەپاڵ کتێبخانـەی هۆڵی ئـەو ماڵـەی سـاڵانێک مـن و هەرسـێکیان و (حەنـان)ی دایکیـان تێیدا ژیایـن...

حەنـان! ئایـا بەزەییـم پێتـدا بێتـەوە یـان لێت توڕەبم؟! بـە دراوی هەسـت قـەرزاری تـۆم، خۆشتویسـتم و هەلـت پێـم بەخشـی... بـەم دواییانـەش نیگاکانـت کاتێـک تـکات لـێ دەکـردم زۆر ڕوون بـوون بـۆم... ئایـا ڕزگارکردنـی خـۆم بەسـە یـان دەسـتی یارمەتـی بۆتـۆش درێـژ بکـەم؟

بە چ چیرۆکێک کوڕەکانم بدوێنم؟... چ چیرۆکێک... چ چیرۆکێک...

بۆچی باسی چیرۆکی خۆمیان بۆ نەکەم؟!

چیرۆکی خۆم لەدەمێکدا ئەوەی ئەوان کوڕی منن؟!

بەڵـێ، ئـەوان لەگەڵـم بـوون و لەگەڵـم نەژیـان! کۆتاییەکانـی چیرۆکەکەمیـان بینیـوە بـەڵام دەسـتپێکەکەیان نەبینیـوە...

ئایا ڕووداوەکانی چل و پێنج ساڵی ژیانمیان بۆ بگێڕمەوە؟!

بەڵێ، لەچەند کاتژمێرێکدا کورتی دەکەمەوە بە ڕووداوە خێراکانیەوە، سوودە مەزنەکانی لەگەڵ ئازار و ئومێدەکانیدا... بەڵام ئایا ڕاشکاوبم لەگەڵیان وەک ئەو ڕۆژەی ئیناسم دوواند لەسەر کێشەکەم؟!

بەڵی، ڕاشکاو دەبم... گوشراوی ئەزموونەکانم پێشکەش بە کوڕەکانم دەکەم، بۆ ئەوەی وەک خواردنەوەیەک بێت و بەرگرییان بەرز بکاتەوە، دەیان ساڵی تەمەنیان نەگلێنە ناو گومڕایی و سەرگەردانی...

باسی ئەوەیان بۆ دەکەم چۆن مرۆڤ دەگات بە هەموو خەونەکانی و لە هەمان کاتدا پێی نەگەیشتووە! یان باجی ئەوەی لە شوێنێکدا چاڵ هەڵبکەنیت و بەدوای گەنجینەدا بگەڕێیت، دوای ماوەیەکی زۆر بۆت دەر بکەوێت لەشوێنێکی هەڵەدا بووە! یان نوقم بوون لە ناو گێژەلووکەی لمی بیابان و ئەشکەنجە بە خۆشگوزەرانی و خواردنەوە لە ئاوی دەریادا!

لەبارەی باوکمەوە بۆیان دەدوێم کە تۆوێکی لەدڵمدا چاند، نەڕووا و بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ بەرەکەی نەبینرا، بەڵام تۆوەکە نەمرد!

لەبارەی دایکمەوە بۆیان دەدوێم کە بۆ چەندین ساڵ برینێکی قوڵی تێدا دروست کردم هەتا مژدەکەم پێ گەیشت...

لەبارەی (ئەمجەد)ی مامیان بۆیان دەدوێم، کە تەنیا ژووری دایکم لە نێوانماندابوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە جیهانی ڕۆحدا ساڵانێکی ڕووناکی نێوانمان بوو!

سەبارەت بەو پارچە کاغەزە بۆیان دەدوێم کە زۆر بەوردی لە ژووری دایکم، لە دۆڵابەکانی، ژێر سەرینەکەی، تەختەی خەوەکەی و لە هەموو سوچێکی ژوورەکەیدا بەدوایدا دەگەڕام...

لەبارەی گەڕانێکی هاوشێوەی ئەوە دوای ٢٣ ساڵ!

لەبارەی قوربانی یەکەمم و ئەو سێ وشەی کە تۆقاندمی بۆیان دەدوێم، دواتر ئەو نامەیەی لەدوای ساڵانێکی دوور و درێژ بۆی ناردم...

باسی ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەیان بۆ دەکەم کە چەندین جار بەسەر سەعیدی برامدا دامخستەوە و پاشان ئاواتەخوازبووم کە وەڵامم بدایەتەوە!

لەبارەی ئەو خەڵەتاندنەی بەرگی دانایی دەپۆشێت و خۆخەڵەتاندن و هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ بە ئاگا هاتنی ڕووح وەک ئەوەی بڵێی دەکرێت دوابخرێت، بە نیەتی ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەکرێت بە دوگمەیەک ئامادە ببێتەوە!

سەبارەت بەو هەستە دەدوێم کە نەتوانیت واز لەو شتانە بهێنیت کە ڕاهاتووی لەسەری گەرچی چێژیشی لێ نابەیت بەڵکوو باش دەزانیت زیانت لێ دەدات...

لەسەر بێلایەنی درۆینە بۆیان دەدوێم... کاتێک مرۆڤ خۆی بێخەبەر دەکات لەوەی دەستی نەبووە لەو ئازاردانەدا کە دەکرا ڕێگری بکات لە ڕوودانیان... بەڵام نایکات چونکە ڕازییە بە دەرەنجامەکەی.

لەسەر بوێری کچێک بۆیان دەدوێم کە بڕیاریدا پێچەوانەی دایک و باوکە خراپەکەی بکات و ڕێگەی بەخۆی نەدا ببێتە بەشێک لە دیکۆری کەسایەتییان!

لەبارەی ئەو ڕۆژە بۆیان دەدوێم کە ئاواتەخوازبووم خۆری ئەو ڕۆژە ئاوا نەبێت، لەگەڵ ئەوەی ڕۆژێکی جوانیش نەبوو!

لەبارەی ترسناکی ئەو کۆتەی خۆت دەیخەیتە ملت بۆیان دەدوێم!

لەبارەی هەموو ئەوانە بۆیان دەدوێم، بەڵام ئایا بەرگەی ئازارەکەی ناوی دەگرم؟ ئایا ئەشرەف و صادق لەگەڵم بەرگەی دەگرن؟

لەسەرمە بەرگە بگرم، چونکە کۆتایی چیرۆکەکەم خەماوی نییە... ڕووداوەکانی ئازاری لە دایکبونێکی نوێن.

لە کوێوە لەگەڵ کوڕەکانم دەست پێبکەم؟

لەوانەیە لە دیمەنێکی ڕۆژێکی ئاسایی پێش سی و پێنج ساڵ دەست پێ بکەم، کە وێنای کەسایەتی من و کەسایەتی باوکم و دایکم و خوشک و براکانم دەکات، لەو ڕۆژەی لە تەمەنی دە ساڵیدا بووم...

ئەو ڕۆژەی بە دەنگی باوکم (باوکی سەعید) هەستام:

- کوڕم هەستە! سەمیر هەستە... کاتژمێر حەوت و نیوە بۆ پاسی قوتابخانە دوا دەکەویت... نە دینت هەیە و نە دونیا، نە نوێژی بەیانیت کردووە و نە نانی بەیانیت لەگەڵمان خواردووە، نە خۆت ئامادە کردووە بۆ قوتابخانە.

باوکم... پیاوە توڕە و باشەکە، خاوەن فرۆشگای (ئوسرە)، ئەو فرۆشگایەی بۆ ماوەیەکی زۆر تێیدا تێکۆشا بۆ ئەوەی خەرجیمان بکێشێت و خۆی و خانەوادەکەی بەدوور بگرێت لەوەی موحتاجی دەستی کەس ببن لەو بارودۆخە سەختەی وڵات پێیدا تێپەڕی...

ئەو ڕۆژەی گوێم لە گفتی دایکم (دایکی سەعید) کە بە باوکمی وت:

- باوکی سەعید! بەم شێوازەش نا.

ئەو دایکە بەسۆزەم کە لەسەرەتای لاوێتیدا هاوسەرگیری لەگەڵ باوکمدا کردووە، لە ساڵانی سەرەتای هاوسەرگیرییەکەیاندا بەرگەی ناخۆشی ونەداری گرتووە، بە وەفا و بە ئەمەک بووە بۆی و دایکێکی بەسۆزە بۆمان!

ئەو ڕۆژەی بە بۆنی هێلکەوڕۆن بە ڕۆنی خۆماڵی و چای بە نەعنا و پاشماوەی نانی بەیانییەکە هەڵسام، بەگیانێکی قورسەوە هەڵسام چونکە هەتا درەنگانێکی شەو بە دیار تابلێتەکەمەوە بێداربووم کە لە باوکم شاردبوویەوە...

کە هەستام سەعیدی براگەورەمم بینی کە تەمەنی شانزە ساڵانە، پۆشاکێکی کەشخەی لەبەر بوو، ئاوی ڕووەکەکانیماڵەوەی دەدا...

تالەم بینی، ئەو کچە ناسکە پانزە ساڵانە، کتێبە دڵخوازەکەی (لە خۆت تێبگە)ی بەدەستەوەبوو، لە باوکمی دەڕوانی لەکاتێکدا بە قسە دایدەشۆریم... برۆکانی دەجوڵاند و لێوەکانی دەگەست و سەری دەلەقاند وەک ئەوەی پێی دەڵێت:

- «هەڵەیە، باوکە هەڵەیە... ئەمانە پەیامی نەرێنین و لە دەروونی سەمیر کەڵەکە دەبن»... بە دەستەواژەی هاوشێوەی ئەمەیش کە ئێمە دەمانوت «فەلسەفەمان بەسەردا لێ دەدات» لەبەر زۆری خوێندنەوەی بۆ کتێبی دەروونی و پەروەردەیی.

پاشان بە جلی خەو و قژێکی ئاڵۆسکاوەوە لەسەر مێز دانیشتم هەتا ئەوە بخۆم کە ماوە، دووبارە باوکم بە قسە دای شۆریم:

- «هەزار جار پێم وتی پێش ئەوەی نان بخۆیت دەستت بشۆ»... منیش ڕووم دەکردە دەستشۆری چێشتخانەکە...

لەوێش عاسمی دوانزە ساڵ دەبینم لەگەڵ دایکم دەفرەکان دەشوات، دایکیشم پێی دەڵێت -بە ئەنقەستیش وا دەکات بۆ ئەوەی گوێبیستی ببم-:

- عاسم تەواو، خوا لێت ڕازی بێت، ئەوەندە بەس بوو کە بە ئامادەکرنی نانی بەیانی ئێمەت شۆک کرد... تالە وەرە یارمەتیم بدە، خوێندنەوە بەسە، با عاسم خۆی بۆ قوتابخانە ئامادە بکات...

بەرەو دەستشۆرەکە دەچمە پێش، وەک بڵێی کەسی لەسەر نییە، عاسمیش بە ناڕەحەتییەوە سەیرم دەکات، منیش سەیری دەکەم و لەکاتێکدا بیستۆکە پزیشکییەکانی خستۆتە گوێی، چونکە دەناڵێنێت بەدەست کێشەی بیستنەوە، بە چاوەکانی ئاماژە بەوە دەکات کە: «هیچ نەبێ بەیانی باش لە دایکت بکە»!

- «خودا بەیانیت باشبکات دایکە»... دواتر دەگەڕێمەوە بۆ سەر مێزی نان خواردن.

خواردنەکەم تەواو دەکەم، ڕوودەکەمە ژوورە هاوبەشەکەم لەگەڵ ئەمجەدی هەشت ساڵە (بنەبۆڵە)ی ماڵەکەمان، لەناو کتێب و تیانووسە تێکەڵ و پێکەڵەکانیدا دەگەڕێت و داوا لە تالە دەکات لە گەڕان یارمەتی بدات، بۆ ئەوەی مامۆستا سەرزەنشتی نەکات، بەتایبەت کە دەیەوێ ئاژاوەیەک بنێتەوە و (شەڕە پشیلەیەک) بکات لەسەر تیانوسی ئەحمەدی هاوپۆلی، هەر وەک چۆن ئەحمەدیش دوێنێ وای لێکردبوو، دەیەوێت بە ئامادەکارییەکی باشەوە بچێتە پۆل و مامۆستا کتێب و دەفتەرەکانی بەباشی ببینێت...

سەعید و تالە و عاسم بە ئۆتۆمبێلی (سوهەیب)ی مامی بچوکمان دەڕۆن بۆ قوتابخانەکەیان. دواتر پاسی قوتابخانەی من و ئەمجەدی برام دێت... ئەویش دەڕواتە دەرەوە و منیش دوا دەکەوم... پاسەکەش گەڕەکەکە بە دەنگی ژاوە ژاوی هۆرین دەتەنێت، وەک چۆن ئەوە زۆرجار دووبارە دەبێتەوە، منیش دەردەچم و کراسەکەم دەخەمە ناو پانتۆڵەکەم و جانتاکەشم کراوەیە، قەیتانی پێڵاوەکەم نەبەستراوە، قژم ئاڵۆسکاوە...

هههە! یادگاری ماڵەکەمان لە گەڕەکی سەرایا... ئەو گەڕەکەی کە ئێستا بینای بەرز و نووسینگە و فرۆشگای بازرگانی جێی ماڵە سادەکانی گرتۆتەوە...

بەم یادگارییانە بۆ کوڕەکانم دەست پێ دەکەم، پاشان قۆناغەکانیان بۆ دەبڕم و مەودا کاتییەکانیان بۆ کورت دەکەمەوە، بۆ ئەوەی لەسەر وردەکاری و پەندەکانی ژیانم لەگەڵیان بوەستم...

صادق سەرکەوتە ناو ئۆتۆمبێلەکە و بێدەنگی باوکی پچڕاند...

لێیان دەگەڕێین بەڕێ بکەون بۆ پێشوازی کردن لە ئەشرەف، دواتر دەگەڕێینەوە ئەو شوێنەی سەمیرمان لێی بەجێ هێشت لە چیرۆکەکەیدا، با پێنج ساڵی بەسەردا تێ بپەڕێنین، لەو کاتەی سەمیر بووە پازدە ساڵ...

***

باوکی سەعید بەساڵاچووە و ماسولکەکانی دڵی لاوازبووە، چیدی ناتوانێت بە تەنیا کاری بەقاڵییەکەی بکات... چەند کەسێکی تاقی کردەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا کاربکەن، بەڵام کەسی گونجاوی نەدۆزیەوە، چونکە زۆر تووڕەبوو بەرگەی هەڵەی شاگردەکانی نەدەگرت.

سەعیدیش دەگەیشتە خوێندنی ساڵی چوارەمی ئەندازیاری شارستانی...

لەهەمان کاتدا عاسمی تەمەن حەڤدە ساڵ، خولیای ئەوەی هەیە دیزاینی ئامێری هاوکاریکەر بۆ بیستن بخوێنێت و لەم بوارەدا دەر بکەوێت، بۆ ئەوەی هاوکاری ئەوانە بکات وەک خۆی دەناڵێنن...

ڕۆژێک لە قوتابخانە دێتەوە دەبینێت باوکی هەناسەبڕکێیەتی و دەستی لەسەر سەری داناوە بە نارەحەتییەکی ڕوونەوە:

- باوەگیان، ئەوە چیتە؟

- هیچ نییە... کوڕم ئەم کارتۆنە بخە سەر ئەم ڕەفەیە.

باوکی سەعید هەوڵی دابوو هەڵی بگرێت، بەڵام قورسبوو بۆ دڵە لاوازەکەی، بۆیە لەدەستی کەوتبووە خوارەوە...

دیمەنەکە کاریگەری هەبوو بەسەر عاسمەوە... کەوتە نێوان دوو بەرداشەوە: خەونی دیزاینکردنی بیستۆک لەلایەک، کەم کردنەوەی ئەرکی باوکی لەلایەک، دوای چەن ڕۆژێک بە باوکی ڕاگەیاند کە واز لەخوێندن دەهێنێت، هەتا لە کاری فرۆشگاکە پاڵپشتی بێت.

باوکی هەوڵیدا ڕێگری لێ بکات، بەڵام عاسم پێداگربوو، لەڕاستیدا باوکی بەوە دڵخۆش بوو، چونکە پێویستی بە کەسێک بوو پاڵپشتی بێت لە کارەکەیدا.

عاسم گۆڕانکارییەکی دروست کرد لە فرۆشگای (ئوسرە)دا، کەشێکی نوێی هێنایە کایەوە، لە هەمان کاتدا کڕیارەکان هەندێک جار پێویست بوو دەنگیان بەرز بکەنەوە بۆ ئەوەی عاسم گوێبیستیان بێت، بەڵام هەڵسوکەوت و مامەڵەی جوانی ئەو وای دەکرد هەردەم ئەویان پێ باشتر بێ لە مامەڵەی کەسی تر.

تالەش چووە کۆلێژی زانستی دەروونناسی، بەڵام ئەوەی دەیویست لە تێگەیشتنی دەروونی مرۆیی و زانینی کارەکتەری ئارامبەخشیی لەوێدا نەیبینەوە. مشتومڕکردنی لەگەڵ ئەو هاوپۆلانەی لەخۆی گەورەترن وای کرد هەست بکات ساڵانی داهاتووی زۆر باشتر نابێت. بۆیە وازی لە خوێندنی کۆلێژ هێنا، بەخۆشەویستی و گرنگییەکی زۆرەوە لە خوێندنەوە و ئامادەبوونی کۆرسی تایبەت بە پەروەردە و دەروونڕوستی بەردەوام بوو.

ئەمجەد ئێستا لە سێزدەیەم ساڵی تەمەنیەتی، کەسایەتییەکەی ڕەنگدانەوەی کەسایەتی تالە بوو، هەم خوشکی بوو، هەم هاوڕێ... ئامانجێکی بۆخۆی دانابوو، ببێت بە پزیشک، بۆیە بەجددی سەعی دەکرد لەو وانە و توێژینەوانەی هاوکاریان دەکرد بۆ بەدیهێنانی

ئامانجەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام دەچووە دوکانەکەیان بۆ ئەوەی هاوکاری باوکی و عاسم بکات.

لە هەموو ئەمانەدا سەمیر لەکوێیە؟ باوکی لە قوتابخانە تایبەتەکان خەرجییەکی زۆری بۆ کرد، هیچ سودی نەبوو... بۆیە بڕیاریدا ئەم ساڵ بۆ قوتابخانەیەک بیگوازێتەوە خەرجی کەم تربێت... سەمیر بەرهەڵستی لەمە کرد، چونکە سەبووری بە هاوڕێکانی قوتابخانەی دەهات.

لەو ساتەدا باوکی سەعید مێشکی ساف بوو... بە تۆنێکی ئارامەوە وتی:

- کوڕم تۆ بۆ خۆشی خۆت و کەیف و سەفا دەڕۆیتە قوتابخانە، منیش ماندووبووم ئەوەندە قیستی قوتابخانەم بۆ دایت، هەمووشی بێ سوود بوو.

- باوکە بەڵێن دەدەم هیممەتم بەرزکەمەوە... تەنیا چانسێکم بدەرێ.

- پێشتر چانسی زۆرم داوە پێت و هەڕەشەی گواستنەوەم لێ کردوویت، هەموو جارێک بەڵێن دەدەیت و بەڵێنەکەت دەشکێنیت.

- با کۆتا چانس بێ باوکە... باوەڕکە ئەم جارەیان دەگۆڕێم.

باوکی سەعید بەزەیی بە کوڕەکەیدا هاتەوە و لە قوتابخانەکەی هێشتییەوە، بەڵام بە چەند مەرجێک:

- باشە، لەدوای پێنجی ئێوارە نابێت هیچ جۆرە ئامێرێکی ئەلیکترۆنی بەدەستەوە بگریت، پێویستە دانە بە دانەی وانەکانت بخوێنیت. لە هەمووی گرنگتر پارێزگاری لە نوێژەکانت بکەیت.

- باشە، ڕازیم.

سەمیر دوای ئەوە بەرەو باشتربوون ڕۆیشت، پابەندبوو بە نوێژەکانیەوە، بەڕاستی دەستی بە خوێندنی وانەکانی کرد، بەڵام زۆر بەم شێوەیە نەمایەوە و دیسان هاتەوە سەرخۆ خافڵاندن لە وانەکانی...

ئەمە بووە هۆی تووڕەبوونی باوکی... لێرەدا دایکی هاتە ناو باسەکە و داوای لە تالە کرد قسە لەگەڵ سەمیر بکات...

سەمیر لەسەر کورسییەکەی پاڵی دابوویەوە، قاچی لەسەر قاچ دانابوو و وتی:

- بۆچی لە باسی قوتابخانە هەر بە دوامەوەن؟ عاسم لە قوتابخانە دەرچوو و تۆش کۆلێژت تەواو کرد... ماشەڵڵاتان لێبێ ئەوەتا ئێوە کامەرانن.

- سەمیر، بابەتی ئێمە کۆلیژ و قوتابخانە نییە، بابەتی ئێمە ئەوەیە کە دەبێت جددی بیت لەوەی کە تێیدایت، دەبێت پڕۆژەیەکت هەبێ لەسەری کار بکەیت، عاسم هاوکاری باوکم دەکات، من فێر دەبم و فێر دەکەم... تۆ پڕۆژەت چییە؟ گەر بێت و واز لە قوتابخانە بێنیت و فێری شتێکی سوودبەخش ببیت ئەوا لۆمەمان نەدەکردی.

- من تەمەنم پانزە ساڵە و دەتەوێ پڕۆژەم هەبێ؟!

- بێگومان، بەڵکوو دەبووایە پێش ئێستا هەتبوایە.

مشتومڕەکە درێژەی کێشا و سەمیریش دەستی کردە گاڵتەوگەپ و خۆدزینەوە...

لە کۆتایی ساڵدا باوکی بڕیاریدا سەمیر لە قوتابخانە دەربکات، دەستی کرد بە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی پیشەیەک بۆ سەمیر بۆ ئەوەی لەڕێیەوە بژێوی خۆی پەیدا بکات. بەڵام لەو کارانەی دەچووە سەری لە هیچیاندا جددی نەبوو!

وازی لەکاری دارتاشی هێنا، چونکە وەستاکە ماندووی دەکرد...

لە کارکردن لە چێشتخانە وازی هێنا، چونکە شاگردەکانی ئەوێ جار جارە داوایان لێ دەکرد ناو چێشتخانەکە خاوێن بکاتەوە...

دواتر کارکردنی لەلای ئامۆزا فیتەرەکەی جێ هێشت، چونکە دوکانەکە بۆنی ناخۆشی لێ دەهات!

بەم یادگارییانە بۆ کورەکانم دەست پێ دەکەم، پاشان قۆناغەکانیان بۆ دەبڕم و مەودا کاتییەکانیان بۆ کورت دەکەمەوە، بۆ ئەوەی لەسەر وردەکاری و پەندەکانی ژیانم لەگەڵیان بوەستم...

صادق سەرکەوتە ناو ئۆتۆمبێلەکە و بێدەنگی باوکی پچڕاند...

لێیان دەگەڕێین بەڕێ بکەون بۆ پێشوازی کردن لە ئەشرەف، دواتر دەگەڕێینەوە ئەو شوێنەی سەمیرمان لێی بەجێ هێشت لە چیرۆکەکەیدا، با پێنج ساڵی بەسەردا تێ بپەڕێنین، لەو کاتەی سەمیر بووە پازدە ساڵ...

***

باوکی سەعید بەساڵاچووە و ماسولکەکانی دڵی لاوازبووە، چیدی ناتوانێت بە تەنیا کاری بەقاڵییەکەی بکات... چەند کەسێکی تاقی کردەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا کاربکەن، بەڵام کەسی گونجاوی نەدۆزیەوە، چونکە زۆر تووڕەبوو بەرگەی هەڵەی شاگردەکانی نەدەگرت.

سەعیدیش دەگەیشتە خوێندنی ساڵی چوارەمی ئەندازیاری شارستانی...

لەهەمان کاتدا عاسمی تەمەن حەڤدە ساڵ، خولیای ئەوەی هەیە دیزاینی ئامێری هاوکاریکەر بۆ بیستن بخوێنێت و لەم بوارەدا دەر بکەوێت، بۆ ئەوەی هاوکاری ئەوانە بکات وەک خۆی دەناڵێنن... ڕۆژێک لە قوتابخانە دێتەوە دەبینێت باوکی هەناسەبڕکێیەتی و دەستی لەسەر سەری داناوە بە نارەحەتییەکی ڕوونەوە:

- باوەگیان، ئەوە چیتە؟

- هیچ نییە... کورم ئەم کارتۆنە بخە سەر ئەم ڕەفەیە.

باوکی سەعید هەوڵی دابوو هەڵی بگرێت، بەڵام قورسبوو بۆ دڵە لاوازەکەی، بۆیە لەدەستی کەوتبووە خوارەوە...

دیمەنەکە کاریگەری هەبوو بەسەر عاسمەوە... کەوتە نێوان دوو بەرداشەوە: خەونی دیزاینکردنی بیستۆک لەلایەک، کەم کردنەوەی ئەرکی باوکی لەلایەک، دوای چەن ڕۆژێک بە باوکی ڕاگەیاند کە واز لەخوێندن دەهێنێت، هەتا لە کاری فرۆشگاکە پاڵپشتی بێت.

باوکی هەوڵیدا ڕێگری لێ بکات، بەڵام عاسم پێداگربوو، لەڕاستیدا باوکی بەوە دڵخۆش بوو، چونکە پێویستی بە کەسێک بوو پاڵپشتی بێت لە کارەکەیدا.

عاسم گۆڕانکارییەکی دروست کرد لە فرۆشگای (ئوسرە)دا، کەشێکی نوێی هێنایە کایەوە، لە هەمان کاتدا کڕیارەکان هەندێک جار پێویست بوو دەنگیان بەرز بکەنەوە بۆ ئەوەی عاسم گوێبیستیان بێت، بەڵام هەڵسوکەوت و مامەڵەی جوانی ئەو وای دەکرد هەردەم ئەویان پێ باشتر بێ لە مامەڵەی کەسی تر.

تالەش چووە کۆلێژی زانستی دەروونناسی، بەڵام ئەوەی دەیویست لە تێگەیشتنی دەروونی مرۆیی و زانینی کارەکتەری ئارامبەخشیی لەوێدا نەیبینەوە. مشتومڕکردنی لەگەڵ ئەو هاوپۆلانەی لەخۆی گەورەترن وای کرد هەست بکات ساڵانی داهاتووی زۆر باشتر نابێت. بۆیە وازی لە خوێندنی کۆلێژ هێنا، بەخۆشەویستی و گرنگییەکی زۆرەوە لە خوێندنەوە و ئامادەبوونی کۆرسی تایبەت بە پەروەردە و دەروونڕووستی بەردەوام بوو.

ئەمجەد ئێستا لە سێزدەیەم ساڵی تەمەنیەتی، کەسایەتییەکەی ڕەنگدانەوەی کەسایەتی تالە بوو، هەم خوشکی بوو، هەم هاوڕێ... ئامانجێکی بۆخۆی دانابوو، ببێت بە پزیشک، بۆیە بەجددی سەعی دەکرد لەو وانە و توێژینەوانەی هاوکاریان دەکرد بۆ بەدیهێنانی

ئامانجەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام دەچووە دوکانەکەیان بۆ ئەوەی هاوکاری باوکی و عاسم بکات.

لە هەموو ئەمانەدا سەمیر لەکوێیە؟ باوکی لە قوتابخانە تایبەتەکان خەرجییەکی زۆری بۆ کرد، هیچ سودی نەبوو... بۆیە بڕیاریدا ئەم ساڵ بۆ قوتابخانەیەک بیگوازێتەوە خەرجی کەم تربێت... سەمیر بەرهەڵستی لەمە کرد، چونکە سەبووری بە هاوڕێکانی قوتابخانەی دەهات.

لەو ساتەدا باوکی سەعید مێشکی ساف بوو... بە تۆنێکی ئارامەوە وتی:

- کوڕم تۆ بۆ خۆشی خۆت و کەیف و سەفا دەڕۆیتە قوتابخانە، منیش ماندووبووم ئەوەندە قیستی قوتابخانەم بۆ دایت، هەمووشی بێ سوود بوو.

- باوکە بەڵێن دەدەم هیممەتم بەرزکەمەوە... تەنیا چانسێکم بدەرێ.

- پێشتر چانسی زۆرم داوە پێت و هەڕەشەی گواستنەوەم لێ کردوویت، هەموو جارێک بەڵێن دەدەیت و بەڵێنەکەت دەشکێنیت.

- با کۆتا چانس بێ باوکە... باوەڕکە ئەم جارەیان دەگۆڕێم.

باوکی سەعید بەزەیی بە کوڕەکەیدا هاتەوە و لە قوتابخانەکەی هێشتییەوە، بەڵام بە چەند مەرجێک:

- باشە، لەدوای پێنجی ئێوارە نابێت هیچ جۆرە ئامێرێکی ئەلیکترۆنی بەدەستەوە بگریت، پێویستە دانە بە دانەی وانەکانت بخوێنیت. لە هەمووی گرنگتر پارێزگاری لە نوێژەکانت بکەیت.

- باشە، ڕازیم.

سەمیر دوای ئەوە بەرەو باشتربوون ڕۆیشت، پابەندبوو بە نوێژەکانیەوە، بەڕاستی دەستی بە خوێندنی وانەکانی کرد، بەڵام زۆر بەم شێوەیە نەمایەوە و دیسان هاتەوە سەرخۆ خافڵاندن لە وانەکانی...

ئەمـە بـووە هـۆی تووڕەبوونـی باوکـی... لێرەدا دایکـی هاتـە نـاو باسـەکە و داوای لـە تالـە کـرد قسـە لەگـەڵ سـەمیر بـکات...

سـەمیر لەسـەر کورسییەکەی پاڵی دابوویـەوە، قاچی لەسـەر قـاچ دانابـوو و وتـی:

- بۆچی لـە باسـی قوتابخانـە هـەر بـە دوامـەوەن؟ عاسـم لـە قوتابخانـە دەرچـوو و تـۆش کۆلێـژت تـەواو کـرد... ماشـەڵلاتان لێبـێ ئەوەتـا ئێوە کامەرانـن.

- سـەمیر، بابەتـی ئێمـە کۆلیـژ و قوتابخانـە نییـە، بابەتـی ئێمـە ئەوەیـە کـە دەبێت جددی بیت لـەوەی کـە تێیدایت، دەبێت پرۆژەیەکت هەبێ لەسـەری کار بکەیت، عاسـم هـاوکاری باوکـم دەکات، مـن فێر دەبم و فێر دەکـەم... تـۆ پرۆژەت چییـە؟ گـەر بێت و واز لـە قوتابخانـە بێنیت و فێری شـتێکی سـوودبەخش ببیت ئـەوا لۆمەمـان نەدەکـردی.

- من تەمەنم پانزە ساڵە و دەتەوێ پرۆژەم هەبێ؟!

- بێگومان، بەڵکوو دەبووایە پێش ئێستا هەتبوایە.

مشـتومڕەکە درێژەی کێشـا و سـەمیریش دەسـتی کردە گاڵتەوگەپ و خۆدزینەوە...

لـە کۆتایـی سـاڵدا باوکـی بڕیاریدا سـەمیر لـە قوتابخانـە دەربکات، دەسـتی کـرد بـە گـەڕان بـەدوای دۆزینـەوەی پیشـەیەک بـۆ سـەمیر بـۆ ئـەوەی لەڕێیـەوە بژێـوی خـۆی پەیدا بـکات. بـەڵام لـەو کارانـەی دەچـووە سـەری لـە هیچیانـدا جـددی نەبـوو!

وازی لەکاری دارتاشی هێنا، چونکە وەستاکە ماندووی دەکرد...

لـە کارکـردن لـە چێشـتخانە وازی هێنا، چونکـە شـاگردەکانی ئـەوێ جـار جـارە داوایـان لـێ دەکـرد نـاو چێشـتخانەکە خاوێـن بکاتـەوە...

دواتـر کارکردنـی لـەلای ئامـۆزا فیتەرەکـەی جـێ هێشـت، چونکـە دوکانەکـە بۆنـی ناخۆشـی لـێ دەهـات!

دواتر وازی لە کۆرسی دیزاینی سایتەکانی ئینتەرنێت هێنا، چونکە بەلایەوە ئاڵۆزبوو... دواتر وازی لە کۆرسی چاککردنەوەی مۆبایل هێنا، چونکە ئەو سەنتەرەی کۆرسەکەی لێ پێشکەش دەکرا دووربوو، هۆکارەکانی گواستنەوەیش ماندووی دەکردن...

لە کۆتاییدا باوکی سەعید بڕیاریدا دڵی خۆی لەوە زیاتر ماندوو نەکات -لەڕاستیدا هەر خۆی ماندووبوو- خۆی بەدەستەوەدا و دەستی لە سەمیر هەڵگرت، چیدی نە فەرمانی پێ دەکرد و نە ڕێگری لێ دەکرد و نە ڕێنموونی دەکرد، تەنیا ئەوە نەبێت جار جارە بە قسە پێیدا دەهاتە خوارەوە...

***

پێنج ساڵ تێپەڕی... سەعید کۆلێژی تەواو کرد و لە کۆمپانیایەکی ئەندازیاری دەستبەکاربوو و ژیانی هاوسەری پێکهێنا، خودا کوڕێکی بە ناوی (عەبدوڕەحمان) و کچێکی بەناوی (لینا) پێبەخشی، ئێستا لە بیست و شەشەم ساڵی تەمەنیەتی، خۆشەویستە و بەجوانی کارەکەی دەکات، سادەییەکەی هەیبەتێکی پێ بەخشیوە...

تالە، کچێکی بیست و پێنج ساڵە، ژیانی هاوسەری لەگەڵ ئامۆزاکەی پێک هێناوە و دوو منداڵی هەیە، (عائیشە و مەحمود)... سەرەڕای بچوکی تەمەنی ناوێکی ناسراوی پەیدا کردووە لە کۆرسەکانی پەروەردە و دەروونددرووستیدا. ژیانی لەگەڵی هاوسەرەکەی بە هەندێک کەند و کۆسپدا تێپەڕی لەبەر زوو هەڵچوونی هاوسەرەکەی... نەشیتوانی بەو زانستەی لە دەروونناسی هەیەتی سروشتی ئەم پیاوەی زۆر بگۆڕێت، لێ بە تێپەڕبوونی کات زیاتر و زیاتر لێی تێگەیشت...

عاسم، پشت و پەنای باوکی، فرۆشگاکەی فراوانتر کرد و جۆرەکانی زیاد کرد. ئەو لە ئێستادا بیست و دوو ساڵە، کچی هاورێ لەحیمچییەکەی باوکی مارە کردووە، ئەوەش سەیرە دوو ساڵ دەبێ عاسم دەستی بە جگەرە کێشان کردووە، بەڵام سووربوو لەسەر نەفرۆشتنی جگەرە -وەک باوکی- لە ترسی حەرامبوونی ڕزقەکەیان، دەشڵێت: «سەرەڕای ئەوەی من هەڵەم، بەڵام هاوکاری کەسانی تر ناکەم بۆ هەڵە کردن...»

چەندین جاریش قەرزی لەسەر کڕیارە هەژارەکان لادەبرد و لێیان خۆشدەبوو.

بەڵام ئەمجەدی هەژدە ساڵ، بەهۆی ئاستبەرزی لە خوێندندا لە کۆلێژی پزیشکی وەرگیرا، گەورەترین گرینگیپێدانی سەرکەوتنبوو تێیدا، ئەگەر تاکە شتی گرنگی ژیانی نەبێت، هەتا لە بازاڕی کاردا کاری دەستکەوێت و لە ئاستێکی بەرزدابێت، لە دەمێکدا بێکاری زۆربووە و زۆربەی پسپۆڕییەکان مووچەیەکی کەم وەردەگرن بە بەشی پزیشکیشەوە.

لە کاتی سەردانییەکی تالە بۆ ماڵە باوانی:

- ئەمجەد وەرە لەلامان دانیشە، بیرم دەکردیت.
- دوو خولەک با ئەم لاپەڕانە تەواو بکەم.
- ئەوە دووەم جارە دوای دەخەیت... ئەم دوو خولەکە دەبینین!

دوای چەند خولەکێک:

- ها؟! دوو خولەک و زیاتریش تێپەڕی... کەمێکی تر من دەڕۆم.
- باوەڕکە تالە دەبێت هەموو بابەتەکە بخوێنمەوە بۆ ئەوەی لێی تێبگەم، دوو خولەکم بدەرێ.
- ئەمجەد، پێویستە هاوسەنگی ڕابگریت... با گرنگییەکانت یەک لایەن نەبێت، هەموو خاوەن مافێک مافی خۆی پێ بدە.

ئەمجەد هەستا و لەگەڵ خانەوادەکەی دانیشت، لە هەمان کاتتدا مێشکی لای کتێبی فیسیۆلۆجیا بوو!

ئەی سەمیر چی؟ سەمیر ئێستا بیست ساڵە، نە کاری هەیە و نە بڕوانامە و نە پیشەیەک دەزانێت و نە فێری زانستێک بووە، نە ئامادەشە بۆ هاوسەرگیری کردن و پێکهێنانی خێزان، تەنانەت دیسانەوە لە نوێژەکانی کەمتەرخەمی دەکات، ڕۆژێک نوێژ دەکات و چەندین ڕۆژ نایکات... لەگەڵ باوکی و براکەی لە دوکانی بەقاڵییەکە بە شێوەی پچڕ پچڕ کار دەکات، بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ دوای کارکردنەکە داوای پارە لە باوکی بکات و لە گەشتکردن و گەڕان لەگەڵ هاوڕێکانیدا خەرجی بکات... بەدوای زوو بەدەست هێنانی پارەوە دەبێت -لەڕێگای ئینتەرنێتەوە- بە فرۆشتنی کۆمەڵێک کەلوپەلی دەستی دوو کە لە کەسوکاری یاخود خزمەکانی دەستی دەکەوێت، دوای ئەوەش چەندین ڕۆژ بێکار دەبێت... تاکە خەمی تەنیا ئەو ڕۆژەیە کە تیایدا دەژیت.

باوکی مناڵەکان (باوکی سەعید) گەیشتووە بە تەمەنی شەست و دووساڵی، نەخۆشییەکەی توندبووە و چەندین جار لە چارەخانە خەواندویانە...

بۆیە داوای لە عاسم کرد پەلە بکات لە هاوسەرگیری کردن، بۆ ئەوەی زەماوەندەکەی ببینێت و ڕووداوەکان خۆشی ئەو ڕۆژە لەناونەبەن.

باوکی سەعید چی بەسەرهات؟
ئەوە چ کاریگەریەکی هەبوو بەسەر سەمیرەوە؟
چۆن پەرتەوازەیی سەمیر چڕبوویەوە بۆ یەک ئاڕاستە؟
ئایا ئەم ئاڕاستەیە دروست بوو؟
با بەردەوامبین.

***



# ٢

# پڕکردنەوەی کەلێن

عاسم بە ئامادەیی باوکی هاوسەرگیری کرد... بووە هۆی کامەرانی بۆ ئەو خێزانە، لەناو هەمووشیاندا باوکی، ئەوەی لە بیر نەکرد کە پشتگیری کردووە و قوربانی داوە بە خەونەکانی، بۆ ئەوەی پاڵپشتی بێت... بۆیە کە عاسمی کوڕی بە زاوایەتی بینی، ڕووی گەشبوو و فرمێسکی دڵخۆشی لەچاوانیدا قەتیسبووبوو...

دوای سێ هەفتە لە هاوسەرگیری کردنی عاسم، باوکیان وەفاتی کرد و لەدوای خۆی یادگاریەکی جوانی بەجێهێشت و هەر کەس باسی بکات دوعای خێری بۆ دەکات...

ئەوەی جێی سەرنجە، سەمیر بەو حاڵەی کە هەیەتی، خەمی لە خوشک و براکانی کەمتر نەبوو بۆ لە دەستدانی باوکی. چونکە سەمیر وەک منالێک خەرجی لەسەر باوکی بوو، بۆیە دوای وەفات کردنی هەستی بە تامەزرۆییەکی زۆر کرد بۆ ئەو باوکەی هەردەم بەرگەی گەمژەییەکانی دەگرت و هەوڵی دەدا لە هەڵبژاردنی ڕێگاکەیدا یارمەتی بدات، بەڵام بێ هودە بوو! تەنانەت بیری قسە پێ وتن و گلەییەکانی دەکرد... لەگەڵ ئەوەی وەفاتی باوکی پێشبینی کراوبوو، بەڵام وەکو شۆکێک بوو بۆ سەمیر... وایکرد کەمێک لە گێژەلووکەی بێئاگایی دەرچێت... هەر بۆیە پابەندبوو بە نوێژەکانییەوە و جار جارەش دەتبینی لە سوچێکی مزگەوت قورئان دەخوێنێت...

لەنێوان ئەو و دایکیدا تۆزێک ساردی هەبوو، چونکە کاتێک دایکی ئامۆژگاری دەکرد و دەیویست لە بێئاگایی ڕاپەڕێنێت، بە ساردی وەڵامی دەدایەوە...

دوای وەفاتکردنی باوکی کەمە کەمە سەمیر ئاوڕی لە دایکی دەدایەوە:

- باوکم لەدەستدا... هێشتا دایکم لە ژیان ماوە.

دەستی کرد بە هەوڵدان بۆ نزیک بوونەوە لە دایکی، سەرەڕای ئەوەی ئەو کارە سەخت بوو بۆی، بەڵام هەستی دەکرد کە پێویستی پێیەتی و پێویستە دڵی بدرێتەوە لە دوای مردنی هاوسەرەکەی، بۆیە هەڵسوکەوتی چاک کرد لەگەڵ دایکیدا، وای لێهاتبوو کە دەهاتەوە ماڵەوە زۆری لەخۆی دەکرد و بە دوودڵییەوە باوەشی پێدا دەکرد و ماچی دەکرد، چونکە ڕا نەهاتبوو هەست و سۆزی بۆ دەرببڕێت.

بەڵام شتێک هەبوو سەمیری شپرزە کردبوو!

لە هەفتەیەک دوای وەفاتی باوکی، منداڵەکان هەموو ڕۆژێک لای دایکیان کۆ دەبوونەوە بۆ دڵدانەوە و کەمکردنەوەی ناخۆشی لەدەستدانی هاوسەرەکەی... لە بەردەم سەمیردا سەبارەت بە بابەتەکانی ڕۆژانەیان لەگەڵ یەکتر قسەیان دەکرد، وەک:

- عاسم بەقاڵییەکە چۆنە؟

- سوپاس بۆ خوا، قسەم لەگەڵ باوکی ئەحمەدی دراوسێمان کرد، بۆ ئەوەی کۆگاکەی بە کرێ بگرم و بەشێکی بخەمە پاڵ فرۆشگاکە بۆ فراوان کردنی... سەعید ئەی تۆ چی؟!

- دوای دابڕانێک، سوپاس بۆ خوا پرۆژەیەکی نوێ هێنرایە ئۆفیسەکەم «دیزاینکردنی پردێک بۆ ناوچەی (دوار الزهور)».

ئەمجەدیش لەگەڵ تالە دەدوا:

- قوتابییەکانت کاردانەوەیان چۆنە لەگەڵ لە کۆرسە پەروەردەییەکەت؟

- بە جوانترین شێوەیە! هەندێکیان پێم دەڵێن: «وتارەکانت لە لایەکەوە ئازارمان دەدەن، چونکە پەیمان بردووە بەوەی کە پەروەدەیەکی بێ بنەمامان تاقیکردۆتەوە، بەڵام لە بەرانبەردا وامان لێ هاتووە بێجگە لە منداڵەکانمان زیاتر لەخۆمان تێ دەگەین، چێژ لە جێبەجێکردنی وتەکانت دەبینین، بگرە بیر لە خستنەوەی منداڵی تر دەکەینەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ منداڵە نوێیەکانمان بە سەرەتاییەکی دروست دەست پێ بکەین...»

- ئەی تۆ چی، هەی دڕندەی بواری پزیشکی؟ لە خوێندنەوە بێزار نەبووی؟

- گەر بێزاربم تەماشای ڤیدیۆی فیسیۆلۆجیا و توێکاری دەکەم... لە پزیشکییەوە بۆ پزیشکی، چێژ لە شتی تر نابینم!

- خوا پارێزراومان بکات لەم قوڵبوونەوەیەی تۆ.

سەمیر گوێی لەم وتووێژانە دەگرت و بیری دەکردەوە:

- ئەوە چییە؟!... گشتیان سەرکەوتوون، پرۆژەی تایبەتیان هەیە، تەنیا من نەبێ!

گوفتارەکانیان وەکو قامچییەک بوو بۆی، سەرکەوتنی ئەوان بێزاری دەکرد و وای لێ دەکرد هەست بە کەمی بکات!

هەندێک جار کە باسی کۆتا هەواڵ و دەستکەوتەکانیان دەکەن، سەیرێکی سەمیر دەکەن وەک بڵێی چاوەڕێی ئەوەن ئەویش ئەوەی هەیەتی بیڵێ... دواتر ئاگادار دەبنەوە کە ئەوان سەیری کەسێکی هەڵەیان کردووە! سەمیر چی هەیە بۆ باسکردن!؟ بۆیە زوو چاوی لەسەر لادەبەن بۆ ئەوەی بریندار نەکەن!

ئەم ڕێکەوتەش وای لە سەمیر کرد هەست بکات هیچ نییە!

بەڵام دواتر ساتە یەکلاکەرەوەکە هات...

دوای دوو هەفتە لە وەفاتی باوکی، سەمیر پەیوەندییەکی تەلەفوونی لەلایەن برا گەورەکەی (ئەندازیار سەعید)ەوە بۆ هات:

- سەمیر، پێویستە کۆ ببینەوە بۆ دابەشکردنی میراتی.
- دابەشکردنی میراتی؟!... سەمیر بیری کردەوە... ئەم بابەتە هێشتا بە مێشکیدا نەهاتبوو.

ڕێککەوتن سبەینێ کۆببنەوە.

منداڵەکان دانیشتن بۆ دابەشکردنی میراتی... ڕێککەوتن لە ئێستادا خانووەکە نەفرۆشرێت بۆ پاراستنی هەستی دایکیان و ئەو یادگارییانەی تێیدا هەیبووە، ئەمجەد و سەمیر لەگەڵ دایکیان پێکەوە لە ماڵەکە دەمێننەوە، چونکە ئەو دووانە هاوسەرگیرییان نەکردووە.

ئەو زەوییەی باوکییان هەیبوو دابەش دەکرێت بەسەر هەریەک لە:

هاوسەرەکەی (دایکیان)، سەعید، تالە، ئەمجەد... عاسمیش دەبێتە خاوەنی فرۆشگای ئوسرەی، لە بەرانبەریدا (١٥ملیۆن)(*) دەدات بە سەمیر، بەم شێوەیە هەریەکە و بەشی شەرعی خۆی وەردەگرێت.

لە هەموو ئەم مشتومڕەدا سەمیر کەم دوو بوو، لە بەردەمیدا چارەسەر و دابەشکارییەکەی بۆ پێشنیار دەکرا ڕازی دەبوو، بێدەنگ و هەژیوبوو، هەستی بە شتێکی نامۆ دەکرد... ئەو هەستی بە هەتیوی دەکرد سەرەڕای ئەوەی کە گەورەیە، پێشتر باربوو بەسەر باوکییەوە، ئێستا لەسەریەتی بەتەنیا ڕێگاکەی ببڕێت و بەرپرسیارێتی خۆی هەڵگرێت... لە (باوکایەتی) باوکیەوە تەنیا ئەم ١٥ ملیۆن دینارەی بۆ ماوەتەوە، لەگەڵ نیشتەجێبوون لەو ماڵەی ڕۆژێک دێ دەفرۆشرێت. هیچ یەکێک لە براکانی ڕۆڵی باوکیان بۆ سەمیر نەدەگێڕا بەجۆرێک خەرجی بکێشن و بەرگەی کەمتەرخەمییەکەی بگرن، سەمیر بەڕونی هەستی بەوەکرد کە لە دوای نەمانی باوکی بێکەس و بێ پشتیوانە...

---

(*) پارەکان بە دیناری عێراقی دادەنێین، بۆ ئەوەی خوێنەر لێی تێ بگات. (وەرگێڕ)

بۆ یەکەمجار، سەمیر هەستی بە تاڵییەتی جیاوازی نێوان خۆی و خوشک و براکانی کرد، بەجۆرێک لە جۆرەکان ئیرەیی پێیان برد.

کۆبوونەوەکەی بەجێ هێشت و لەدڵی خۆیدا دەیگوت:

- چی بکەم؟ من بەرگەی ئەم هەستە ناگرم! نامەوێ کەمتربم لە خوشک و براکانم... هەموویان کارێکیان هەیە پارە یان بڕوانامە یان خوێندن بۆی فەراهەم هێناون، تەنیا من نەبێ!... بەڵام چی بکەم؟ بیست ساڵ لە تەمەنم بەفیڕۆ چوو، چۆن بگەمە ئاستی ئەوان؟!... چۆن ئەو کەلێنەی نێوانمان پڕ بکەمەوە؟!

بیرکردنەوەی سەمیر هەمووی لەدەوری پارە پەیدا کردندا دەخولایەوە، چونکە پێی وابوو ئەوە تاکە شتە بتوانێت پێشبڕکێ لەگەڵ خوشک و براکانی بکات. «بە هەر شێوەیەک بێت، دەمەوێ پارە و پێگەم دەستکەوێت... بە هەر شێوەیەک لە شێوەکان بێت!»

ئەوەیش ساتەوەختی چوونە ناو گۆڕەپانی پێشبڕکێ بوو بۆ ئەو، بارکراوبوو لە ترسی ئەوەی بە شکستخواردوو وەسفی بکەن، لەگەڵ ئازاری هەستکردن بە کەمی، ئامادەیی ئەوەی تێدابوو پاساو بۆ خۆی بهێنێتەوە...

بەنیسبەت سەمیرەوە پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە بە نەفەسێکی قوڵەوە، قبوڵکردنی دەرەنجامی کەمتەرخەمیی چەندین ساڵەی ئەسڵەن بژاردەنەبوو... چونکە ئەو خۆی بەراورد دەکرد بە خوشک و براکانی، پێوەری بەراورد کردنەکەشی ماددە بوو، هەربۆیە جیاوازییەکی ئازاربەخشی بینی... لە کاتێکدا ڕانەهاتبوو بەرگەی ئازار بگرێت و ئارام بگرێت لەسەری، بۆیە ویستی ئەم جیاوازیە بە هەر شێوەیەک بێ داپۆشێت... «بەڵام چۆن؟ لەکوێ؟»

سەمیر زۆر بیری کردەوە، پاشان بڕیاریدا بازرگانی ئۆتۆمبێلی دەستی دوو تاقی بکاتەوە.

چووە ناو ئەپێک کە تایبەت بوو بە فرۆشتنی ئۆتۆمبێلی دەستی دوو، تەماشای ئەو ئۆتۆمبێلانەی دەکرد کە دانراوە، دەیڕوانی کامەی نزیکترە لەو بڕە پارەیەی هەیەتی، سەیارەیەکی بینی بەدڵی بوو، پرسیاری نرخەکەی لە خاوەنەکەی کرد، پێی وت:

- ڕاشکاو دەبم لەگەڵت: ئۆتۆمبێلەکەم ١٥ملیۆن دەکات دەکات، بەڵام چەندین کەموکورتی تێدایە پیشانتی دەدەم، بۆیە ئامادەم بە ١٤ملیۆن پێتی بفرۆشم».

سەمیر زۆر مامەڵەی لەگەڵ پیاوەکە کرد، تاکو توانی نرخەکەی کەم بکاتەوە بۆ ١٣ملیۆن، ئەو ١٥ ملیۆنەی کە لە باوکییەوە بۆی مابوویەوە، لەبەر خواردن و پێداویستییەکانی کەمی کردبوو، بۆیە داوای لە سەعیدی برای کرد ١ ملیۆنی بە قەرز پێ بدات، ئەویش پێی دا، سەمیریش ئۆتۆمبێلەکەی کڕی. دواتر بەو ئۆتۆمبێلە چووە لای هیشامی هاوڕێی، خاوەنی دوکانی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل:

- هیشام، ئەم ئۆتۆمبێلەم کڕیوە، دەمەوێت بیفرۆشمەوە، سەیری بکە بزانە چی پێویستە بۆ چاککردنەوە؟

- سەیرکە... گەر دەتەوێ بەڕاستی چاکی بکەیتەوە بە شێوەیەک کڕیار دوای ماوەیەک ماندوو نەبێ، ئەوا پێویستی بە (٧٠٠) هەزار هەیە، ئەگەریش بتەوێ بە هەر شێوەیەک بێ چاکی بکەیتەوە، واتا لە کۆڵی بکەیتەوە! ئەوا دەتوانم تەنیا بە (٣٥٠) هەزار بۆت چاک بکەمە، بەڵام گەرەنتی ناکەم بۆت، چونکە بازاڕی پارچەی دەستی دوو کوالێتییەکی زۆر جیاوازی هەیە.

ئەوە یەکەم تاقیکردنەوەبوو بۆ سەمیر و ئەمانەتپارێزییەکەی... بە دوودڵیەوە بیری دەکردەوە لە ترسی پارەی حەڕام لەلایەک و دروشمی (بە هەر شێوەیەک بێت دەمەوێت پارەم دەستکەوێت) لەلایەک.

- هیشام، تۆ ڕات چییە؟

- بە چەن دەیفرۆشیت؟
- بە ١٤ملیۆن... ژمارەیەکی سەرنجڕاکێشە!
- چەن لەسەر خۆت کەوتووە؟

سەمیر ڕاستییەکەی پێ نەوت... (١٣ملیۆن و ٢٠٠هەزارێک) لەسەر خۆمە.

- واتا بەپێی پێویست کاری لەسەر بکەین ئەوا ١٠٠هەزار قازانج دەکەیت، هیچ نییە... ماندوبوونەکەت شایەنی لەوە زیاترە...

هیشام تۆزێ بێدەنگ بوو، جگەرەیەکی داگیرساند، پاشان وتی:

- هەموو خەڵک چاککردنەوەکەیان هەر لەکۆڵ کردنەوەیە... گەر هەمووی بەپێی پێویست کار بکات ئەوا کەس قازانج لەو دەستی دووانە ناکات کە پێویستی بە چاککردنە.
- بەڵام مرۆڤ لە پارەی حەرام دەترسێت!
- من نەموت گەر چاکی بکەینەوە بە پارچەی بچوک ئەوا بەدڵنیاییەوە تێک دەچێت... بەڵکو لەوانەیە لەگەڵ کڕیارەکە بگونجێت... گەر چارەسەرێکی ناوەنجیت دەوێ، ئەوا بیفرۆشە پاشان گەر پارچەیەک لەو پارچانەی دایدەنێین لەکارکەوت و کڕیارەکە گەڕایەوە لات، ئەوا بۆی چاک بکەرەوە لەسەر هەژماری خۆت... نە شیش بسووتێ و نە کەباب!

ئەوە وەک چارەسەرێکی ناوەنجی و سەرنجڕاکێش بۆ سەمیر دەرکەوت! سەمیر هەوڵیدا هیشام بە نرخێکی کەمتر بە باشی چاکی بکاتەوە، بەڵام هیشام سوور بوو لەسەر ئەوەی ناتوانێت!

بۆیە بڕیاریدا بەگوێی ئامۆژگارییەکەی هیشام بکات.

- باشە لەسەر... سەمیر ویستی بڵێت: «باشە لەسەر بەرەکەتی خودا»، بەڵام هەستی کرد ئەو دەربڕینە ناگونجێت، چۆن بەرەکەتی خودای لەسەر دەبێت لەکاتێکدا فێڵی شاراوەی تێدایە! بۆیە گەڕاندییەوە و وتی:

- باشە بە ٣٥٠هەزارەکە چاکی بکە.
هیشام:
- پشتمان بەخواقاییمە...
ئەمە نیوەڕۆ ڕویدا... لە نوێژی عەسردا سەمیر بیری دەکردەوە: «پەیوەندی بە هیشامەوە بکەم و بڵێم بە تەواوی چاکی بکات بۆ ئەوەی سەرەتایەکی بەرەکتدارم هەبێ»... دوای نوێژەکە سەرقاڵبوو... بیری چوو، دواتر تەمبەڵی کرد لە پەیوەندی کردنەکە، دوای خست، خەواڵوو بوو، خەوت... نوێژی شێوانی چوو... لەگەڵ نوێژی خەوتنان کۆی کردەوە... ڕۆژی دواتر سەرقاڵ بوو، ئینجا نیوەڕۆکەی پەیوەندی کرد:
- هیشام، دەترسم گوناهبار بین لەگەڵ کڕیاردا... تەواو، بە نرخە بەرزەکە چاکی بکەرەوە.
- دواکەوتیت برادەر، پارچەکانم کڕیوە و وا چاکیان دەکەم، گوێ مەدەرێ، پشت بەخوا ببەستە تێیدەپەڕێنیت.
سەمیر لە ناخی خۆیەوە خۆشحاڵبوو کە هاوڕێکەی دەستی بە چاکردنەوە کەم خەرجییەکە کردووە، بەوە قەناعەتی بەخۆی کرد کە هەوڵی داوە فریای بابەتەکە بکەوێت...
دوای دوو ڕۆژ هیشام چاککردنەوەکەی تەواوکرد، پاشان سەمیر بردی و بەڵێنیدا کە خەرجی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکە لە دوای فرۆشتنی پێ بدات، پاشان بۆ فرۆشتنی نمایشی کرد، دەستی بە وەڵامدانەوەی پەیوەندییەکان کرد... چەند کەسێک لە ماوەی هەشت ڕۆژدا هاتن بۆ سەیرکردنی، تا ئەو کاتەی (عەلی) هات: فەرمانبەرێکی گەنجە لە کۆمپانییایەکی پۆستە کار دەکات... سەیرێکی کرد و پاشان ئاوڕی لە سەمیر دایەوە:
- بە ئەمانەتەوە... خاوێنە؟

- (وەڵڵاااا... ) سـەمیر ویسـتی سـوێند بەخوا بخوات، بەڵام دواتر فریای خۆی کەوت.
- بەڕاستی نایابە.

عەلی مامەڵـەی لەگـەڵ سـەمیر کرد لەسـەر نرخەکـەی، لـە کۆتاییدا لەسـەر ١٤ملیۆن ڕێکەوتن، وا خـۆی ڕازی کرد کـە ئـەوە فێڵی چاککردنەوەکە کـەم دەکاتـەوە... عەلی پارەکـەی پـێ دا و وتـی: «ئـەوە هەمـوو توانـای منـە... بەدرێژایی سـاڵانی ڕابردوو دینـار بـە دینـار کۆمکردوونەتـەوە.»

سـەمیر کاتێـک عـەلی دەبینـی چـەنـدە خۆشـحاڵە بـەو ئۆتۆمبێلـە، بـۆ سـاتێک دوودڵ بـوو... بـەڵام هـەر زوو قەناعەتی بەخۆی کرد:

- ٣٥٠ هـەزار لـە جیاوازیی چاکردنـەوەدا لـە چاو نرخی ئۆتۆمبێلەکـەدا هەر هیچ نییە، إن شاء الله کێشەی بۆ دروست ناکات... گەر هەندێکی لەسـەر خـەرج بکات کەی کێشەیە؟ هەموو خەڵکی وا دەکەن... دەمەوێ قازانج بکەم، بەرگە ناگرم خوشک و براکانم ببینم سـەرکەوتوو دەبن و منیش لەوان کەمتربم وەکو گەمژەیەکی شکستخواردوو!

عەلی ئۆتۆمبێلەکەی وەرگرت و خێرا ڕۆیشت.

سـەمیریش ٦٥٠هـەزار قازانجی کرد، سـەرەتایەکی نایابـە!... دواتـر گەڕایـەوە بۆ ماڵەوە، نوێژی نیوەڕۆی کرد، لـە نـاو نوێژەکـەی دەسـتی بەکۆکردنـەوە و کـەڕەت و ژمـاردن کرد لـە مێشکی خـۆی! ٦٥٠هـەزار لـە مـاوەی یـازدە ڕۆژ لـە کڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبێل، واتـا لـە مـاوەی مانگێک ٢نزیکـەی دوو ملیۆن دەکات... واتـا... استغفرالله... ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾... بـەردەوام دەبوو لەخوێندنـی قورئانەکە، پاشـان ژمـارەکان مێشکیان داگیر دەکرد پاشـان بـەردەوام دەبوو!

لـە نوێژەکـەی سـەلامی دایـەوە و پاشـان بـە خێرایی موبایلەکـەی گرتەدەست و سەیری نمایشی ئۆتۆمبێلی دەستی دووی کرد... دەیویست

ئۆتۆمبێلێکی تر بکڕێت... بۆ ساتێک هاتەوە یادی کە: «پێویستە ئەو ملیۆنەی بە قەرز لە سەعیدی برامم وەرگرت بیدەمەوە، هیشامیش ٣٥٠ هەزار خەرجی چاککردنەوەی، بەڵام بۆچی قەرز دانەوەکە دوا نەخەم بۆ ئەوەی بتوانم باشتر سوود لە بڕە پارەکە ببینم و ئۆتۆمبێلێکی تر بکڕم؟ سەعید برامە و لەسەریەتی هاوکاریم بکات، پارەشی لەمن زیاترە، هیشامیش هاوڕێمە، لەڕاستیدا ئەو لەبنەڕەتەوە جێگای باوەڕ نییە، ئۆتۆمبێلەکەی هەر بە لەکۆڵکردنەوە چاککردەوە، بۆیە بۆی نییە وا پێشبینی بکات ڕاستەوخۆ هەقەکەی وەردەگرێتەوە، دانەوەی قەرزەکانیان دوا دەخەم».

لە ماوەی دوو ڕۆژدا سەمیر لە چەند ئۆتۆمبێلێکی ڕوانی، تا ئەو کاتەی هەڵبژاردەکەی کەوتە سەر یەکێکیان... بەڵام ئەو بڕە پارەیەی هەیەتی بەش ناکات، پێویستی بە ملیۆنێکی تر هەیە... «دۆزیمەوە! لە دایکم قەرز دەکەم».

لەگەڵ سەرقاڵ بوونی سەمیر بەو ئامانجەی بۆخۆی دایناببوو، خاڵی سەرنجدانی کەوتبووە سەر پارە، ئیتر بێجگە لەوە چاوی هیچی تری نەدەبینی... ئەو کەسانەشی لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا خزمەتی نەکەن، لە بازنەی گرنگییەکانی دەچنە دەرەوە، ناگەڕێنەوە ناو بازنەکە مەگەر بیەوێ سوودیان لێ ببینی بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکەی، لەوانەش هاوڕێی منالی و گەنجیەتی و... دایکیشی!

دایکی لەم ماوەیەدا نەخۆشی گورگە (گورگە سورە)ی لێ دەرکەوتبوو، دڵیشی لە سەمیر ئێشابوو، چونکە دەگمەن لێی دەپرسی و لەگەڵیدا دادەنیشت... کە هەوڵی دەدا بۆ نوێژی بەیانی خەبەری بکاتەوە، دەگمەن هەڵدەستا بۆ نوێژەکە... هەندێک جار نانی بەیانی یان ئێوارەی لەگەڵ ئەمجەد و دایکی دەخوارد بەڵام بیری لە شوێنێکی تربوو... ئەگەر دایکی بیدوێنێت بەدەم سەیرکردنی ئۆتۆمبێلەکانی ناو

موبایلەکەی وەڵامی دەداتەوە... هەندێ جار بێدەنگ دەبێت بۆ ئەوەی سەری لەسەر موبایلەکەی هەڵبڕێت:

- «ببورە... . بەڵێ بەڵێ.. دایەگیان»... لە دایکی دەڕوانێت لەکاتێکدا چاوەکانی لەوێ نین... زۆر جیاوازە لە ئەمجەدی بەهەست و سۆز، سەرەڕای سەرقاڵیشی بەخوێندنەوە، هەردەم ئاگای لە دەرمانەکانیەتی و لەگەڵی دەچێت بۆ دکتۆر...

ئێستا ئەو بۆ ئەوەی قەرز بکات پێویستی بە دایکییەتی!

سەمیر بە لای دوکانی میوەفرۆشیدا تێپەڕی و هەندێک میوەی (گواڤە)ی بۆ دایکی کڕی... گەیشتەوە ماڵ:

- دایەگیان! ئەو جۆرە گواڤەیەم کڕیوە کە حەز پێیەتی، وەرە با پێکەوە بیخۆین. دایکی خۆشحاڵبوو، شۆکبوو چونکە ئەم ڕانەهاتبوو ئەمە لە سەمیرەوە بیبینێت:

- خودا لێت ڕازی بێت و دەستەکانت خۆش بێت.

پێکەوە خواردییان... سەمیر شەرمی دەکرد ئەو بابەتە ڕاستەوخۆ لەگەڵ دایکی بکاتەوە، هەتا ئێوارە دوای خست، دواتر دەستی کرد بە گفتوگۆ لەگەڵی:

- دایە، دەزانیت دەستم بە بازرگانی ئۆتۆمبێل کردووە؟

- ماشاءالله! خودا دەرووی خێرت لێ بکاتەوە.

- سەیرکە... ئەوە ئەو ئۆتۆمبێلەیە بیر لە کڕینی دەکەمەوە، ڕات چییە؟

- جوانە، ڕەنگی ڕەشم لە ئۆتۆمبێلدا بەدڵە.

دایکی بەم گفتوگۆیەی دڵخۆشبوو گەرچی ڕا نەهاتبوو ئاوا لەگەڵیدا گفتوگۆ بکات، داماوە نەیدەزانی سەمیر نیازی چییە.

- کێشەکە ئەوەیە گرانە دایە... ملیۆنێکم پێویستە بۆ ئەوەی بتوانم بیکڕم!

دایکی بێدەنگ بوو و لە مەبەستی تێنەگەشت، سەمیر بەردەوام بوو:

- گەر یەکێک ئەو برە پارەیەم بە قەرز بداتێ، ئەوا قازانج دەکەم و قەرزەکەشی دەدەمەوە.

لێرەدا دایکی زۆر بە دڵپاکییەوە وتی:

- باشە من دەتدەمێ کوری خۆم.

کەوتە ناو تەڵەکەوە!...

- نا نا دایە، تۆ پێویستت بەم پارەیە هەیە...

- نەخێر کورەکەم... بووەستە!

دایکی هەستا و دەستبەندێکی هێنا کە باوکی سەعید سەرەتای هاوسەرگیریان بە دیاری بۆی هێنابوو...

- سەمیر، بیبە و بیفرۆشە.

سەمیر دەستبەندەکەی ناسییەوە...

- دایەگیان، ئەوە لە لایەن باوکمەوەیە... بەدڵنیاییەوە لات بەنرخە.

- گوێی مەدەرێ، هیترم هەیە لەوە (رەحمەتی خوای لێبێت)، ئۆتۆمبێلەکە بکرە و کاتێک فرۆشتت و قازانجت کرد قەرزەکەم بۆ بگەرێنەوە.

- باشە، دەستەکانت سەلامەت بن و خودا تۆمان بۆ بهێڵێت ئەزیزەکەم... بەڵێن بێت لە نزیکترین دەرفەتدا قەرزەکەت دەدەمەوە.

سەمیر بەرێکەوت بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێلەکە بکرێت، دایکی لەگەڵ کپ بوونی ماڵەکەی هەستی کرد ئەو رەفتارەی سروشتی نەبوو، هەر لە گواڤەکە و بگرە تا ئەو گفتوگۆیەی پێی رانەهاتبوو! لەوەشدا دڵی لێی رەنجا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نزای کرد کورەکەی لە بازرگانییەکەیدا سەرکەوتوبێت...

سەمیر ئۆتۆمبێلی دووەمی کری، پێویستی بە هەندێک چاککردنەوەی سادە هەبوو، بەڵام پێی شەرم بوو لای هیشام چاکی بکات، چونکە خەرجی چاککردنی یەکەم ئۆتۆمبێلی هێشتا نەدابوو، بۆیە لە شوێنێکی تر چاکی کردەوە و بۆ فرۆشتن نمایشی کرد و فرۆشتی.

بیست و پێنج ڕۆژ تێپەڕی و سەمیر سەرقاڵی کڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبێلی دەستی دووە. دوای ئەوە هیشام پەیوەندی کرد:

- سەمیر چۆنیت؟

- هیشام سڵاوت لێبێ، سوپاس بۆ خوا.

- سەمیر ببورە حەزم نەکرد داوات لێ بکەم، بەڵام درەنگ کەوتی لە دانەوەی قەرزەکە.

- ئا ئا، حەق بە تۆیە هیشام، بەداخەوە بمبوورە دواکەوتم، بەڵام موژدەت دەدەمێ کە بازرگانییەکەم بەباشی بەڕێوە دەچێت، یەک هەفتە کاتم بدەرێ، بەڵێن دەدەم پارەکەت بدەمەوە. هیشام توڕەبوو:

- نەخێر سەمیر، لە ئێستاوە تا سبەی گەر پارەکەم نەدەیتەوە ئەوا هیچ ئۆتۆمبێلێکت بۆ چاک ناکەمەوە لە داهاتوودا، زۆر دواکەوتیت.

- نا نا، هەرچییەک بێ تەنیا تۆ مەڕەنجێ... سبەی پارەکە لەلای تۆ دەبێت.

هەر بەڕاستیش پارەکەی دایەوە.

لەم ڕۆژەدا چی ڕوویدا لەگەڵ عەلی، ئەو کەسەی یەکەم ئۆتۆمبێلێ کڕی و بە چاککردنە ڕووکەشییەکان هەڵخەڵەتێندرا؟

ئەی خوێندکارە ماندووەکەی بەشی پزیشکی (ئەمجەد) چی بەسەرهاتووە؟

با بەردەوام بین.

***



# ٣

## ئەمجەد ئەوە چیتە؟!

بەڕێوەبەری ئەو کۆمپانیایەی عەلی کاری لێ دەکرد ( کڕیاری یەکەم ئۆتۆمبێلی سەمیر) بەڕێوەبەرێکی توندبوو، هەردەم داوای لە فەرمانبەرەکانی دەکرد هەرگیز لە کارەکەیان دوا نەکەون و لە کاتژمێر هەشت لا نەدەن. هەر بۆیە ئەم برادەرەمان ئۆتۆمبێلێکی بە پێی باری ماددی خۆی کڕی، چونکە هەندێک جار بە هۆکارەکانی تری گواستنەوە دوا دەکەوت و دەسەڵاتی خۆی تێدا نەبوو، ئەو دەمە بەڕێوەبەرەکەی سەرکۆنەی دەکرد.

چەن هەفتەیەکی کەمە ئۆتۆمبێلەکەی کڕیووە بەڵام وا خەریکە لەکارکەوتنەکانی بەدەر دەکەوێت! لەکاتی چوون بۆ کارەکەی لەکار کەوت، شۆکبوو، بۆیە پەیوەندی بە سەمیرەوە کرد، بەڵام ئەو نوستبوو... بۆیە ئەم برادەرەمان هەستا بەدوای کەسێکدا گەڕا ئۆتۆمبێلەکەی بۆ چاک بکاتەوە... فیتەرێکی هێنا و کاتژمێرێکی پێ چوو تا چاکی کردەوە، داوای ٩٠هەزاری لێ کرد... عەلیش بە خەمبارییەوە پارەکەی پێدا، خەمباربوو بۆ ئەو ئۆتۆمبێلەی تازە کڕیویەتی...

درەنگ گەیشتە سەر کارەکەی... بەڕێوەبەرەکەی بانگی کرد:

- ئەوە کۆتا جارت بێت... جارێکی تر دواکەوتنت قبوڵ ناکەم.
- گەورەم باوەڕبکە ئۆتۆمبێلم کڕی بۆ ئەوەی دوا نەکەوم، کەچی...

- کێشـەی مـن نییـە، کار پێویسـتە بـڕوات، خـوات لەگـەڵ... بچـۆ ئۆفیسـەکەت...

سـەمیر هەستا لەخـەو و بینی عەلی چەند جارێک پەیوەندیی پێوە کردووە.. سـەر و دڵی گیرا... دوودڵ بوو لـەوەی وەڵامـی بداتـەوە یـان پشتگوێی بخات...

- بەم بەیانیە؟! دەلاچۆ وازبێنە!

گەڕایـەوە و بەخۆی وت: «بـەڵام نابێ بـەم شێوەیە بازرگانییەکەم دەست پێ بکەم، گەر خەرجییەکەی کەم بێت ئەوا دەیگرمە ئەستۆ»:

- ئەلو.

- سەمیر؟

- بەڵی فەرموو.

- مـن عەلیـم، ئـەو کەسـەی چـەن هەفتەیـەک لەمـەو پێش ئۆتۆمبێلـە سـەنییە سـپییەکەم لێت کـڕی.

- بەڵێ، سڵاو... فەرموو چۆن بتوانم لەخزمەتتدابم؟

- سـەمیری بـرام، ئۆتۆمبێلەکـە ئەمـڕۆ لـەکار کـەوت و فیتەرەکـە پێـی وتـم: لەکارکەوتنەکـەی کۆنـە، بـۆ چاکردنـەوەی پارەیـە باشـم ڕۆیشـت.

- نا مەحاڵە، ئۆتۆمبێلەکە نایاب بوو و پێویستی بە هیچ نەبوو، پێش ئەوەی پێتی بفرۆشـم دڵنیا بـووم لێی.

- ئەوە ڕوویدا کە بۆم باسکردیت.

- زۆر سەیرە، بەهەر حاڵ خەرجییەکەی چەند بوو؟

- ۹۰هـەزار... بـەڵام ئـەوە گرنـگ نییـە، گرنگتـر ئەوەیە لەکارەکـەم دوا کەوتـم و قسـەم پێ وتـرا.

- لاحـول ولا قـوة الا باللـە... بەڕاسـتی ئـەوەی ڕووی داوە لەگەڵـت سـەیرە!... بەهـەر حـاڵ بـە زەرەرمەنـدی تـۆ ڕازی نابم، لەکۆتاییشـدا

ئـەم ئۆتۆمبێلانـە دەستی دوون و دەكرێت حاڵەتی نامۆ تیایدا ڕوو بدات، من خەرجی چاككردنـەوە هـەڵ دەگرم. ژمـارەی هەژمارەكەتم بۆ بنێره و منیش بڕه پارەكەت بۆ دەنێرم.

- وا دیاره ئـەو فێڵی لەمن كردووە! گـەر ڕاستگۆ بووایـە، ئاوهـا بـە خێرایی ڕازی نەدەبوو خەرجییەكەی بدات، نا نـا، (هەندێك گومـان تاوانـە)، كابـرا دەیتوانـی خەرجییەكـەی نـەدات، لەوانەیـە ڕاسـتگۆ بووبێت و لەكاتی كڕینی ئۆتۆمبێلەكـە هەڵخەڵەتابێت...

عەلی ژمارەی هەژمارەكەی بۆ سـەمیر نارد و سـەمیر بەڕاستی پارەكـەی بۆ گواستـەوە:

- ئـای زەرەرمەنـد خـۆم، خۆشـحاڵ بوویـن بـەو بـڕە پارەیـەی لـەم پیاوە پەیدامـان كرد، كەچی وا خەریكە كـەم دەكات، بەهەرحـاڵ با ڕۆزییەكـەم حـەڵاڵ بكـەم ئـاوا بەرەكەتدارتـره بـۆم.

سـەمیر وای هەست كرد كە ئەوەی لەسـەرییەتی كردوویەتی بـەم بڕه پارەیـەی كـە داویەتی، هەمـوو ئـەوەی لەسـەری بـووە ئەنجامی داوە و بڕیاریشـیدا گـەر دواتـر عەلـی پەیوەنـدی پێـوە بـكات، هیـچ خەرجییەكـی تـر نەگرێتـە ئەسـتۆ.

لـە دوای ڕۆژە ناوازەكـەی (گواڤـە)، هەتـا دوو ڕۆژی تـر سـەمیر نانی بەیانی لەگـەڵ ئەمجـەد و دایكـی خـوارد، پاشـان گەڕایـەوە سـەر تەمبەڵـی كردنـەی جارانـی...

بـەڵام شـتێك دایكی بێزار كردبوو... ئەمجەد گۆڕانێكی هەستپێكراو لـە میزاجی دەبینـرا، ئەویش وای لێهاتبوو تەمبەڵی دەكرد بۆ هەسـتان بۆ نوێژی بەیانی... ڕوخسـاری خەمۆكی پێوە دیاربوو... وەك هەموو جـار دەمەتەقێی لەگـەڵ دایكی نەدەكرد... دایكی لەكاتی نانی بەیانیدا لەگەڵیدا دانیشـت:

- ئەزیزم ئەمجەد، چیتە؟

- هیچ نییە، ئازیزەکەم.
- لەسەر خۆت نیت!
- لەوانەیە مێشکم بە تاقیکردنەوەکانەوە سەرقاڵ بێت،
خەمی لێ مەخۆ ئازیزەکەم.

ئەمجەد دووسێ پارووی خوارد و پاشان بەڕێ کەوت بۆ زانکۆ.

- دەبێ نەبووبمە هۆکاری خەمۆکی بۆ ئەمجەد؟ دەبێت لەبەر ئەوە بێت لەو خوێندنەی ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردبوو سەرقاڵم کردبێت؟ سەرقاڵم کردبێت بە زۆری سەردانی کردنی دکتۆر و بەدواداچوونی دەرمانەکان؟ ئەمجەد ڕاستییەکانم لێ دەشارێتەوە... دەکرێت کێ بیدوێنێت؟... تالە، ئەمجەد ڕاستی لەو ناشارێتەوە.

هەربۆیە پەیوەندی کرد بە تالەی کچیەوە... ئێوارەی ئەو ڕۆژە تالە ئۆتۆمبێلی هاوسەرەکەی برد و پەیوەندی بە ئەمجەدەوە کرد:

- ئەمجەد، دەمەوێت پێکەوە بچینە سەر ئەو گردەی کە لەسەر ڕێی فڕۆکەخانەیە، کە هەموو جارێ باوکی ڕەحمەتیمان دەیبردین.
- تالە ڕاستی سەرقاڵم... تاقیکردنەوەم هەیە.
- من پرست پێ ناکەم، پێت ڕادەگەینم، ئەوەتا وا لەڕێم و پەرداغێک شەربەتی ئەو میوەیەم بۆت دروست کردووە کە حەزت پێیەتی. چارەکێکی تر دەگەمە لات.

ئەمجەد بەڕاستی بە تاقیکردنەوەکانەوە سەرقاڵبوو، بەڵام هەر بەڕاستی پێویستی بە تالە بوو، خۆشحاڵ بوو بە بیرۆکەی دەرچوون لەگەڵ تالە.

تالە هەستی بە گۆڕانی ڕوخساری براکەی و کزبوونی بریقەی چاوەکانی و مات بوونی ڕووخساری کرد، بەرەو ڕووی گردەکە بەڕێکەوتن، تۆزێک لە ڕێگە دواندی:

- لەگەڵ خوێندنت چۆنیت؟

- سوپاس بۆ خوا.
- پەیوەندیت لەگەڵ خودا چۆنە؟
- سوپاس بۆ خوا.
- تەواوە؟
- نەخێر... مرۆڤ کەم و کورتی هەر دەبێت.
- بەم دواییانە خوێندنەوە و چالاکییەکانت چین؟
- هیچ... خوێندن هەموو کاتەکانم دەبات... هەندێک جاریش دایکی ئازیزم دەبەم بۆ لای دکتۆر.
- شەربەتەکە بە ساردی بخۆ.
- دەستەکانت خۆش بن.
- دەستەکانی تۆش.

گەیشتنە گردەکە، لەسەر بەردێک بەڕووی خۆرئاوابوونەوە دانیشتن...

- ئەمجەد چیتە؟
- ماندووم.
- بۆچی براکەم؟
- نازانم، خەمۆکیم هەیە و چوومە دکتۆری دەروونی و دەستنیشانی کرد و دەرمانی بۆ نووسیم، بەدایکمم نەگوتووە.
- دەستت بە وەرگرتنی دەرمان کردووە؟
- نا، دوودڵم... بیر لەوە دەکەمەوە بچم بۆ دانیشتنی چارەسەری دەروونی بێ دەرمان... لە ئێستادا سەرقاڵم.
- بە ڕای تۆ هۆکاری ئەو خەمۆکییەی هەستی پێ دەکەیت چییە؟!
- نازانم، لەوانەیە هەڵچوونێکی دواکەوتووی خەمەکانم بێت بۆ وەفاتی باوکم خوا لێی خۆش بێت، یان خەمی نەخۆشی دایکم، یانیش پەستانی خوێندن.

- هیچکام لەم فاکتەرانە نوێن؟
- نەخێر.
تاله دەستی گرت:
- ئەمجەد... ئەوەی تۆ بەدەستییەوە دەناڵێنیت بەرهەمی ڕانەگرتنی هاوسەنگییە لە ژیانتدا، یەک لایەنی لە گرنگی پێ داندا کە هەموو جارێک لەسەری دواوم بۆت... سەرەنجام دەروونت لاواز دەکات و بە ئاسانی دەشکێیت... برای ئازیزم، هەموومان خۆشحاڵین بە گرنگیدان و سەرکەوتنت لە خوێندنەکەت، بەڵام ژیان هەمووی خوێندن نییە، فەرمایشتی پەیامبەرمان(ﷺ) لەبیر بێت (هەموو خاوەن مافێک مافی خۆی پێ بدە). نەفست هەقی هەیە بەسەرتەوە، پێویستت بە بونیاد نانی پەیوەندی کۆمەڵایەتییە، پێویستە خۆت هێدی بکەیتەوە، وەرزش بکەی... پێش هەموو ئەوانەش ویردی ڕۆژانەت لە قورئان خوێندن هەبێت و فێری ئایینەکەت ببیت!
- ئاااهـ تالە، بەڕاستی وازم لە هەموو ئەوانە هێناوە! بە خۆمم دەوت: «لە سەرەتاکانی خوێندنەکەم ورەم بەرز دەکەمەوە، بۆ ئەوەی بناغەیەکی زانیاری پتەو بۆ بۆخۆم دابمەزرێنم، پاشان دەگەڕێمەوە ژیانی ئاسایی خۆم... ڕۆژگار تێپەڕی و کاتم کەم بەرەکەت بووە، لاپەڕەیەکی خوێندن بۆ ئەوەی لێی تێ بگەم سێ هێندەی کاتی جارانم لێ دەبات، لە کاتێکدا پێشتر لە یەکەم جارەوە تێ دەگەیشتم! لە سەروو هەموو ئەوەشەوە، دڵخۆش نیم...»
- هاوسەنگی دروشمی ژیانە... دەبێت هەردەم بوونی هەبێت، بۆ هیچ دەسکەوتێک دواناخرێت و پەک ناخرێت.
- ڕاست دەفەرموویت.
- کەی تاقیکردنەوەکانت تەواو دەبن؟

- دوو سبەی.
- باشە، من ناڵێم لە ئیمڕۆوە بەرنامەیەک دادەنێین... ئێستا تاقیکردنەوەت هەیە، دوو بەیانی وەرە بۆ ماڵمان، بۆ ئەوەی پێکەوە بەرنامەیەکی هاوسەنگ دابڕێژین.
- باشە إن شاءالله، ئەو دەرمانانەی دکتۆر بۆی نووسیم وەریبگرم هەتا تاقیکردنەوە تەواو دەبێت؟
- دەکرێت پەلە نەکەیت، چونکە گەر ئەم دەرمانانە بشخۆیت ئەوا کاریگەری وا زوو دەر ناکەوێت.
- وایە ئەوەم خوێندووە.
- باشە با بگەڕێینەوە، دەست بە خوێندنەکەت بکەیتەوە، ڕێکەوتمان لە دوای دوو سبەی هەیە... بە دایکم دەڵێم ئەمجەد فشاری لەسەرە و هاوکاری بەڕێوەبردنی کاتەکانی دەکەم، دەگەڕێتەوە و چاکتریش دەبێت بە ئیزنی خودا.

سەمیر بۆ نانی ئێوارە چاوی بە ئەمجەدی برای کەوت، لەسەر خوانەکەش سینیەک کفتەی لێ بوو، کە دایکی سازی کردبوو.

سەمیر تێبینی خەمۆکی ئەمجەدی برای کرد، دوای نانخواردن پێی وت:

- چیتە؟!

ئەمجەد ڕا نەهاتبوو لەوەی سەمیر ئەم پرسیارەی لی بکات و یان هەر تێبینی ڕووخساری بکات! لەبەر ئەوەی پێی خۆش بوو بەردەوام بێت لە گفتوگۆ، ڕاستییەکەی پێ وت:

- لە ڕووی دەروونییەوە ماندووم، ڕاستیت پی دەڵێم، بەڵام بە دایکم مەڵێ.
- بەسەرچاو.
- چوومە دکتۆر و وتی: خەمۆکیت هەیە.

- خەمۆکی؟!... سەمیر دوو هەستی دژ بەیەکی هەبوو: ئەو حەزی نەدەکرد براکەی بەم دۆخەوە ببینێ، بەڵام لە هەمان کاتدا هەستی دەکرد کە «لە کۆتاییدا، ئەمجەد لەمن باشتر و سەرکەوتوتر نییە... ئەو لە خوێندنەکەی جددیە و هەمووان ڕێزی لێ دەگرن و دینداریشە... لەگەڵ هەموو ئەوانە توشی خەمۆکی بووە، منیش تووش نەبوومە. من لەو کەمتر نیم، خودا خۆشی دەوێم کە وەک ئەمجەد توشی خەمۆکی نەبووم... لە خێرێکی زۆردام و لەوە بەهێزترم تووشی خەمۆکی بم».
- باشە، دەرمانت وەرگرتووە؟
- نا قسەم لەگەڵ تالە کردووە و ڕێککەوتووین بەرنامەیەک دابنێین بۆ گەڕاندنەوەی هاوسەنگی دەروونیم.
- هاوسەنگی دەروونی؟
- بەڵێ، سەمیر تۆش پێویستت پێیەتی، ڕات چییە تۆش لەگەڵمان بەرنامەیەک دابنێیت؟
- نا بابە... من هاوسەنگ و خۆشحاڵم، سوپاس بۆ خوا کارەکانم زۆر بە جوانی تێدەپەڕن و ئەوەی گرفت بێت نیمە.
ئەمجەد نەیویست مشتومڕ لەگەڵ براکەی بکات:
- خودا هەر سەلامەتت بکات... گەڕایەوە بۆ خوێندنەکەی.

دوای دانیشتنی ئەمجەد لەگەڵ تالە و ڕێکخستنی بەرنامەکە، بە خاوی دەستی بە چاکبوونەوە دەکرد، پابەندبوون بە بەرنامەکەوە دژواری تێدا بوو، بەتایبەت لە دوای تێکچوونی تەندرووستی دایکی... تالە ورەی پێ دەدا و بەدواداچوونی بۆ دەکرد... ئەوەش کاتی لێ دەبرد، بۆیە مێردە توڕەکەی هەندێک جار هەڵدەچوو:
- تالە! تالە! هیچ کراسێکی ئوتو کراوم نییە بۆ سەرکارەکەم، تۆش هەروا بە موبایلەوە خەریکیت.

- ئەمجەد یەک خولەک... گیانەکەم بەسوم (بەسوم ناوی کورتکراوەی باسمـە)، سوێند بە خوا لەگەڵ ئەمجـەدم، بەرگە بگرە... (هەتا بەندە هـاوکاری براکەی بێت، خوداش هـاوکاری بەندەکە دەبێت)...

لـە پاداشتەکەدا هاوبەشـم بـە، چـەن چرکەیەکی تـر کراسێکت بۆ ئوتـو دەکـەم.

ئەمجەد کەمێکی تر دەگەڕێمەوە لات.

ئـەو شـتەی کـە جوانـە لـە باسـمدا ئەوەیـە سـەرەڕای سروشـتە تورەکەی کەچی یادی خودا هێدی دەکاتـەوە... بۆیە بێدەنگبوو خۆی سـەرقاڵ کرد بـە ئامادەکردنی جانتاکەی هەتـا تالـە کراسێکی بۆ ئوتو کـرد.

دایکی سـەعید هەستی بە ئازار دەکرد چونکە ئەمجـەد سـەرقاڵی خوێندنەکـەی بـوو، هەروەهـا خەریکی ئـەو بەرنامەیەبوو کـە لەگەڵ تالـە دای نابـوو، پەیوەنـدی بـە دراوسـێکەیانەوە کـرد کـە هاوڕێیەکی بێ هاوژینـی خـۆی بـوو:

- دایکـی عەلـی، شـەرم دەکـەم ئـەم داواکارییـەت لـێ بکـەم، وەک دەزانیـت ئەمجـەدی کـوڕم قوتابـی کۆلێـژی پزیشـکییە، بـەم دواییانـەش بەهـۆی نەخۆشـییەکەمەوە خوێندنەکـەی زۆر فەرامـۆش کـردووە، ئایـا دەکرێـت لـە ماوەیـەدا بەیانیـان بێیتـە سـەردانم بـۆ ئـەوەی ئەمجـەد دڵنیـا بێـت لـەوەی کەسـێک هەیـە هاوکاریـم بکات گـەر پێویسـتم بێـت؟

- بەسـەر سـەر و بەسـەرچاوم، عەلـی کـوڕم دوو هەفتـەی تـر دێتـەوە بـۆ ئـەوەی لەگەڵـی گەشـت بکـەم، تـا ئەوکاتـە لـەلات دەبـم تـا لێـم بێـزار دەبیـت.

- نا ئەزیزەکەم، ماڵ ماڵی خۆتە، هەرگیز لێت بێزار نابم.

دایکـی سـەعید زۆری کـرد لـە ئەمجـەد کـە ئاگاداری خوێندنەکـەی

و بەرنامە هاوسەنگەکەی بێت:

- دایکی عەلی لەلامە، خەمت نەبێ.

دوو هەفتەی ئالتوونی بوو بۆ ئەمجەد... ئاوڕی لە خوێندنەکەی دایەوە، بەشداری کۆرسێکی شەرعی ئۆنلاینی کرد، ناوی لە یانەیەکی وەرزشی تۆمارکرد، لەگەڵ هاوڕێکانی گەشتی کرد... ئەمجەد هەموو کاتژمێرێک یان دوو کاتژمێر جارێک پەیوەندی بە دایکییەوە دەکرد، لەنێوان سیمینارەکانیشدا پەیوەندی پێوە دەکرد... پێویستبوو دایکیشی موبایلەکە بداتە دەنگی دەرەوە بۆ ئەوەی باشتر گوێبیستی دەنگی ئەمجەد ببێت.

- حاڵت چۆنە ئەزیزەکەم؟

- خودا لێت ڕازی بێت، سوپاس بۆ خوا.

- لە هیچت کەم نییە ئەی ڕۆشنایی چاوەکانم؟

- خودا تەمەن و ڕێگات ڕۆشن بکات، لە هیچم کەم نییە، ئاگاداری خۆتبە.

- هەتا تۆ باش بیت، منیش حاڵم باشە تاجی سەرم.

دایکی عەلیش گوێبیستی ئەم غەزەلە دەبێت، دایکی سەعیدیش شانازی پێوە دەکات، شانازی بەوە دەکات کە کوڕەکەی بەم چەشنە مامەڵەی لەگەڵ دەکات و گرانبەهایە لەلای، ئەمجەدیش ئەوە دەزانێت و دەیەوێت سەری دایکی بڵند بکات و هەست بە سەرفرازی بکات بەرامبەر هاوڕێکانی و دڵی دایکی کامەران بکات... هەرچەندە هەندێ پاشماوەی خەمۆکی لەدڵیدا ماوە و پێویستە بەسەریدا زاڵبێت.

دوو هەفتەکە تێپەڕی و دایکی عەلیش گەشتی کرد، بەڵام تالە پەیوەندی بە براکانی کردبوو بۆ ئەوەی پشتی دایکیان بگرن و هەموو ئەرکەکە نەکەوێتە سەر ئەمجەد، چونکە ئەمجەد خودی خۆی پێویستی بە هاوکارییە.

تاله بەیانیان سەردانی دایکی دەکرد...

عاسم، کە هاوڕێی نزیکی دایکییەتی لە منداڵییەوە، وای لێهاتبوو دوکانەکە بۆ شاگردەکەی جێ دەهێشت بۆ ئەوەی ئاگاداری دایکی بێت و هاوکاری بکات.

ئەوەی کەمترین جار سەردانی ماڵی دایکی دەکرد، سەعید بوو، چونکە ماڵەکەی دووربوو، زۆریش سەرقاڵبوو بەکارەوە، بەڵام پەیوەندی بە دایکییەوە دەکرد و لە پشوی کۆتایی هەفتەدا سەردانی دەکرد، هەندێک جاریش هاوسەرەکەی دەستپێشخەری دەکرد بۆ سەردانی کردنی خەسووی.

ڕۆژی جەژنی قوربان نزیک بووەتەوە،

لە جەژندا دایکی سەعید چی بەسەرهات؟

ئەی عەلی چی بەسەرهات؟! کڕیارە هەڵخەڵەتێندراوەکە!

لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەڵوێستی سەمیر چۆنبوو؟

با بەردەوام بین.

***



# ٤

# دایکم بارگرانی نییە بەسەرمەوە

بەرەبەیانی ڕۆژی عەرەفەی پێش جەژنی قوربان، نەخۆشی دایکی سەعید تووند بوو، پێویستی کرد ئەمجەد و عاسم بیبەنە چارەخانە.

چارەسەرێکی چڕی وەرگرت و لەگەڵیدا کوڕەکانی بەبەردەوامی نزایان بۆ دەکرد، تا بۆ بەیانی ڕۆژی جەژن باری تەندروستی جێگیر بوو.

چونکە بەرەجەژنانبوو کاتی زێڕینی فرۆشتنی ئۆتۆمبێلەکان بوو، سەمیر ئاگاداری ئەم گۆڕانکاریانە نەبوو... ئەمجەد پەیوەندی پێوە کرد و هەواڵی پێ گەیاند، هاتە چارەخانە و لەوێ هەموو براکانی و (باسم)ی هاوسەری تالە لە هۆڵی چاوەڕوانی بوون، ڕێگەیان پێ درا بچنە ژوورەوە، چوونە ژوورەوە و لە تەندروستی دایکیان دڵنیابوونەوە.

گەر سەمیر بەردەوام بوایە لە سەیرکردنی پەنجەرەی هۆڵی چاوەڕوانی کردنەکە، ئەوکات دیمەنێکی دەبینی کە لەدەستی چوو ببینێت! ئەویش دیمەنی عەلی بوو، کرپارە هەڵخەڵەتێندراوە داماوەکە، بە هاوکاری هەندێک پیادە ئۆتۆمبێلەکەی پاڵدەنا بۆ لایەکی ڕێگاکە.

ئەم جەژنە جەژنێکی خۆش نەبوو بۆ عەلی، نوێژی جەژنی کرد و گەڕایەوە، نانی لەگەڵ کوڕەکەی و هاوسەرەکەی خوارد، پاشان

خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەوەی بچن بۆ ماڵی باوکی، هەموو جەژنێک لەوێ خۆی و براکانی و خێزانەکانیان کۆ دەبوونەوە و جەژنانەیان دەدا بەدایکیان، هەموو برایەکیش لە ساتێکی کامەراندا جەژنانەیان دەدا بە برازاکانیان.

عەلی برادەرمان بە خۆشحاڵی هەستا، چونکە ئەوە یەکەم جەژنی بوو وەکو براکانی ئۆتۆمبێلی هەبوو، لە هەمان کاتدا دەتوانێت لەگەڵ خۆیدا هاوسەرەکەی و کوڕەکەی ببات، پێویست بەوە ناکات لە نوێژی جەژنەوە یەکسەر دەربچێت بۆ هێڵەکانی گەیاندن، لەوێش کاتێکی زۆری لەدەست بچێت هەتا دەگاتە ماڵی باوکی.

سەر ئۆتۆمبێلەکە کەوتن و بەدڵخۆشییەوە کەوتنە ڕێ... بەڵام لە ناوەڕاستی ڕێگا دیسانەوە لەکار کەوت! هاوڕێکەشمان شۆک بوو و تێما: چی بکات؟ بە هاوکاری هەندێک پیادە ئۆتۆمبێلەکەی بردە لایەکی ڕێگاکە، پاشان هەوڵیدا پەیوەندی بە سەمیرەوە بکات، سەمیریش لە هۆڵی چاوەڕوانی چارەخانە بوو، ناوی عەلی لەسەر موبایلەکەی بینی، ڕووی ڕەش داگەڕا و لە دڵی خۆیدا وتی:

- ئۆف! من خەمی چیمە و ئەوەش خەمی چیەتی!... دایکم ماندووە، لە کڕین و فرۆشتنیش بێئاگا بوومە... خۆت بڕۆ ئۆتۆمبێلەکە چاک بکەوە و واز لەمن بێنە! پێی دەڵێن: ئۆتۆمبێلی دەستی دوو، دەستی دوو بەتەما نیت کامریی بێت؟!... پەیوەندیەکەی بەسەر عەلیدا داخستەوە...

عەلی هەوڵیدا جارێکی تر پەیوەندی بکاتەوە، کەچی سەمیر موبایلەکەی خستە سەر باری بێدەنگی، بۆ جاری سێیەمیش پەیوەندی کرد، بەڵام سوودی نەبوو، بۆیە پەیوەندی بە فیتەرێکی ناسیاویەوە کرد، بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێلەکەی چاک بکاتەوە، کەچی ئەویش هەڵی نەگرت، چونکە ئەمڕۆ جەژنە و هەمووان سەرقاڵن.

ئەم برادەرەمان پەی بەوە برد دەستکەوتنی هەر فیتەرێک لەم ڕۆژەدا سەخت دەبێت، بۆیە کەوتە دوو دڵییەوە: «چی بکەم؟ ئایا تەکسییەک ڕابگرم بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەم بچمە ماڵی باوکم؟ نازانم چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکە چەنی تێ دەچێ. ئەو بڕەی بەزۆر پاشەکەوتم کردووە بۆ جەژنانە، ئێستا دەبێ لە چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل خەرجی بکەم. ئایا شیاوە براکانم جەژنانە بدەنە دایکم و منیش دانیشم و سەیریان بکەم؟ یان قەرزیان لێ بکەم؟ بەم ڕۆژی جەژنە قەرزیان لێ بکەم لەکاتێکدا براکانم باری داراییان وەک من سادەیە؟!

کاتێک بەم شێوەیە بیری دەکردەوە، برا گەورەکەی پەیوەندی پێوە کرد، چونکە هەموویان کۆ بووبوونەوە و سەیریان لە دواکەوتنی ئەم هات، عەلی نەیدەزانی چی بە براکەی بڵێت بۆیە وەڵامی نەدایەوە.

لە کۆتاییدا ناچاربوو بڕیارە سەختەکە بدات: هاوسەر و منداڵەکەی بباتەوە ماڵەوە و ئۆتۆمبێلە لەکارکەوتووەکەش لەدوای خۆیان جێ بهێڵن، ئەو کاتە کامەرانەی چاوەڕێیان دەکرد لە دەستی بدەن.

برادەرەکەمان تەکسییەکی ڕاگرت و بە بێهیواییەوە گەڕانەوە ماڵەوە، لەم نێوەندەشدا لەلایەن براکانیەوە پەیوەندی زۆری بۆ هات و ئەویش وەڵامی نەدەیەوە، تا ئەو کاتەی پەیوەندی لە باوکییەوە بۆ هات و ناچار بوو وەڵام بداتەوە:

- سلام علیکم باوەگیان.
- علیکم السلام... عەلی ئێوە لەکوێن؟ هەمووان کۆبووینەتەوە و کەمێکی تر بەڕێ دەکەوین.
- بمبوورن باوکە، بارودۆخم سەختە، ئەوکەسەی ئەم ئۆتۆمبێلەی پێ فرۆشتم هەواڵەی خوای دەکەم! دیسان لەکار کەوتەوە، ئێستا وا لە ماڵەوەم.

- لە ماڵەوەی؟ بۆچی بە تەکسی نەهاتنە لای ئێمە؟
- بمبوورە بابە، بارودۆخە ئیتر...

برادەرەکەمان شەرمی کرد بڵێت: «برِی پێویستی پێ نییە بۆ چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل و پێدانی جەژنانە. کۆتایی بە پەیوەندیەکە هێنا، بە دڵشکاوییەوە دانیشت.»

سەمیر ئاگاداری هیچیەک لەم ناڵاندنانەی نەبوو کە ئەو هۆکارییبوو، کاتێک هەڵیخەڵەتاند بۆ ئەوەی هەندێک پارە دەست بخات لە چاککردنەوەی رووکەشیدا.

براکانی سەمیر لە ژووری دایکیانەوە بۆ سەردانیکردنی جەژنان بەرِێکەوتن، سەمیریش بەرِێ کەوت بۆ سەردانی کردنی هاورِێیەکی و پاشان تەواوکردنی بازرگانییەکەی، تالەش لەلای دایکی مایەوە و وا رِێککەوتن پێش ئێوارە دیسان لەلای دایکیان کۆببنەوە.

دوای عەسر سەعید پەیوەندی بە سەمیرەوە کرد:

- سوپاس بۆ خوا دایکم زۆر باشتربووە، دەرِۆم بۆ ئەوەی لە نەخۆشخانە بیهێنمە دەرەوە.
- «منیش لەگەڵت دێم»... ئەوە ئەو قسەیە بوو سەعید چاوەرِێ بوو لە سەمیر گوێبیستی ببێت، بەڵام گوێبیستی نەبوو!
- باشە سوپاس بۆ خوا... زۆر چاکە.
- کاتژمێر شەش لە ماڵی دایکم دەتبینمەوە.
- لەوانەیە لەو کاتەدا سەرقاڵ بم... بەهەرحاڵ ئەگەر توانیم دێم.

بە دەنگێکی بەهێزەوە وتی:

- وا پێویستە هەموو شتێک جێ بهێڵیت و ئامادە ببیت... خودا دەزانێ دایکم چەنی تر لەناومان دەمێنێتەوە و ئەمرِۆش رِۆژی جەژنە!
- باشە باشە... دێم.

کچ و کوڕەکان کاتژمێر شەش لای دایکیان کۆبوونەوە، سەعید مستیلەیەکی ئاڵتونی گرانبەهای بۆ هێنابوو، تالەش چاکەتێکی بۆ هێنابوو هەتا بە زستانان گەرمی بکاتەوە، عاسمیش دوو بلیتی بڕیبوو بۆ ئەوەی دایکی بباتە عومرە، بۆ ماڵی خودا:
- ئازیزەکەی هەمووان، خۆت ئامادە بکە، یەک مانگت لەپێشە بۆ ئەوەی وەک ئاسک باز بدەیت إن شاء الله، تاکو لەگەڵ خۆم بتبەمە عومرە هاوڕێی ژیانم.
- إن شاءالله، خودا ئاسانی بکات.

ئەمجەد لەناو خوشک و براکانی پارەی کەمتر بوو، بەشی خۆی لە زەوییەکە بە سەعید فرۆشتبوو، بۆ ئەوەی خەرجی پێداویستی دایکی و دەرمانەکانی و سەردانی پزیشکییەکانی بکات... دایکیشی بەشی خۆی بە (باسم)ی هاوسەری تالە فرۆشتبوو، پارەکەشی لەناو کەنتۆر هەڵگرتبوو... وای دەزانی ئەمجەد لە ناو کەنتۆرەکە پارە دەبات بۆ خەرجی دەرمانەکانی، بەڵام لە ڕاستیدا لە گیرفانی خۆی پارەی دەبرد، تەنیا ئەو پارەیە نەبێ دوێنێ پێویستی بوو بۆ خەواندنی دایکی لە چارەخانە، چونکە پارەکەی خۆی کەمی کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا باوەشە گوڵێکی سادەی بۆ هێنابوو لەگەڵ کارتێک کە لەسەری نوسرابوو: (دایکی ئازیزمان، تاجی سەرمان، خودای گەورە بتپارێزێت).

ئەی چی سەبارەت بە دیاری سەمیر؟ سەمیر هەموو ئەمانەی لە خوشک و براکانی بەدی دەکرد، گوێشی لە دایکی دەبوو کە ڕازیبوونی خۆی لە دانە بە دانەیان دەردەبڕی و بە دیارییەکانیان خۆشحاڵ دەبوو، لەگەڵ هەموو ئەوانەش هەرگیز بە خەیاڵیدا نەهات دیارییەک بۆ دایکی بکڕێت لە جەژندا... شەرمیشی لە خۆی نەکردەوە کاتێک بینی ئەو تاکە کەسە لەنێوان براکانی دیاری لەبیرکردووە

بۆ دایکی! بەڵکوو سەرنجی ئەوەی نەدا و بگرە ئەم هەڵەیەی هەر چاکیش نەکردەوە!

مێشکی سەرقاڵ بوو بەو ئۆتۆمبێلە ناوازەیەی کە دەترسا لەدەستی بچێت! لە دیارییەکانی خوشک و براکانی تەنیا ئەوە سەرنجی ڕاکێشابوو کە:

- «دیاری ئاوا، ئەوە دەگەیەنێت کە خوشک و براکانم پارەی زۆریان هەیە، چی بکەم تاکو وەکو ئەوان پارەم هەبێت؟ بازرگانییەکەم لە گەشەدایە، بەڵام بەو خێراییە نییە کە من دەمەوێت!

کاتێک خوشک و براکانی ویستیان ماڵی دایکیان جێ بهێڵن، سەعید پەستبوو لەم غەفڵەتەی سەمیر، لە سەمیر نزیک بووەوە:

- سەبارەت بەو ملیۆنەی لێت قەرز کردم، کەی دەمدەیتەوە؟

سەمیر حەپەسا و پەشۆکا:

- بەڵێ مافی خۆتە بەسەرمەوە، دواکەوتم.

بۆ ئەوەی بەهانە بۆ دواکەوتنی بهێنێتەوە وتی:

- بە ئۆتۆمبێلێک لە ئۆتۆمبێلەکان هەڵخەڵەتێندرام و زیانم پێ گەیشت، إن شاء الله دوو هەفتە مۆڵەتم بدە قەرزەکەت دەدەمەوە.

سەعید سەری لەقاند و بێدەنگ بوو، نەیویست لەوە زیاتر براکەی خەجاڵەت بکات. جەژن تێپەڕی و بارودۆخی دایکیان بەرەو باشتربوون چوو، چونکە نەخۆشییەکەی لەو جۆرەیە کە جارێک توند دەبێت و جارێک ئاسان. دوو هەفتە تێپەری ئەمجەد تاقیکردنەوەکانی وەرزی یەکەمی ئەنجامدا، لەو نێوەندەدا بە نزیکەیی تەواو چاک بوویەوە لە خەمۆکی، پشووە کورتەکەی نێوان دوو وەرزەکەی دەستی پێ کرد. ژیانی خوشک و براکانیشی گەڕایەوە باری ئاسایی ژیانی خۆیان، کەمتر ئاگاداری دایکیان دەبوون...

هەر لەگەڵ دەستپێکی وەرزی نوێی ئەمجەد، دیسانەوە تەندروستی دایکی دەستی بە ناجێگیربوون کرد...
- تالە، دایکم تەندروستی ناجێگیرە... دکتۆر بەشە دەرمانەکانی بۆ زیاتر کردووە، بەڵام وەڵامدانەوەی بۆ دەرمانەکان لاوازە.
- پەنا بەخوا! باشە ئەمجەد... .کۆرسێکی پەروەردەییم هەیە لە ماوەی چەن هەفتەیەک کۆتایی دێت، دوای ئەوە هەوڵ دەدەم کاتێک بۆ دایکم تەرخان بکەم، لەو کاتەشدا إن شاءالله باسم لە گەشتەکەی هاتۆتەوە.
- «لە ماوەی چەن هەفتەیەک؟!»... ئەمجەد بیرێکی لەخۆی کردەوە، وایزانی وەڵامدانەوەی تالە لەوە بەهێزتر دەبێت...» چەن سیمینارێک تێپەڕیوە هێشتا نەمخوێندووە لەبەر سەرقاڵیم بە دایکمەوە».

بۆ یەکەمجار ئەمجەد ڕووی کردە سەمیر، سەمیریش تێبینی بارودۆخی دایکی نەکردبوو، چونکە زۆرینەی کاتەکانی لە دەرەوە بەسەر دەبرد و هیچ ژەمە خواردنێکی لەگەڵ نەدەخواردن... دایکی سەعید شەوی ڕابردوو لەتاو ئازاردا خەو نەچووبووە چاوەکانی، بۆیە ئەمجەدیش لێیگەڕا و بۆ نانی بەیانی خەبەری نەکردەوە و بە سەمیری وت:
- سەمیر، دایکم دیسانەوە ماندووە.
- خودا بۆی ئاسان بکات.
- پێویستە بیبەینەوە بۆ لای دکتۆر.
- «باشە بەیانییەکەی پێم بڵێ، با ئۆتۆمبێلەکەمت پێ بدەم» سەمیر لەم کاتەدا لەپێش ئاوێنەکە قژی شانەدەکرد و خۆی ئامادەدەکرد بۆ دەرەوە...
- ئۆتۆمبێل گرنگترین شت نییە لە بابەتەکەدا... سەختە دایکمان بەتەنیا لەماڵەوە جێ بهێڵین.

- باشە، پەرستارێک بهێنە و بە هاوبەشی خەرجییەکەی دەدەین.
- پەرستار! سەمیر دایکم پێویستی پێمانە.
- با ئێمە کرداری بین... نازانین نەخۆشی دایکمان چەن درێژە دەکێشێت، لەم دەمەدا گەر بازرگانییەکەم پشتگوێ بخەم ئەوا شکست دەهێنێت.

سەمیر بەڕێکەوت و ئەمجەدی جێهێشت، ئەمجەد بڕیاری دابوو ئەو ڕۆژە نەچێتە زانکۆ، چونکە هەستی کردبوو دایکی ناتوانێت ئەو ڕۆژە بەتەنیا بەڕێ بکات. کەمێک بیری کردەوە و بەخۆی وت:

- ئەوە چییە؟! ئەم بێ هیوابییە چییە؟!... ئایا دایکم بووە بە بارگرانییەک کە دەمەوێ بیخەمە سەر شانی کەسێکی تر؟! لەدوای ئەوەی تالە و سەمیر دەستیان نا بە ڕوومدا، پەیوەندی بە عاسم و سەعیدەوە ناکەم بۆ ئەم بابەتە.

هەستا بۆ ئەوەی دایکی خەبەر بکاتەوە... دواتر گەڕایەوە و دانیشت و لە دڵی خۆیدا وتی: «بەڵام من یەکەمی زانکۆکەمم. سەرەڕای ئەو بارودۆخەی پێیدا تێپەڕیوم، ئایا یەکەمین لەسەر ئاستی زانکۆ، دەکرێت شکستخواردوو بێت؟ حەسوودەکانیش وەکو دەرفەتێک دەیقۆزنەوە، ئەی بۆچی بەتەنیا من؟ کوا خوشک و براکانم؟ گەر بارگرانییەکەم لەگەڵ دابەش بکەن ئەوا شکست ناهێنم... دیسانەوە (بارگرانی)، دایکم بوو بە بارگرانی؟! ئەو کۆرسە شەرعیانەی ئامادەیان بووم لەکوێن؟ بگرە کوا ئەو قورئانەی دەیخوێنم؟ کوا﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًا﴾. ئەوە یەکەم تاقیکردنەوەی ڕاستەقینەیە بۆ ئەوەی ببینم ئایا من لەوانەم بەبێ کردار دەدوێم یان نا...

بەڵام وەک چۆن سەمیر وتی: «نازانین نەخۆشی دایکمان چەند درێژە دەکێشێت... ئایا بەدرێژایی ئەم ماوەیە ئاوا لەگەڵی بمێنمەوە؟

بۆچی کرداری نەبین و پەرستاریک نەهێنین؟»، «نەخێر، من دایکم دەناسم، زۆر هەستیار دەبێت بەم بیرۆکەیە».

- «یا ئەڵڵا، بەناوی خودا»... بە قورسی لەسەر جێگایەکەی هەڵدەستا، ئەمجەدیش چوو هاوکاری بکات.

- کوڕم بۆچی ئەمڕۆش نەچوویتە بۆ زانکۆ؟

- گوێی مەدەرێ ئازیزم... لەسەر کتێب سیمینارەکە دەخوێنم و گوێ لە وانە تۆمارکراوەکانیش دەگرم.

- «ئەمجەد تۆم ماندوو کردووە»... ئەمجەد سەیری چاوەکانی دایکی کرد، خەم لەچاوەکانی دەبارین بەدەم وتنی ئەم قسەیەوە، دەستەکانی گرت و وتی:

«وا مەڵێ ئازیزەکەم، بەڵکوو سوێند بەخوا ئەمە بۆ من شەرەفمەندیە».

- بڕۆ ئەمجەد بڕۆ، خودا لێت ڕازی بێت و دڵت ڕۆشن بکات، ژیانت بۆ ئاسان بکات، بەبێ ئازار و لێپرسینەوە بتخاتە بەهەشت.

دڵی ئەمجەد کەوتە سەماکردن و بەم وشانە خەمەکەی لەبیرکرد:

- دەمت خۆش بێت ئازیزەکەم، وەرە با خۆشترین ژەمی نانی بەیانیت بۆ ساز بکەم.

دوو هەفتە بەسەر ئەم دۆخەدا تێپەڕی، نەخۆشیەکە کاریگەری خستە سەر گورچیلەکانی... بۆیە پێویستبوو چەندین جار سەردانی بەشی غەسلی گورچیلە بکات. سەمیر دایکی دەبینی پشتی کووڕ بووبوو بە ماندووییەوە لەگەڵ ئەمجەد دەچوو بۆ لای دکتۆر... بەلایەنی زۆر زۆرەکەیەوە بەیانی باشی لێ دەکردن و یارمەتی دەدا لە سەرکەوتنی ئۆتۆمبێل و دەیوت: «سەلامەتیە دایەگیان»... تەنیا ئەوەندە! چونکە مێشکی بەتەواوەتی سەرقاڵبوو بە ئۆتۆمبێل و کڕیارەکان و چاککردنەوە و قازانج کردن!

سەمیر -لەگەڵ ئەو سەرقاڵییەی مێشکی- تێبینی ئەوەی نەکرد کاتێک دەیوت «سەلامەتییە دایەگیان» دایکی نە تەمەشای دەکرد و نە وەڵامیشی دەدایەوە، چونکە دڵی بەرانبەر ئەو سەلامەت نەبوو!

سیمینارەکان لەسەر ئەمجەد کەڵەکەبوو... دایکی تێبینی بیر ڕۆیشتن و ناڕوونی ئەمجەدی دەکرد، سەرەڕای ئەوەی هەوڵی دەدا ئەوە بشارێتەوە، لەو دەمەی غەسلی گورچیلەی بۆ دەکرا، بە ئەمجەدی وت:

- ئەمجەد... کوڕی شیرینم خوێندنەکەت چی لێهات؟

- گوێی مەدەرێ ئازیزم... ئێستا گرنگترین شت تەندروستی تۆیە.

ئەمجەد تەماشای ئەو کتێبەی دەکرد کە باسی توێکاری دەکرد، وا خۆی دەر دەخست کە دەخوێنێت بۆ ئەوەی دایکی هەست نەکات لە خوێندنی خستووە، گەرچی ئەو ناتوانێت لەگەڵ کەشی چارەخانە و زۆری ژاوەژاوەکەی سەرنج بدات... پێی سەیر بوو کە دایکی وەڵامی ئەم وشانەی نەدایەوە، سەری بەرزکردەوە و لە دایکی ڕوانی... بینی ئەسرینەکانی ئەم ئافرەتە باشە بەسەر ڕوومەتەکانیدا دێنە خوارەوە، بە بێدەنگی و بەدەم گەستنی لێوەکانی و هەوڵی دەدا دەنگی گریانەکەی نەیەت، ئەمجەد کتێبەکەی بەلاوەنا و هەستا، دەستێکی گرت و دەستەکەی تری لەسەر نێوچەوانی دانا و ڕوومەتی ماچکرد:

- دایەگیان چیتە ئازیزم؟

- «نامەوێ ببمە لەمپەر لە ڕێگای سەرکەوتنت، تۆ نارەحەتیت لە دواکەوتنت لە خوێندنەکەت، منیش ئەوە دەزانم»... ئەوەی بە دەم گریانەوە وت.

- لەمپەر؟! تۆ بەرەکەتی ژیانی منی، تۆ ڕۆشنایی چاوی منیت، تۆ سەرکەوتنی منیت دایەگیان. کەوتە سەر دەستەکانی و جارێک

دەستی ماچ دەکرد و جارێکیش گۆنای، تا ئەو کاتەی پەرستارەکە هات.

ئەمجەد خۆی لادا تا پەرستارەکە ئامێرەکان لەدایکی بکاتەوە و دایکی ئامادە بکات بۆ ڕۆیشتن.

دوای بینینی فرمێسکەکانی دایکی، ئەمجەد چی بڕیارێک دەدات؟

ئەی ئەو کەسەی دەچێتە ناو ژیانی سەمیرەوە و لە بنەڕەتەوە دەیگۆڕێت کێیە؟!

ئەی ئەو سێ وشەیەی کڕیارە هەڵخەڵەتێندراوەکە ناردی، چی بوون؟

با بەردەوام بین.

***



# ٥

# نزای ستەملێکراو

فرمێسکەکانی دایکی سەعید بە ئاسانی بەسەر دڵی ئەمجەددا تێنەپەڕی! لەو کاتەی پەرستارەکە دایکی ئامادە دەکرد بۆ چوونە دەرەوە، ئەمجەد لە دڵی خۆیدا دەیوت: «دایکم هەستیارە و هەرچەنێک هەستەکانم بەسەر ڕووخسارمەوە بشارمەوە، هەر هەستی پێ دەکات، دەمەوێت بە جەستە و بە دڵەوە کاتەکانمی بۆ تەرخان بکەم، هەتا لە زانکۆ بمێنم ناتوانم ئەوەی بۆ بکەم، نامەوێت هەر بیر لە خوێندنەکەم بکاتەوە، لەم وەرزەدا خۆم دەکەوێنم و ئەم هەواڵەشی پێ دەگەیەنم بۆ ئەوەی بڕیارەکە بکەمە ئەمری واقیع و کاتەکانمی بۆ تەرخان بکەم... بەڵام کەواندنی وەرزەکە واتا لە دەستدانی تەواوی ساڵەکە، دەبێ ساڵەکە سەر لە نوێ بخوێنمەوە، وەرزی یەکەمیش لە دەست دەدەم، بگرە لەوانەشە بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێک لە زانکۆ دابڕێم، گەر کەسێک یارمەتیم نەدات بۆ ئاگا بوون لە دایکم»...

«ئەی خوێندنەکەم، بگرە بڕوانامەی پزیشکی چ سوودێکی هەیە، گەر لەسەر حسابی تەندروستی دایکم و دەروونی ئەو بێت؟ ئایا من دەخوێنم بۆ ئەوەی خەڵکی چارەبکەم لەسەر حسابی چارەکردن و ئاسوودەیی دایکم؟ بەهەر نرخێک بێت پارێزگاری لە هەستەکانی و کەرامەتی دەکەم، خودا بەزایەم نادات»...

لەو دەمەدا، ئەمجەد هەستی بە ئارامییەکی سەیر کرد! دوودڵییەکەشی بەتەواوی نەما! هیچ خەمێکی نەما سەبارەت بە لە دەستچوونی خوێندنەکەی، بڕیاریدا: «سبەی ئەم وەرزە دەکەوێنم و کاتەکانم بۆ دایکم تەرخان دەکەم»، هەستی کرد هەندێک لە هاوپۆلەکانی خۆشحاڵ دەبن بەم بڕیارەی، مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لە گرووپی خوێندکارەکان نووسی: «هاوپۆلە ئازیزەکانم، ئەم وەرزە خۆم دەکەوێنم و کەی دۆخی دایکم جێگیربوو دەگەڕێمەوە لاتان بە ئیزنی خودا، دایکم لەدوعای خێر بێ بەش مەکەن».

پێش ئەوەی ئەم قسانە بنێرێت بیری کردەوە: «چی لە قسەی خەڵک بکەم؟ با ئەوە لەنێوان خۆم و خودا بمێنێتەوە». هەموو ئەوەی نووسیبووی سڕییەوە و موبایلەکەی کردە ناو گیرفانی و لە دڵی خۆیدا وتی:

«وەڵڵاهی خودا بەزایەم نادات».

ئەمجەد لەگەڵ دایکیدا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بڕیارەکەی بە دایکی نەوت، بۆ ئەوەی یەک و دووی لەگەڵ نەکات...

لە ڕۆژی دواتردا، دایکی نانەکەی خوارد و ڕۆیشت سەرخەوێک بشکێنێت، موبایلەکەی لای سەری خۆی دانا بۆ ئەوەی گەر پێویستی پێی بوو پەیوەندی پێوە بکات، ئەمجەد بەوە بێخەم بوو... بۆیە چووە زانکۆ، وەرزەکەی کەواند و بە خێرایی گەڕایەوە ماڵەوە، دەستی کرد بە نامەناردن بۆ هەندێک لە دکتۆرەکانی هەتا هۆکارەکەیان پێ بڵێت، بۆ ئەوەی شۆک نەبن، بۆیە لەلایان پایەبەرزتر بوو، تەنیا دکتۆری فیسیۆلۆجیای نەخۆشییەکان نەبێت، ئەو هەر کە نامەکەی پێگەیشت یەکسەر پەیوەندی بە ئەمجەدەوە کرد، دەستی کرد بە بەگەمژەزانینی ئەو کوڕە و هەوڵیدا ڕازی بکات بە گرتنی پەرستارێک بۆ ئەوەی ئاگای لە دایکی بێت و لەگەڵی

بچێت بۆ چارەخانە. چونکە بەزەیی پێیدا دەهاتەوە کە ئەو کوڕە بلیمەتە لە خوێندنەکەی دوا بکەوێت... بەڵام ئەمجەد بە ئارامییەوە دەستی بە بڕیارەکەیەوە گرتبوو.

ئەمجەد گەڕایەوە ماڵەوە و کونافەی بۆ خۆی و دایکی کڕیبوو:

- دایکی سەعید، وەرە ئاهەنگ بگێڕین.

- بۆچی؟

- لە ئێستاوە بڕیارم داوە پسپۆڕییەکەم دیاری بکەم.

- بەم خێراییە؟

ئەی دوای تەواوکردنی پزیشکی گشتی پسپۆڕیتان دیاری ناکەن؟!

- بڕیارم داوە لە ئێستاوە پسپۆڕی وەربگرم لە تێرکردنی چاوەکانم لە تۆ و بە دەستهێنانی ڕەزامەندیت و دڵخۆشکردنت ئازیزی من.

دایکی حاڵی نەبوو، ئەمجەد دەستەکانی گرت و وتی:

- ئەم وەرزەم کەواند بۆ ئەوەی شەرەفمەندی هاوڕێیەتی تۆ بەدەست بهێنم، کاتەکانم بۆ تۆ تەرخان بکەم... ئەوەش باشترین بڕیاری ژیانمە.

دایکی دەستی بە گریان کرد و وتی:

- کوڕم بۆچی؟! بۆچی؟

- «دایەگیان، سوێند بەخودا من خۆشحاڵم بەم بڕیارەم، هەموو دنیا بەقوربانی تۆ بێت... وەیسی قەرەنی هاوەڵایەتی پێغەمبەری(ﷺ) لەدەست چوو، چونکە ئاگای لە دایکی بوو و چاکەکار بوو لەگەڵیدا، پێغەمبەریش(ﷺ) لەبارەیەوە فەرمووی: لە چاکترینی تابیعینەکانە، فەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد داوا لە وەیس بکەن نزایان بۆ بکات، سەرەڕای قەدرگرانیی هاوەڵەکانی... من چیم لە دەست دەچێت؟ خوێندنی وەرزێک؟ ئەوە هیچ نییە لەپێناو تۆدا ئازیزەکەی من، وەرە هەتا کونافەکە گەرمە با بیخۆین».

سەرەڕای ئەوەی ئەمجەد دەیزانی ئەم چاکبوونەی لەگەڵ دایکی چاکەیەکە دێتەوە ڕێی، بەڵام هەرگیز پێشبینی نەدەکرد خودا هێندە بەرزی دەکاتەوە و هێندە کامەرانی دەخاتە دڵییەوە.

سەمیر لە بازرگانییەکەی بەردەوامبوو... خۆی و هیشامی هاوڕێی هەندێ جار لە چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکاندا فێڵیان دەکرد، بەڵام فێڵێک خراپیەکەی کەمتر بوو لەو فێڵەی لە ئۆتۆمبێلەکەی عەلیان کرد، لە ترسی خراپی ناوبانگ و سەرنەکەوتنیان لە بازرگانییەکەدا. دواکەوتنی بۆ ماڵەوە زیاتربووبوو، بە دەگمەن نانی بەیانیان یان ئێوارەی لەگەڵ ئەمجەد و دایکی دەخوارد.

دوای دوو ڕۆژ لە (کەواندنی وەرزی خوێندنەکەی ئەمجەد)، ئێوارەکەی زوو هاتەوە... ئەمجەدیش بۆ نوێژی مەغریب چووبوو بۆ مزگەوت... سەمیر بە بیرێکی ڕۆیشتووەوە ئێوارەباشی لە دایکی کرد، پاشان لەسەر قەنەفە گەورەکەی هۆڵەکە دانیشت، بەرانبەر قەنەفەکەی دایکی، موبایلیشی بەدەستەوە گرتبوو.

دایکی چاوەڕێی ئەوەبوو ئەمجەد پرسیاری تەندروستی لێ بکات یان ئامادەی دەرببڕێت لەوەی ئەمجارە خۆی ببیات بۆ لای دکتۆر، چارەکێک تێپەڕی و تەنانەت چاویشی لەسەر موبایلەکەی هەڵنەبڕی!

- «ئاااهـ ... خودایە بە ناوت»... دایکی بەدەم هەستانەوەی و ڕۆیشتنی بۆ سەرجێگاکەی بە ئەنقەست دەنگی بەرزکردەوە، دەیویست سەمیر گوێبیستی ئەم وشانە بێت، بەڵکو هەست بکات دایکی پێویستی پێیەتی و ببیات بۆ لای دکتۆر و ئەرکی ئەمجەد کەم بکاتەوە.

بەڵام سەمیر هەر لە وێنەی ئۆتۆمبێلی دەکۆڵیەوە... ئەسڵەن گوێی لە دەنگی دایکی و ئاخەکانی نەبوو! پاشان زەنگی موبایلەکەی ئەو بێدەنگیەی پچڕاند:

- سڵاو... زاهیرت لەگەڵە... ڕیکلامت بۆ ئۆتۆمبێلی (کیا کادینزا ٢٠٢٠) کردووە؟
- بەڵێ.
- کۆتا نرخی چەندە؟
- دوو دەفتەر.
- زۆرە.
- نەخێر، ئۆتۆمبێلەکە نایابە، زۆر کەم ڕۆیشتووە و پێویستی بە هیچ چاککردنەوەیەک نییە.

دایکی بە سەیرکردنێکی بوغزاوی و بێهیوایی لە سەمیری دەڕوانی، سەمیریش تێبینی هیچ یەکێک لەمانەی نەدەکرد!

دایکی لە دڵی خۆیدا وتی: «ئەی ئەو کەسەی لە سکمدا هەڵمگرتی! لە ئێستادا لە بارودۆخێکی باشدا نیم! پێویستم بە گرینگیدانی تەندروستیمە بە هەموو ڕەنگ و شێوەکانی!»

سەمیر لەگەڵ ئەم کڕیارە (زاهیر) لەسەر کاتێک ڕێکەوتن، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئۆتۆمبێلەکە ببینن.

لە ڕۆژی دواتر گەیشتن بەیەک: پیاوێکی تەمەن چل و یەک ساڵ، قژ ماش و برنج، سمێڵ بابڕ... وەکو سکرتێر لەلای پیاوێکی زەنگین کاری دەکرد (ئەبو عەزام)... خۆی بە سەمیر ناساند و سەرسامی چالاکییەکانی بوو، لەسەر کڕینی ئەو ئۆتۆمبێلەی زاهیر دەیویست بۆ کوڕەکەی بیکڕێت ڕێکەوتن، لە کاتی مامەڵەی (بەناو کردن) لە فەرمانگەی هاتوچۆ تیبینی ئەوەی کرد سەمیر خاوەن پەیوەندیگەلێکی فراوانە، زاهیر پرسیاری زیاتری لەبارەی سەمیرەوە کرد، زانی سەمیر لە بازرگانی ئۆتۆمبێلی دەستی دوودا لە پڕێکدا بووە بە کوڕێک...

«وا دیاره کەسێکی گونجاوه... ئەبو عەزام داوای لێکردم پێشانگایەکی ئۆتۆمبێلی دەستی دوو بکەمەوه و بیدەمە دەستی یەکێک لە فەرمانبەرەکان، هیچ یەکێک لە فەرمانبەرەکانی گونجاو نین بۆ ئەم کاره... لەگەڵ ئەوەشدا ئەبو عەزام پێداگره لەوەی کارێکی ئاوای هەبێت»...

زاهیر پێشنیاری کرد کە سەمیر لەگەڵ مامۆستا -ئەبو عەزام- قسە بکات و پێشنیاری بۆ بکات سەرمایەیەکی بداتێ و پێشانگای ئۆتۆمبێلی دەستی دوو بکاتەوه و قازانجەکانیش لەگەڵ ئەبو عەزام بەش بکات.

چاوەکانی سەمیر دەبریسکانەوه، «سەرمایە؟! ئەمەبوو چاوەڕێم دەکرد، پێویستم بە بازدانی خێرایە»...

- ڕازیم.

دوای دوو ڕۆژ زاهیر پەیوەندی کرد:

- سەمیر، مامۆستا سەرەتا پێشوازی لە بیرۆکەکە کرد، بەڵام دەیەوێ جارێ بتناسێت... خشتەی کارەکانی قەرەباڵغن و عەسری ڕۆژی هەینی داهاتوو گەشتێکی هەیە بۆ چین. بۆیە چاکترین کات ئەوەیە بۆ نانی نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی شەرەفمەندم بکەن. زوو وەره، کاتژمێر دوانزه، بۆ ئەوەی مامۆستا کاتی هەبێت بتناسێت.

سەمیر لە دڵێ خۆیدا وتی:

- دوانزەی نیوەڕۆ؟ ئەوه هاوکاتە لەگەڵ نوێژی هەینی!

هەتا ئەو کاتە، گەرچی سەمیر کەمتەرخەمی هەبوو لە نوێژەکانیدا، بەڵام سووربوو لەسەر ئەوەی ئامادەی نوێژی هەینی ببێت.

- باشە ناکرێ کاتژمێر یەک بێت؟

- فڕۆکەی مامۆستا کاتژمێر چوار هەڵدەفڕێت، بۆیە دەبێت پێش کاتژمێر دوو لەماڵ بچێتە دەرەوە. گەر کاتژمێر یەک بێیت بە پێی پێویست فریا ناکەویت لەگەڵی دابنیشیت. بۆچی زوو نایەیت؟ شتێکت هەیە؟

سەمیر پێی شەرم بوو هۆکارەکەی بە زاهیر بڵێت، تێبینیشی کردبوو زاهیر مستیلەیەکی زێڕی لەپەنجەیە، دەترسا کاتێکی گونجاوی نزیک نەبێت بۆ مامۆستا سەرقاڵەکە، لە کۆتاییدا چاوپێکەوتنەکە زۆر دوا بخات یان لە بیرۆکەکە پەشیمان ببێتەوە.

- نا کێشە نییە، کاتژمێر دوانزە دێم.

پەیوەندییەکە کۆتایی هات...

- «کاری چاکەی تر دەکەم بۆ ئەوەی لە دەست چوونی نوێژی هەینی قەرەبوو بکەمەوە، خودا بەبەزەیی و بەخشندەیە... ڕۆژی هەینی، واتا دوو سبەی، پێویستە بە تەواوی ئامادەکاری بکەم بۆ ئەم چاوپێکەوتنە»...

ڕۆژی چوارشەمە تێپەڕی، ڕۆژی پێنجشەمە هات... عەلی هاوڕێمان کە یەکەم ئۆتۆمبێلی سەمیری کڕی، بەو سەیارەیەی پێی هەڵخەڵەتێندرا بەڕێ دەکەوێت، ئەوەتا بۆ جاری سێیەم لەکار دەکەوێت لەو دەمەی دەچوو بۆ سەر کارەکەی، دیسانەوە بە هاوکاری خەڵکی دەیباتە لایەکی شەقامەکە، دواتر بە ترس و بەپەلە سواری تەکسی دەبێت، چونکە ئەوە لە کارەکەی دوای خستووە و ئەمەیش بەڕێوبەرە جددیەکەی تووڕە دەکات.

نیو کاتژمێر لە کارەکەی دواکەوت، بەڕێوەبەریش بۆ ئۆفیسەکەی بانگهێشتی کرد:

- عەلی، چەندین جار ئاگادارم کردیتەوە کە ناتوانم لەوە زیاتر بەرگەی دواکەوتنت بگرم.

- جەنابی بەڕێوەبەر، بەدەست خۆم نییە، سوێند بە خودا ئۆتۆمبێلەکەم لەکار کەوت و...

بەڕێوەبەر قسەی پێپچڕاند:

- بە دەستی تۆ بێت و بەدەستی تۆ نەبێت، ئۆتۆمبێل لەکار بکەوێت و لەکار نەکەوێت، ئەوانە گشتی پەیوەندی بەمنەوە نییە، گەر بەهانەکانت وەرگرم ئەوا فەرمانبەرەکانی تریش لاسایت دەکەنەوە و کارکردن لە کۆمپانیا دەبێتە فەوزا... بەداخەوەم کە ئەوەت پێ دەڵێم: فەرموو، ئەوە کاغەزی دەرکردنتە لە کارەکەت.

عەلی لە کارەکەی دەرکرا، ئێستا لەسەر شەقامە و خەمبارە، بێ پارە، بێ کار، بگرە ئۆتۆمبێلێکی لەکارکەوتووی لە پەنایەکی شەقامدا هەیە و خەرجی چاککردنەوەی نییە، هاوسەرێک و منداڵێکیشی هەیە کە چاوەڕێن خواردنێکیان بۆ بهێنێتەوە و برسێتیان برەوێنێتەوە!

عەلی پەیوەندی بە سەمیرەوە کرد -سەمیریش خەوتبوو- هەستا لەخەو...

- «ئۆف! دیسانەوە لەگەڵ ئەم ڕەزاقورسە؟!» پەیوەندییەکەی پچڕاند و موبایلەکەی خستە سەر باری بێدەنگی و گەڕایەوە بۆ خەوتن.

عەلی لەسەر ڕۆخی شۆستەکە دانیشت و نامەیەکی بۆ سەمیر نووسی کە لە سێ وشە پێک هاتبوون.

دوای کەمتر لە کاتژمێرێک سەمیر لەخەو هەستا... بەتەنیا نانی بەیانی خوارد، خۆی ئامادە کرد بۆ چوونە دەرەوە، پاشان موبایلی کردەوە... ناوی عەلی بینی:

- ئۆف ئێستا پێم دەڵێت: «ئۆتۆمبێلەکە کێشەی تێدایە»، نامەکەی کردەوە بینی تەنیا سێ وشەیە:

- خودا تۆڵەت لێ بکاتەوە!

سەمیر شۆک بوو! ئەوە یەکەم جاربوو کەسێک بەو شێوەیە دوعای لێ بکات... یەکسەر پەیوەندی بە عەلیەوە کرد، بەڵام عەلی پەیوەندیەکەی دادەخست و وەڵامی نەدەدایەوە.

عەلی بڕیاری دابوو کارەکەی بسپێرێت بە خودا و دوعا لە سەمیر بکات، داوای هیچی لێ نەکات!

سەمیر بۆ جاری دووەم و سێیەم و چوارەم پەیوەندی کردەوە، بەڵام عەلی وەڵامی نەدایەوە.

ئایا سەمیر دەترسا لە خراپەکانی و سزای ستەم لە ڕۆژی دواییدا؟ نا هەموو ئەوە بە خەیاڵیدا نەدەهات! ئەو لەوە دەترسا خودا لە چاوپێکەوتنەکەی سبەینێی کە لەگەڵ ئەبو عەزامە سەرکەوتووی نەکات، بۆیە بیری کردەوە عەلی بە هەندێک پارە ڕازی بکات. بەڵام عەلی هەرگیز وەڵامی نەدایەوە.

سەمیر هەوڵیدا هەستکردن بە تاوان لەکۆڵ خۆی بکاتەوە: «نایەوێت وەڵام بداتەوە، چیم پێ دەکرێت لەوە زیاتر؟ من لە کەسانی تر چاکترم... هی وا هەیە فێڵی ڕوون لە کڕیاران دەکات. هەموو کەسێک لە بازرگانی ئۆتۆمبێل فێڵ دەکات، ئەوەی دەیکڕێت پێویستە پێشبینی ئەوە بکات و خەرجی هەندێک چاککردنەوە بگرێتە ئەستۆ، ئاوا نەبێت کەس قازانجێکی وا ناکات»...

ترسی سەمیر کەمی کرد... دیسانەوە لە نامەکەی ڕوانی... ناڕەحەت بوو... هەوڵیدا پەیوەندی بە عەلیەوە بکات... عەلی وەڵامی نەدایەوە. سەمیر لە نەفسی خۆیدا بیری دەکردەوە: «ئەسڵەن دەکرێت ئۆتۆمبێلەکە سێ جار بەهۆی خراپی چاککردنەوەی هیشامەوە تێکچووبێت؟! پێم وا نییە... یان... لەوانەیە... خۆزگە لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی باش چاکم بکردایەتەوە بۆ ئەوەی هیچ ئەگەرێک نەمێنێتەوە... هەرچۆنێک بێت، هەوڵی پەیوەندی کردنمدا و ئەوەی لەسەرم بوو کردم»...

پاشان سەمیر بڕیاری دا بابەتەکە لەبیر خۆی بباتەوە...

ئـەو ڕۆژەی لـەدەرەوەی ماڵـەوە بەسـەر بـرد، وەکـو هەمـوو جارێک درەنگ گەڕایـەوە ماڵـەوە، بـە دەم بیرکردنـەوە لـە چاوپێکەوتنـە مەزنەکـەی لەگـەڵ ئەبـو عـەزام و زاهیـری سکرتێری -کـە لـە ڕۆژی دواتـر دەیکـەن-، خـەوی لـێ کـەوت.

لەم چاوپێکەوتنەدا چی ڕوویدا؟

ئـەی ئـەو ڕووداوە گرنگـە چییـە کـە لـە کاتـی ئـەم چاوپێکەوتنـە ڕوو دەدات بـەڵام لـە شـوێنێکی تـر؟!

با بەردەوام بین.

***



# ٦

## عوزرم هەیە

ڕۆژی هەینی سەمیر بە دەنگی ئاگاکارەکە بۆ نوێژی بەیانی لەخەو هەستا... دەستنوێژی گرت و دوای چەندین مانگ بۆ یەکەمجار بەڕێ کەوت بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی لە مزگەوت بکات... بەڵکوو خودا لە چاوپێکەوتنەکەدا سەرکەوتووی بکات... وەکو قەرەبوو کردنەوەیەکیش بێت بۆ ئەو نوێژی هەینییەی ئەمڕۆ لە دەستی دەچێت!

لە نوێژدا، بەدەم ڕاوەستانی لەبەردەم خودادا، سەمیر بیری لەوە دەکردەوە کە لە چاوپێکەوتنەکەی مامۆستا چی بڵێت، بە چ شێوازێک توانستەکانی پیشان بدات! لەم بیر ڕۆیشتنەی بە ئاگا نەهاتەوە هەتا گەیشتە ڕکاتی دووەم، پێشنوێژەکە سورەتی (الإنسان) ی دەخوێندەوە، بە دیاریکراوی ئەو دەمەی دوو جار فەرمایشتی خودای دووبارە کردەوە ﴿إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴾ واتە: ئەو بێ باوەڕانە حەزیان لە ژیانی دونیای تەمەن فانییە، کە زۆر بە خێرایی تێدەپەڕێت، ڕۆژێکی زۆر گران و سەخت و سەنگین پشتگوێ دەخەن و هیچ کارێکی بۆ ناکەن و بڕوایان پێی نییە...

کاتێک پێشنوێژەکە دووبارەی کردەوە، سەمیر هەستی کرد ئەوە پەیامێکی ئاڕاستەکراوە بۆ ئەو... چونکە ئەو وایە: دونیای

خۆش دەوێت و بیرکردنـەوەی لـە ڕۆژی دژواری پەسـلان پشتگوێ خسـتووە!

لـە دڵی خۆیدا وتـی: «وا دیارە زۆر بە دونیاوە پەیوەست بووم.. بـەڵام عـوزرم هەیـە، پێش ئـەوەی سـەرکەوتووبم و خـۆم بسـەلمێنم ناتوانـم سـەرنج بدەمـە هیـچ شـتێک، بەرگـە ناگـرم پێـم بگوترێت شکستخواردوویەکی گەمژە و کەمتربـم لـە خوشک و براکانم! ئەگـەر چاوپێکەوتنەکـەم لەگـەڵ ئەبـو عـەزام سـەرکەوتوو بـوو و بازێکـی گەورەمـدا، ئـەوا دەروونـم ئـارام دەبێتـەوە و کاتـی زیاتـر دادەنێـم بـۆ بیرکردنـەوە لـە ئایینەکـەم. چونکـە کاروبـاری دونیـا دواخسـتن قبـوڵ نـاکات، بـەڵام مافی خـودا دەکرێت کاتێکی تـر بیـری لـێ بکەیتـەوە!»

لـەدوای نوێـژی بەیانـی کەمێـک قورئانـی خوێنـدەوە... لـە کاتـی گەڕانـەوەی لـە مزگـەوت لـە لەفـە فرۆشـێک لایـدا و هەندێـک فەلافـل و نۆکـی کـڕی، بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ دایکیـدا نانـی بەیانـی بخـوات، کـە چەندیـن هەفتەیـە نانـی بەیانـی لەگـەڵ نەخـواردووە...

سـەمیر گەڕایـەوە ماڵـەوە، دای لـە دەرگاکـەی دایکـی، وەڵامـی نەدایـەوە... دەرگای کـردەوە... لەژوورەکـەی نەبـوو، چـووە ژوورەکـەی ئەمجـەد... ئەمجەدیـش لـە ژوورەکـەی نەبـوو.

کـەس لەماڵـەوە نەبـوو!: «لەوانەیـە شـەوی ڕابـردوو لـە مـاڵ نەبووبـن، لەکوێ؟ لەوانەیـە لـە ماڵی خاڵـم بووبێت وەک چـۆن مـاوە مـاوە دایکم وا دەکات. بەداخـەوە! دەمویست دایکم نانـی بەیانیـم لەگەڵ بخـوات و لێـم ڕازی ببێـت»...

سەمیر بە تەنیا نانی بەیانی خوارد.

سـەمیر بۆچـی ویسـتی دایکی لێی ڕازی بێت؟ لەبـەر ئـەوەی خـودا لێی ڕازی بێت، پاشـانیش ئەبـو عـەزام لێی ڕازی ببێت و سـەرسـامی بێت و ڕازی بێت بـە هاوبەشـی کردنـی لـە پێشـانگای ئۆتۆمبێلدا...

سـەمیر نانەکـەی خـوارد و دەسـتی کـرد بـە ئامادەکردنـی ئـەو قسـانەی بۆ ئەبو عەزامی دەکات و چۆن ڕازی دەکات بە توانسـتەکانی سـەبارەت بـە بازرگانی ئۆتۆمبێل، پاشـان دەسـتی کـرد بـە بیرکردنـەوە لەکویَ پیَشـانگا دەکەنـەوە، مانگانـە چەنـدە قازانـج دەکات؟ دواتـر دڵخوازتریـن پۆشـاکی خـۆی لەبەرکـرد، بـە گرانبەهاتریـن بـۆن خـۆی بۆنخـۆش کـرد، دەمێکیـش بـۆ خۆجوانکـردن لـە پێـش ئاوێنـە وەسـتا... دواتـر چـووە دەرەوە بـۆ چاوپێکەوتنەکـە، لـە ڕێگاکەیـدا لـە فرۆشتگایەکی شیرینی لایدا بـۆ ئـەوەی هەندێک شـیرینی شـاهانە بۆ خاوەنـی میوانداریيەکـە - زاهیـر- بکڕێـت.

گەیشـتە ماڵـی زاهیـر... لـە زەنگـی ماڵەکەیـدا و دڵـی دەسـتی بـە خورپـە خـورپ کـرد، لـە ترسـی ئـەوەی لـە کاتـی چاوپێکەوتنەکـەدا هەڵەیـەک بـکات... زاهیـر پێشـوازی لێکـرد و پێکـەوە چوونـە نـاو باخچەکـە، دانیشـتنەکە لەنزیـک مەلەوانگەکەبـوو، لـەدەوری مێزێکـی بازنەیـی گـەورەدا. ئامادەبـووان: ئەبـو عـەزام پیاوێکـی قەڵـەوی چـل و حـەوت سـاڵ، کەچەڵێکـە تەنهـا پشـتی سـەری مـووی پـێ مـاوە، نێرگەلەیەکـی بەدەسـتەوەبوو، هاوسـەرەکەی و حەنانـی کچیشـی لەگەڵبـوو، هاوسـەری زاهیریـش جگەرەیەکـی بەدەسـتەوە گرتبـوو، زیـادی کـوڕی زاهیریـش، کوڕێکـی تەمـەن حەڤـدە سـاڵە... دەنگـی پێکەنیـن لـە هەموویانـەوە بـەرز دەبوویـەوە.

سـەمیر بـەم کەشـانە ڕانەهاتبـوو، بـەڵام مکوڕبـوو لـەوەی سەرسـوڕمانی پێـوە دیـار نەبێـت. بۆیـە لەگەڵیـان دانیشـت، زاهیـر یەکە بـە یەکەیانـی پـێ ناسـاند، پاشـانیش بابەتـی جۆراوجـۆر کرایـەوە و سـەمیریش بابەتـی لەگـەڵ دەکردنـەوە، چونکـە هەوڵـی دەدا قسـەزانی و ڕۆشـنبیری خـۆی دەرخـات. مامۆسـتا زۆربـەی کاتـەکان لێـی دەڕوانـی و کـەم دەدوا.

دوای چارەکێک لە گەیشتنی سەمیر، پەیوەندییەکی تەلەفونی بۆ هات، سەعیدی برای بوو، سەمیر یەکسەر پەیوەندییەکەی داخستەوە، بۆ ئەوەی ئەو کاتە «بەنرخەی» لەگەڵ مامۆستا لە دەست نەچێت، سەعید بۆ جاری دووەم و سێیەم پەیوەندی کردەوە و سەمیریش هەر بە شەرمەزارییەوە دایدەخست، دواتر موبایلەکەی خستە باری بێدەنگی... پێی سەیر بوو:

- سەعید چی دەوێت؟ بۆچی پێداگری دەکات لە پەیوەندی کردن، ئەو هەر بە دەگمەن پەیوەندیم پێوە دەکات!

دوای ماوەیەک، نانی نیوەڕۆیەکی شاهانە دانرا، سەمیر سووربوو لەسەر ئەوەی بە چەتاڵ و چەقۆ نان بخوات و زۆر نەخوات -سەرەڕای ئەوەی حەزی دەکرد زۆر بخوات-، بۆ ئەوەی مامۆستا وێنەدانەوەیەکی لێ وەر بگرێت و پێی وابێت کوڕێکی نەفس بەرزە.

لەو ماوەیەی مامۆستا ڕۆیشت بۆ دەست شۆردن، سەمیر موبایلەکەی دەرهێنا بۆ ئەوەی بزانێت بۆچی سەعید پەیوەندی کردووە، دوو پەیوەندی وەڵام نەدراوە و نامەیەکی لە سەعیدەوە بینی، «دایکم لە حاڵەتێکی دژواردایە، پەلە بکە و وەرە بۆ چارەخانەی ڕەحمە!»

سەمیر شۆک بوو! بارودۆخی دژوار! کەوایە لەسەریەتی یەکسەر بڕوات، بەڵام چۆن بڕوات؟ ساتەکانی داهاتوو لە ڕێککەوتن لەگەڵ مامۆستا یەکلا کەرەوەن، چونکە ئەوان هێشتا باسی بابەتی پشتگیری ماددی لەلایەن مامۆستاوە بۆ سەمیر و کردنەوەی پێشانگای ئۆتۆمبێلیان نەکردووە، بەڵکوو تەنیا یەکترناسین بوو، مامۆستاش کەسایەتی ئەوی دەپشکنی.

سەمیر بیری لەوە کردەوە بارودۆخی خراپی دایکی بە زاهیر و مامۆستا بڵێت، بەڵام ترسا ئەوان ڕەشبین بن سەبارەت

بـە پێکدادانـی کاتـی ئـەم ڕووداوە و ئامـادەکاری بـۆ ڕێککەوتنەکـە! هاوکاتیـش مامۆسـتا لـە دوای ئـەم چاوپێکەوتنـە گەشـت دەکات بـۆ چیـن، بۆیـە گـەر ئێسـتا ڕێککەوتنەکـە نەکرێـت ئـەوا دوا دەخرێـت و ئەگـەری هەیـە مامۆسـتا ڕای بگۆڕێـت. سـەمیر دوودڵ و پەشـۆکاو بـوو، ویسـتی پەیوەنـدی بکات بـۆ سـەعیدی بـرای هەتـا دڵنیا بێتـەوە لـە بارودۆخـی دایکی، بـەڵام زاهیـر و مامۆسـتا هاتـن و چایـی هێنـرا.

ئامادەبـووان دانیشـتن، زیـادی کـوڕی زاهیریـش دەسـتی کـرد بـە باسـکردنی هەندێـک هەڵوێسـت و ڕووداوی پێکەنینـاوی یوتوبـەرە بەناوبانگـەکان، هەموویـان پـێ دەکەنیـن، سـەمیر دڵەڕاوکێکـەی دەشـاردەوە و خەنـدەی دەکـرد... دواتـر لەنـاکاودا، زاهیـر بابەتـی هاوبەشـی لەگـەڵ سـەمیر لەسـەر بازرگانـی ئۆتۆمبێـل کـردەوە، مامۆسـتاش بـە کورتـی وەڵامـی زاهیـری دایـەوە و وتـی:

- «بیرۆکەیەکی چاکە... لێگەڕێ بیر لە هەندێک شت بکەمەوە، ئەوسا لەکاتی چاوەڕێکردن لە فڕۆکەخانە وەڵامت دەدەمەوە»... دواتر مامۆستا بابەتەکەی گۆڕی و گەڕانەوە بۆ نوکتەکانی زیاد، سەمیر زانی لەو ساتەدا ڕێککەوتن لەسەر هیچ وردەکارییەک ناکرێت...

سەبارەت بە دایکی دڵەڕاوکێی زیادی دەکرد:

- لە سەر ئیزنتان، پێویستە بڕۆم.

زاهیر وتی:

- بۆ کوێ؟ کێکەکە وا لەڕێیە.

- بمبوورن سـەرقاڵیم هەیـە و پێویسـتە ئێسـتا بڕۆم، خۆشـحاڵ بووم بـە ناسـینتان.

زاهیر تا دەرگای دەرەوەی باخچەکە لەگەڵی ڕۆیشت:

- مامۆسـتا حـەز نـاکات ڕاسـتەوخۆ وەڵام بداتـەوە، بـەڵام پێـم وابـێ سـەرسـامی کەسـایەتیت بـوو، خـەم مەخـۆ، ڕازی دەکـەم.

- «ان شاءالله خێر دەبێت»... پەشۆکاوییەکەی بەرزبوویەوە و میزاجی گونجاو نەبوو بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ زاهیردا بکات، بەپەلە خواحافیزی لێکرد و بە ئۆتۆمبێلەکەی بەڕێکەوت بۆ چارەخانەی ڕەحمە.

سەمیر پەیوەندی بە سەعیدەوە کرد، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، چونکە چووبوو بۆ نوێژی هەینی لە مزگەوتی چارەخانەکە و موبایلەکەی لەسەر باری بێدەنگی دانابوو، پەیوەندی کرد بە ئەمجەدەوە ئەویش وەڵامی نەبوو، پەیوەندی کرد بۆ تالەی خوشکیەوە:

- تالە، ئیستا دایکم چۆنە؟

بە دەنگێکی نزم و لاواز و تێکەڵ بە گریانێکیی بەندکراوەوە وەڵامی دایەوە، چونکە لەپەنای دایکیدابوو...

- دایکم؟... دایکم وا گیان دەدات.

- (گیان دەدات؟) سەمیر پەشۆکا و ئارەقی نێوچاوانی دەتکا:

- لە کام ژوور؟ کام نهۆم؟

- لە چاودێری چڕە، تەواو، سەلامی خودات لێبێت.

سەمیر بەناو ئۆتۆمبێلەکان تێدەپەڕی تاکو گەیشتە نەخۆشخانە، بەخێرایی سەرکەوت بۆ ئەو نهۆمەی دایکی تێدابوو، لە هۆڵی چاوەڕێکردنەکە بینی کەسوکاری خوشک و براکانی و هاوسەر و منداڵەکانی لەوێن، هەندێکیان دەگرین! چی ڕوویداوە؟ بەخێرایی چووە ژووری چاودێری چڕ، (سەعید، عاسم، تالە و ئەمجەد) هەموویان لەدەوری قەرەوێڵەی دایکیان کۆ بوونەتەوە...

- کوا دایکم؟

کەس وەڵامی نەدایەوە.

دیسانەوە سەیری قەرەوێڵەکەی کرد، بینی وا بە سەرچەفێکی سپی داپۆشراوە.

- کەمێک پێش ئێستا وەفاتی کرد!

خوشک و براکانی شۆک بووبوون! پێشبینییان نەکردبوو ئاوا مردنەکەی نزیک بێت.

سەعید، لێوەکانی گەستبوو، بە بێدەنگی دەگریا، خەمبارییەکەی تێکەڵ بوو بە پەشیمانی، چونکە لەم هەفتانەی دواییدا سەرقاڵبوو بە پرۆژەی گەورەوە، بۆیە تەنیا بە تەلەفونکردن ئاگاداری دایکی دەبوو، بێ ئەوەی سەردانی بکات.

تالە، سەری بەرزکردەوە و کەمێک لە سەمیری ڕوانی، چاوەکانی سور هەڵگەڕابوون، فرمێسکەکانی بەخێرایی دەهاتنە خوار، هەناسە بڕکێ و گریانی تێکەڵ کردبوو... دیسانەوە بەدەم گریانەوە سەری نەوی کردەوە... خەریک بوو تازە لەو کۆرسەی بۆ پەروەردەی دەروونی دەیدا تەواو دەبوو، وای دانابوو لە ڕۆژانی داهاتوو لەگەڵ مێردەکەی لە ماڵی دایکی بمێنێتەوە و مێردەکەی ئاگای لە منداڵەکان بێت.

عاسم، دوو بلیتی عومرەکەی خۆی و دایکی لە گیرفاندابوو، هێنابووی بۆ ئەوەی بڵێت: (خۆت کۆ بکەرەوە، کاتی گەشتەکە دوو بەیانییە) نەی دەزانی کاتی گەشتی دایکی بۆ ژیانەکەی تر نزیکترە.

ئەمجەد، قاچەکانی بەرگەی نەدەگرتن، ئەو لەسەر زەوی دانیشتبوو، سەری خستبوو نێوان چۆکەکانی و وەک منداڵ دەگریا! لەم دواییە دایکی بووبووە ژیانی، لە دوای ئەوەی لەخوێندن دابڕا و کاتەکانی تایبەت کرد بە گرنگی پێدانی و بردنی بۆ نەخۆشخانە و نازهەڵگرتن و خوێندنی قورئان لەسەری، دڵخۆشکردنی بە دەمەتەقێ کردن سەبارەت بە یادگارییەکانی ڕابردوو و یادگارییەکانی لەگەڵ باوکی، دایکی لەم ڕۆژانەی دوایی بۆ ئەو بوو، قەرەبووی ساڵانی ڕابردووی بۆ کردەوە، هیچ شتێک نەمابوویەوە و دڵی دایکی خۆش

بکات و نەیکردبێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە تەماشاکردنی ڕازیبوون تێر نەبووبوو کە لە چاوەکانی دایکیدا دەیخوێندەوە، لە نزاکانی شەو و ڕۆژی تێر نەبووبوو، لە پێکەنینەکانی -سەرەڕای نەخۆشییەکەشی- کاتێک گاڵتەی لەگەڵ دەکرد و دێڕی هۆنراوەی پێکەنیناوی بۆ دروست دەکرد بۆ ئەوەی پێ بکەنێت.

هەمووان شۆکبوونە... پێشبینی ئەوەیان نەکردبوو مردن ئاوا بەخێرایی دایکیان لێ ببات...

ئەی چی سەبارەت بە سەمیری برادەرمان؟ نەک تەنیا لەم ڕۆژانەی ڕابردوودا، بەڵکو لە ساڵانی ڕابردوودا، بە ڕووکەش لە هەمووان نزیکتربوو لە دایکیان، چونکە ژوورەکەی بەتەواوی لەپەنای ژووری دایکی بوو، سیسەمەکەی ئەو و سیسەمەکەی دایکی تەنیا دیوارێک لێکیانی جیا دەکردەوە، تەنانەت هەندێک جار دەبوایە سەرینەکەی بخستایەتە سەر سەری بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوام بێت لە خەوتن، لەو دەمەی دایکی دوای نوێژی بەیانی قورئانی دەخوێند و دەنگی بەرز دەکردەوە، بەڵام لە ڕاستیدا لە هەموو براکانی دوورتربوو لە دایکی! لە سەعید و تالەش کە بە درێژایی دەیان کیلۆمەتر لەدووری دایکیان دەژییان!

سەمیر بە ترسەوە لە قەرەوێلەکەی دایکی نزیک بووەیەوە، ڕووخساری دایکی دەر خست و ماچێکی کرد، فرمێسکێک لە چاوەکانی هاتە خوارەوە... سڕییەوە... بەڵام هەستێکی سەیری بۆ دروست بوو، هەستی دەکرد بەربەستێک هەیە لەنێوان خۆی و دڵیدا!

دایکیان لە کۆنەوە وەسیەتی کردبوو: ناشتنەکەی دوا نەخەن. هەر وایان کرد، شۆردیان و کفنیان کرد و نوێژیان لەسەر کرد و پێش خۆرئاوابوون بەخاکیان سپارد و هەواڵەکە لە نێوان ناسیاوەکان

بڵاو بوویەوە و هاتن بۆ پرسەکەی، ئەوماڵەی ئێستا ناوی بووەتە:
«ماڵی دایک و باوکمان خوا لێیان خۆش بێت».

لەو دەمەی سەمیر پێشوازی لە خەڵکی دەکرد، پەیوەندییەکی لە زاهیرەوە بۆ هات، سەمیر پەشۆکا، ئایا بۆ وەڵامدانەوە بچێتە لایەکی ماڵەکە؟ نەخێر ئەوە پرسەی دایکییەتی! پەیوەندیەکەی پچڕاند و وەڵامی نەدایەوە، زاهیر جارێکی تر پەیوەندی کرد، سەمیر ئیحراج بوو و چووە لایەک و وەڵامی داوە:

- سلام علیکم...
- علیکم السلام، چی بووە هاوڕێ گیان؟ هەر لەسەرەتاوە خۆت گران دەکەیت بەسەرمان؟ ئەوەندەت بەسە پەیوەندیت نەکرد بۆ ئەوەی بزانیت وەڵامی مامۆستا چییە، پەیوەندیشمان بەسەر دادەخەی؟!

سەمیر دوودڵ بوو لەوەی پێی ڕابگەیەنێت کە لە پرسەی دایکیەتی:

بۆ ئەوەی زاهیر و مامۆستا ڕەشبین نەبن بەرامبەری:

- ببورە تۆزێک سەرقاڵ بووم، بێگومان بۆچوونی مامۆستام لەلا گرنگە.
- مژدەبێت مامە! دایکت نزای بۆ کردووی! مامۆستا لە فرۆکەخانەوە پەیوەندی پێوە کردم، ڕازییە گرێبەستی هاوبەشێتییەکە بکەین، بەیانی کاتژمێر دە وەرە بۆ لام، بۆ ئەوەی لەسەر وردەکارییەکان ڕێک بکەوین و پاشان ڕاستەوخۆ بەڕێ بکەوین بۆ بەکرێ گرتنی پێشانگایەک.

سەمیر لە دڵی خۆیدا وتی: «بەیانی؟ دایکم هێشتا خۆڵی سەر گۆڕەکەی وشک نەبوەتەوە... لەوانەیە گونجاو نەبێ، بەڵام بە هەر حاڵێک بێت خەڵک ئێوارەکەی دێن، بەیانییەکەی هیچم نییە بیکەم، کەوایە بۆ نەچم بۆ لای زاهیر؟»

«بەیانییەکەی هیچ نییە بیکەم!» سەمیر بیری لەوە نەکردەوە وەفاتی دایکی بکاتە هەلێک بۆ بیرکردنەوە و بەخۆداچوونەوە... هاوکات، کەمێک لە پرسەکە دوورکەوتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت گرنگی پێدان و دڵخۆشی بۆ زاهیر بەدیار بخات، ڕازیش بوو بە یەکتربینیەکەی سبەینێ.

دوای چەندین کاتژمێر، هەمووان ڕۆیشتن و تەنیا ئەمجەد و سەمیر لە ماڵەوە مانەوە، لەدوای وەفاتی خاوەن ژوورەکەی نێوانیان... سەمیر لەسەر سیسەمەکەی پاڵکەوت. هەرکەسێک لەو دەمە بیبینیایە، وای دەزانی شێتە! بیری لە دەستکەوتە گەورەکە دەکردەوە بەوەی مامۆستای ڕازیکردووە، بەدەم خۆیەوە پێدەکەنی... دواتر بیری دەهاتەوە چەند کاتژمێرێکە دایکی وەفاتی کردوووە، ماسولکەکانی ڕوخساری ناچار دەکرد گرژ ببن و تۆزێک برۆکانی دەدا بەیەکدا... بەڵام هەر زۆری نەدەبرد بیری لە ڕۆژی دواتر دەکردەوە، لەو پێشانگایەی ئەو دەبێتە بەڕێوەبەری و ئەو ئۆتۆمبێلانەی نیازی هەیە بیکرێت، دیسانەوە ماسولکەکانی ڕوخساری شل دەبوونەوە و بێ ئەوەی هەستی پێ بکات خەندەی دەکرد! دواتر دەنگە گریاناوی و بە هەنسک و خەماوییەکەی ئەمجەد بەدەم خوێندنی قورئانەوە خەیاڵەکانی دەپچڕاند، ئەوەی بە بیر خۆی دەهێنایەوە کە پێویستە خەمبار بێت و شتێک لە گرژ و مۆنی دروست بکات لەسەر ڕوخساری! لەمانەدابوو خەوی لێکەوت!

لە بەیانی ڕۆژی دواتردا، ئەمجەد بۆ نوێژی بەیانی هەڵیساند، هەستا و لەگەڵ براکەی چووە مزگەوت، لە سوجدەدا نزای دەکرد خودا لە چاوپێکەوتنەی لەگەڵ زاهیر سەرکەوتووی بکات، لەکاتێکدا لەپاڵیدا ئەمجەد نزای لێخۆشبوون و ڕەحمەت و چوونە بەهەشتی بۆ دایکی دەکرد! سەمیر لە کۆتا سوجدەدا ئاگادار بوو کە براکەی

بەدەم گریانەوە نزا دەکات، ئەویش دایکی بەبیر هاتەوە و بەپەلە نزایەکی بۆ کرد، پاشان گەڕایەوە ماڵەوە و لە ماندووییدا خەوی لێ کەوت چونکە دوێنێ شەو هەتا درەنگێک بێداربوو.

ئەو ڕۆژەی باوکی سەمیر وەفاتی کرد، تا ماوەیەک کاریگەری هەبوو لەسەری، سەردانی مزگەوتی دەکرد و قورئانی دەخوێند، بەڵام ئەمجارە، گێژەڵوکەی ژیان دەمێک بوو ڕایکێشابوو، بۆیە نەوەستا بۆ لێپێچینەوەی لە خۆی...

بە پەیوەندییەکی زاهیر خەبەری بوویەوە:

- سەمیر لەکوێیت؟

- کاتژمێر چەندە؟ ئای! نۆ و نیو؟! ببورە، ئێستا ئامادە دەبم و دێم بۆ لات.

سەمیر بە پەشۆکاوییەوە بەڕێکەوت:

- لەوانەیە وا تێبگەن ئیهمالم... خەواڵووم و هەر لەیەکەم ڕۆژەوە پابەند نابم بە بەڵێنەکانمەوە.

گەیشت... زاهیر گلەیی نەکرد، لە خوای دەویست سەمیر لە دڵەڕاوکێی بیرۆکەی دانانی پێشانگاکە کە (ئەبو عەزام) داینـاوە ڕزگاری بکات.

گرێبەستەکەیان واژۆ کرد: ٥٠ دەفتەر دۆلار لە مامۆستاوە بۆ بەکرێگرتنی پێشانگا و کڕینی ئۆتۆمبێلی دەستی دوو، قازانجەکان: ٤٠٪ بۆ سەمیر، ٥٠٪ بۆ ئەبو عەزام، ١٠٪بۆ زاهیر، کە پێویستە لەسەری لە بەڕێوەبردنی پێشانگاکەدا یارمەتی بدات. دواتر بەڕێکەوتن، عەسری ئەو ڕۆژە تەواو نەبووبوو شوێنێکی گونجاویان بۆ پێشانگا دۆزییەوە و سەمیر بە کرێی گرت.

سەمیر بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە... لەکۆتاییدا... ئەو بازدانە گەورەیەی چاوەڕێی دەکرد بەدی هات، پێشوازی لە خەڵکی

دەکرد بەدەم کۆکردنەوە و لێکدان و ژماردن لە مێشکی خۆی کە چۆن دەست بە پێشانگاکەی بکات... تاو نا تاوێکیش بە بیری خۆی دەهێناوە کە... لە پرسەی دایکییەتی!

لە دوای ڕۆیشتنی پرسەگێڕەکان، سەعید و عاسم بووە دەمەقالێیان و دەنگیان بەرز بوویەوە!

دەبێ لەسەر چی بێت؟

دوای چەند ڕۆژێک بۆچی سەعیدی برای پێداگربوو لەسەر ئەوەی، سەمیر بێت و وەسیەتی دایکیان بۆ بخوێنێتەوە؟

ئەی لە وەسیەتەکەدا چی نوسرابوو؟

با بەردەوام بین.

***



# ٧

# پارچە کاغەزەکەی دایکم

لـە ڕۆژی دووەمـی پرسـەی دایکـی سـەعیددا، دوای ڕۆیشـتنی پرسـەگێڕان، سـەمیر گوێی لێبوو سـەعید و عاسمی برای دەمەقاڵێیانە، دەبێت لەسـەر چی بێت؟

نیـوەڕۆی ئـەو ڕۆژە، ئەمجـەد ئـەو بـڕە پارەیـەی کـە هـی دایکی بوو، دای بە سـەعید بۆ ئەوەی بەپێی شـەرع دابەش بکرێت، ١٥ملیۆن دیناربوو، لەگەڵ ئاڵتونەکانیدا:

- چۆن دایکم ئەم هەموو پارەیەی ماوە؟
- بیرت چوو بەشی خۆی لە زەویەکە بە (باسم) فرۆشت؟
- نـا لەبیـرم نەکـردووە، بـەڵام ئـەوەی لـە چارەسـەرەکانیدا خەرجـی کـرد..

ئەمجەد بێدەنگ بوو.

- ئەمجەد کێ خەرجی دەرمانەکانی دەکرد؟
- من و دایکم یەکین.
- یانی تۆ لە پارەی خۆت خەرجیت دەکرد؟
- ممم، شتێک نییە شایەنی باس کردن بێت.

عاسم گوێی لـە مشتومڕەکە بوو، ئەویش چووە ناویـان و لەگـەڵ سـەعید لێپێچینەوەیەکیـان لـە ئەمجـەد کـرد، بۆ ئـەوەی بزانـن خەرجـی چارەسـەرەکانی دایکیـان چەنـد بـووە.

- نەم ژماردووە.

سەعید وتی:

- بڕۆ بیژمێرە.

- باشە دوو ڕۆژی تر.

- بەڵکو ئێستا.

- کاتی دەوێت.

- ئێستا بڕۆ و بیژمێرە، گەر میوان هات خۆمان پێشوازیان لێ دەکەین.

دوای ڕۆیشتنی میوانەکان، سەعید گەڕایەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەمجەد، دوور لە عاسم...

بەڵام عاسم تێبینێ کرد و دیسانەوە چووەوە ناویان.

- نزیکەی پێنج ملیۆن دینار.

- ئەوە هەموویەتی بە دەرمانەکانی دەرەوەی نەخۆشخانەشەوە؟

- نا ئەوە شایەنی نییە.

دەنگی سەعید بەرز بووەوە و بە متمانەوە سەیری کرد:

- ئەوەندە بەس بوو کە بارودۆخە خراپەکەی دایکمت پێ ڕانەگەیاندم و ڕێگات دام بە کارەکانم بخافڵێم و ئاگاداری نەبم.

- پێشبینیم نەدەکرد شتەکان بەو ڕادەیە بەرەوپێش بچێت

- عاسم خۆی هەڵقورتاند:

- ئەوە قەدەری خودابوو و خوداش هەرچییەکی بوێت دەیکات. گرنگ ئەوەیە ئێستا پێمان بڵێیت خەرجی دەرمانەکان چەندە؟...

- نزیکەی ملیۆنێک... لەو دەمەدا سەعید و عاسم بووە دەمەقاڵێیان، هەریەک لەوان دەیەویست خەرجییەکانی چارەسەری دایکی بگرێتە ئەستۆ بەوەی کە برەکەی بە ئەمجەد بدەن، بۆ ئەوەی ئەوە ببێتە چاکەیەک بۆیان بەرانبەر دایکیان لە دوای مردنی.

عاسم کە هێشتا بلیتەکانی عومرەی لە گیرفانی هەڵگرتبوو دەم دەمە سەیری دەکرد، بە خەمبارییەوە لە سەعیدی دەڕوانی:

- بەیانی کاتی ئەوەبوو لەگەڵ دایکم بچین بۆ عومرە! موڕاعاتی هەستەکانم بکە، ئەم دەرفەتەم پێ ببەخشە.

سەعید بە هەڵچوون و بە دەنگی بەرزەوە وەڵامی دایەوە، بۆ ئەوەی عاسمی گوێ گران بیبیستێت:

- «عاسم... تکات لێ دەکەم... تۆ ئاگات لە هەستەکانم بێت... بەم دواییانە زۆر لە دایکم بێ ئاگا بووم، بۆشاییەکی گەورەی لە ژیانمدا دروست کردووە...» فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە.

عاسم ناچاربوو بیداتە دەست براگەورەکەی، ئەمجەدیش نەیتوانی پارەی براکەی ڕەت بکاتەوە.

هەموو ئەوانە لەپێش چاوی سەمیر ڕوویدا و بە هەڵوێستەکە سەرسام بوو، بەڵام بەخەیاڵیدا نەهات بەشێک بێت لەو هەڵوێستە! چونکە بیری لەوە دەکردەوە لە ڕۆژی دواتر پێشانگا نوێیەکەی ئامادە بکات.

چوار ڕۆژ بەسەر وەفاتی دایکیان تێپەڕی، لەو دەمەی سەمیر لە لوتکەی سەرقاڵ بوونی بوو بە ئامادەکردنی پێشانگاکەی، پەیوەندییەکی لە سەعیدی برایەوە بۆ هات:

- سەمیر، وەسێتێکمان دۆزیوەتەوە دایکمان نوسیویەتی، لە ناو دۆلابەکەی لای سیسەمەکەی، ئەمرۆ سەرێکم لێ بدە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە.

سەمیر وتی:

- کاتێک تەواو دەبیت، لە ماڵی دایکم بۆم بەجێ بهێڵە...

- نەخێر، دەمەوێت لەلام بمێنێتەوە.

- باشە سەعید، وێنەیەکیم بۆ بگرە و بە موبایل بۆم بنێرە، زۆر سەرقاڵم، هەتا درەنگانێکی شەو نایەمەوە.

سەعید بە توڕەییەوە وتی:

- «سەمیر، پێت دەڵێم وەسیەتی دایکت». گەر دوا کەوتی وەرە بۆ ماڵی ئێمە.

سەمیر وتی:

- ئایا شتێکی تێدایە تایبەت بێت بەمنەوە؟

سەعید لە توڕەییدا بێدەنگ بوو، سەمیریش تێگەشت و وتی:

- باشە باش، ئەمشەو دێم بۆلات.

دایکیان هەستی بەوە کردبوو ئەجەلی نزیکە، بۆیە دوو ڕۆژ پێش وەفاتکردنی بە دەستوخەتێک کە شوێنەوارێ ماندوویێتی پێوە دیاربوو وەسیەتەکەی نووسی بوو.

سەمیر شەو گەیشتە ماڵی براکەی... ئەو دەمەی لە دیوەخانەکە دانیشتبوون، سەعید وەسیەتەکەی لەناو زەرفێک دەرهێنا و بە گرژ و مۆنییەوە دای بە سەمیر. سەمیریش دەستی بە خوێندنەوەی کرد:

(منداڵە خۆشەویستەکانم، سەعید، عاسم، تالە، ئەمجەد، هەست دەکەم دوا ڕۆژەکانمە و منیش دەگەم بە باوکتان «ڕەحمەتی لێبێت». خۆشەویستەکانم، ویستم پێتان بڵێم: من لێتان ڕازیم و لەدوای خۆم ترسم نییە لەسەرتان، چونکە ئێوە بە ئیزنی خودا وەک چۆن باوکتان پەروەردەی کردن، گوێڕایەڵی خودا دەکەن. لە هاوسەر و منداڵەکانتان ڕازیم، هەموویانم خۆش ویست و خۆشیان ویستم. ئەوەش لەبیر ناکەم کە چۆن ڕاتان هێنان لە وەی ئەحواڵی من بپرسن و پێشبڕکێ بکەن بۆ ڕازی کردنم، بۆیە لەخودا داواکارم چاکەی منداڵەکانتان پێ ببەخشێت و هاوسەری چاکەکار بە منداڵەکانتان ببەخشێت، هەر وەک چۆن هاوسەرەکانتان چاک بوون لەگەڵ من.

ئازیزەکانم، تکاتان لێ دەکەم زۆر دڵتەنگ مەبن بۆم، کە مردم زۆر مەگرین بۆم... بەرگە ناگرم خەیاڵی ئەوە بکەم کە ئێوە دەگرین، ناشمەوێ ببمە هۆکاری خەمباریتان. ئەوەندە بەسە کە لێتان ڕازیم، ئێوە بە سۆز و وەفا دەورتان دابووم. کە ئەم وەسیەتە دەنووسم، سەعید مستیلەکەی تۆم لەدەستە، تالە چاکەتەکەی تۆش وا گەرمم دەکاتەوە، عاسم لە تەنیشت سیسەمەکەم ئەو جانتای عومرەیەم داناوە کە بۆ منت ئامادە کردووە، ئەمجەد لەسەر دۆلابەکەش باوەشە گوڵەباخە ناوازەکەتم داناوە، گوڵەکانی وشکبوون کەچی ئەو خۆشەویستییەی دەری دەبڕێت وشک نەبووە. هەرچەندە لێم دوور بن، هەناسەکانتان لەگەڵ منە.

سەعید ئازیزی من، دەزانم بەم دواییانە تۆ بە پڕۆژە نوێیەکەت سەرقاڵ بوویت، منیش چاوپۆشیت لێ دەکەم، ئاگات لە خوشک و براکانت بێت، چونکە تۆ براگەورەیانیت.

تالە، هاوسەرەکەت پیاوێکی بەڕێزە، بەرگەی توڕەییەکەی بگرە، یەک و دووی لەگەڵ مەکە و کەمتەرخەمی مەکە لە مافەکانیدا.

عاسم، ئەی هاوڕێکەی منداڵیم، خەمبار مەبە گەر نەمتوانی لەگەڵت بچمە عومرە، هێشتا پەرۆشی و تامەزرۆی چاوەکانتم لە یادە بۆ گەشتەکەمان کە هەفتەی پێشوو سەردانت کردم، بە هەر حاڵێک بێت داوا لە خودا دەکەم پاداشتەکەیت بە تەواوی بۆ بنووسێت. دەزانم ماوەیەکە دەستت بە جگەرەکێشان کردووە، سەرەڕای ئەوەی لێت دەشاردمەوە. تکات لێ دەکەم ڕۆڵەکەم، لە ئیمڕۆوە وازی لێبێنە، تۆ کەسێکی باشیت و هەناسەکانت بە باشی بهێڵەوە، ئەوەت بیر بێت ئەوەی نەوەی ئادەم ئازار بدات فریشتەکانیش ئازار دەدات، وەک چۆن پەیامبەرمان(ﷺ) فەرموویەتی.

ئەمجەد دەزانم زۆر ماندووم کردویت، کوڕە ئازیزەکەم، دەزانم خوێندنەکەت کردە قوربانی بۆ ئەوەی گرنگی بە من بدەیت، بەڵام من لە قوڵایی دڵمەوە پێت دەڵێم: (بڕۆ، خودا لێت ڕازی بێت و سەرکەوتووت بکات و دەرووی خێرت لێ بکاتەوە، ڕێت ڕۆشن بکات لە هەر کوێیەک بیت).

کوڕەکانم وەسیەت دەکەم کە بزانن ئەمجەد چەندی خەرج کردووە لە چارەسەرەکانم و لێی نەگەڕێن لێتان بشارێتەوە، چونکە تێبینیم کردووە پارەکانم لەناو کەنتۆرەکە زۆر کەمی نەکردووە، بۆیە لەو پارەیەی بۆتانی جێ دەهێڵم و لەو بەشەی ماڵی باوکتان بەرەحمەت بێت قەرەبووی بکەنەوە.

بە نیسبەت برای پێنجەمتان، ئەو یەک ملیۆنی بۆ بازرگانییەکەی لێ قەرز کردم و بەڵێنیدا لە نزیکترین دەرفەتدا بیداتەوە، وادیارە ئەو نزیکترین دەرفەتە هێشتا نەهاتووە، بۆیە داوای لێ بکەنەوە، چونکە ئەوە مافی ئێوەیە لە دوای من، چونکە پاشگەز نەبوومەتەوە لەو مافەم. سەعید، تالە، عاسم، ئەمجەد... دەتان سپێرم بەو خودایەی هیچ ڕاسپێردراوێک لای ون نابێت. تەقوای خودا بکەنە دیدەی چاوەکانتان، ئاگاتان لەیەکتر و لە هاوسەر و منداڵەکانتان بێت، داوا لەخودا دەکەم هەموومان لەگەڵ باوکی ڕەحمەتیتان لە بەهەشت کۆ بکاتەوە.

ئەو دایکەی زۆر ئێوەی خۆش دەوێت: ئامینە).

سەمیر وەسیەتی دایکی خوێندەوە... لەسەر مێزەکە لەبەردەم سەعیدا داینا، جزدانەکەی لە گیرفانی دەرکرد و تیانوسی چەکێکی تیا دەر هێنا، چەکێکی یەک ملیۆنی نووسی و دەستی گرت بۆ ئەوەی سەعید لێی وەربگرێت...

- «هەر ئەوەندە لە وەسیەتەکە تێگەیشتیت؟»... چەکەکەی وەر نەگرت... سەمیریش لەسەر مێزەکە جێی هێشت و هەستا و لە ماڵی براکەی دەرچوو.

سەعید بانگی کرد:

- سەمیر، سەمیر!

بەڵام وەڵامی نەدایەوە!

سەعید هیوای دەخواست ئەم وەسیەتە سەرەتایەکی نوێ بێت بۆ سەمیر، پێشبینی ئەوەی دەکرد فرمێسکی پەشیمانی لە چاوەکانی براکەی ببینێت، ئەویش دڵی بداتەوە و هاوکاری بێت لە هەڵدانەوەی پەڕەیەکی نوێ... بۆیە پێداگر بوو سەمیر وەسیەتەکە لە پێشچاوی خۆی بخوێنێتەوە، بەڵام بەداخەوە هیچ کامێک لەمانە ڕووی نەدا...

سەعید ئەم هەڵوێستەی بەوەی دوێنێ بەراورد کرد، ئەو دەمەی بە دەنگێکی گریاناوییەوە وەسیەتەکەی دەخوێندەوە، بە ئامادەیی خوشک و براکانی و باسمی مێردی تالە، هەموویان فرمێسک لە چاویان دەباری، کاتێک وەسیەتەکە گەیشتە تالە، بەوەی ئارام بگرێت لەسەر مێردەکەی و بەرگەی تووڕەییەکەی بگرێت و کەمتەرخەمی نەکات لە مافەکانیدا، تالە سەری لەسەر سینگی باسم دانا و باسمیش باوەشی پێدا کرد و ماچی سەری کرد.

کاتێک وەسیەتەکەی دایکیان گەیشتە عاسم کە تەرکی جگەرە کێشان بکات، پاکەتی جگەرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بە دەستەکانی گوشی و فڕێیدا ناو سەبەتەی خۆڵەکەوە، دەستیشی لەسەر سەری دانا وەک بڵێت: «بەسەر سەر و سەرچاوم دایەگیان»، سەرەڕای ئەوەی نەیتوانی لەبەر گریان ئەوە بە زمان بڵێت.

سەمیر بە ئۆتۆمبێلەکەی بەڕێ کەوت بەرەو ماڵەوە... «بۆچی دایە؟ بۆچی بەم ڕادەیە شەرمەزارت کردم بەرانبەر خوشک و

براکانـم، دەتتوانـی لەنێوان خـۆم و خـۆت گلەییم لـێ بکەیت. توندیت نوانـد لەگەڵـم! خوشـک و براکانـم چیم پـێ دەڵێن کاتێک ئـەم قسـانە دەبیسـتن؟ ڕێـزم ناگـرن، دەبـێ هاوسـەرەکانیان بەمەیـان زانیبێت؟ دەبـێ هاوسـەرەکەی تالـە زانیبێتـی؟ دەکرێـت بـە باوکـی بڵێت! خزمـەکان چـۆن وێنـام دەکـەن! تەنیـا لەبـەر یـەک ملیـۆن دایـە؟ مـن کـوڕی تـۆم، نـەت دەتوانـی لەجیاتـی ئابڕووبـردن لێـم خۆشـبیت؟! بـە تـەواوی ملیۆنەکـەم بیر چووبوویـەوە، گـەر داوات بکردایە ڕاستـەوخۆ پێـم دەدایـت»...

درەنـگ گەیشـتەوە ماڵـەوە... بـەلای ژووری دایکیـدا تێپـەڕی... سیسـەمەکەی چۆڵـە، ئەمجەدیش خەوتـووە... «وەسـیەتەکەیان لەنـاو دۆڵابەکـە دۆزییـەوە»... سـەمیر بیـری کـردەوە... چـووە ژوورەکـەی دایکی و دەرگاکـەی داخسـت، چەکمەجـەی دۆڵابەکەی دەرهێنا، دەرگای کەنتۆرەکـەی کـردەوە، چۆکەکانـی لەسـەر زەوی دانـا و سـەیری ژێـر سیسـەمەکەی کـرد، سـەمیر بۆچـی دەگـەڕا؟

دەگـەڕا بـۆ هـەر پارچـە کاغەزێکـی لەلایـەن دایکییـەوە، بەڵکـوو لەسـەری نوسـرابێت: (گلەیـی بێت لێت سـەمیر، بـەڵام هـەر خۆشـم دەوێیـت) هـەر کاغەزێـک بێـت دایکـی نـاوی بهێنێـت، بـەڵام سـەمیر کاغەزێکـی وای نەدۆزیـەوە.

چـووەوە ژوورەکـەی خـۆی، نیـازی هەبـوو نوێژەکانـی عەسـر و ئێوارە قـەزا بکاتـەوە پاشـان نوێـژی عیشـا بکات، بۆ ئـەوەی خـودا لـە پێشـانگا نوێیەکـەی سـەرکەوتووی بکات، بـەڵام ماندووبـوو، بۆیە خۆی هەڵدایـە سـەر سیسـەمەکەی... بۆ سـاتێک قورئـان خوێندنـی دایکی لـە دوای نوێـژی بەیانیـان و دووریەکـەی بیر هاتـەوە، کە تەنیـا دیوارێک نێوانـی سیسـەمەکەیان بـوو، بیری دەنگی کرد گـەرچی هەمـوو جـارێ سـەری دا دەپۆشـی بـۆ ئـەوی بتوانێـت لـە خـەوتن بـەردەوام بێـت...

تورەبوونـی لـە (توندی دایکـی) و گلەیـی لـە (ئابڕووبردنـی) دامرکابوویـەوە، بۆیـە دەسـتی بـە بیرکردنـەوە کـرد: «کەواتـە دایکـم وەفاتـی کـرد و لێـم ڕازی نەبـوو؟! چـەن جـار نـاوی خوشـک و براکانمـت هێنـا؟ چـوار جـار... ئـەی مـن؟ جارێکیـش نـا، بە(بـرای پێنجەمتـان) ناوزەنـدت کـردم! ئایـا ڕقـت لێـم بـوو دایـە؟ بۆچـی؟ مـن خۆشـم دەوێیـت، ئایـا»... و سـەمیر خـەوی لێکـەوت!»

ئەڵبەتە دایکی خۆش دەویست، بەڵام لە بازرگانییەکەی زیاتر نا!

خراپەکار نەبوو لەگەڵی، بەڵام چاکەکاریش نەبوو.

گـەر هـەر لـە بنەڕەتـەوە بیـری لـە بابەتەکـە بکردایەتـەوە ڕازی نەدەبوو دایکـی تـورە بێت لێی، بـەڵام ئـەوەی لـەلا گرنگتربوو کـە بـە شکسـتخواردوو نـاوی نەبـرێ!

بیرۆکەی هاوکاریکردنی دایکی و گرنگی دان بە تەندرووستییەوە لە ئاوەزیدا هەبوو... بەڵام وەکو ئەو خەیاڵە دوورانەبوو کە دەروازەیەک نادۆزنەوە بۆ گەیشتن بە مێشکی کە بە ئۆتۆمبێل دەور دراوە!

جار جار لەگەڵ خۆیدا دەکەوتـە گفتوگۆ: «لەوانەیـە پێویسـت بێت لـە دایکم بپرسـم، ئایا پێویسـتی بـە یارمەتییـە یـان نـا؟»... بـەڵام ئەمڕۆ و سـبەینێ کـردن «لـە نزیکتریـن دەرفەتـدا وا دەکـەم» یەکسـەری هێرشـی دەبردە سـەری... چونکە تەمـەن درێژە و ڕۆژەکان بەڕێوەن.

ئێسـتا بـە شـتێک سـەرقاڵە کـە دواخسـتنی تێدا نییـە، دایکیشـی ئـەوا ڕۆژێـک لـە ڕۆژان گرنگـی هـەر پـێ دەدا... پێشبینیشـی نەدەکـرد کـە مـردن پێـش ئـەم ڕۆژە دەکەوێتـەوە!

سـەمیر لـە ڕۆژی دواتر هەڵنەسـا هەتا پەیوەندییەکی لـە زاهیرەوە بۆ نەهـات:

- سـەمیر تۆ لەکوێیت؟ دواکەوتیت... ئەوە بۆیاخچییەکـە لـە پێشـانگایە و دەیەوێت سەرپشکت بکات لە نێوان ڕەنگەکان.

بەخێرایی بەڕێکەوت بەرەو پێشانگا، تەواوی ڕۆژەکە بە ئامادەکارییەکان سەرقاڵ بوو، بۆیە کاتی نەبوو بۆ بیرکردنەوە لەو بێبەشبوونەی کە دایکی لە وەسیەتەکە دەریبڕی بوو!

ئەو ٥٠ دەفتەرەی(ئەبو عەزام) ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی، سەمیر بەشی کرد:

٢٢ملیۆن بۆ بەکرێ گرتنی پێشانگا بۆ ماوەی ساڵێک.

٤ملیۆن بۆ ئامادەکارییەکان: ئاو، کارەبا، بۆیاغ، دیکۆر، جامخانەی شوشە و کەلوپەل.

٣ملیۆن بۆ مامەڵەی فەرمیەکان و مۆڵەتەکان و بیمە.

ملیۆن و نیوێک بۆ کرێی فەرمانبەرێک بۆ ماوەی دوو مانگ هاوکاری بێت لەبەڕێوەبردنی پێشانگا.

ئەو بڕەیشی دەمێنێتەوە بۆ کڕین و چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلی دەستی دوو...

سەمیر بەدەم ئەم حیاساباتەوە هەستی بە دڵخۆشی دەکرد! ماوەیەک پێش ئێستا بە کەمتر لە یەک لەسەر پەنجای ئەم بڕەپارەیە دەستی بە بازرگانییەکەی کرد، ئێستاش دەتوانێت دە ئۆتۆمبێل بکڕێت.

کاتێک زاهیر زانی دایکی سەمیر وەفاتی کردووە چی کرد؟
لە دوای وەفاتی دایکیان ماڵ باوکیان چی لێ دێت؟
ئەی (حەنان) کێیە کە سەمیر بیر لەوە دەکاتەوە مارەی بکات؟

با بەردەوام بین.

***



# ٨

# بەرەو کۆشک

سـەمیر بـە هێزەوە دەسـتی بـە پێشـانگا تازەکـەی کـرد، بڕیـاری دابـوو هەمـوو کاتەکانـی پـێ ببەخشـێت و لەڕێیـەوە چیرۆکـی سـەرکەوتنی بنەخشـێنێت...

لـەم دەمـەدا، زاهیـر لاپەڕەکانـی ڕۆژنامـەی هەڵدەگێـڕا و بـەدوای هەواڵـی گرنـگ دەگـەڕا بـۆ ئەبـو عـەزام، لـە نـاکاودا چـاوی کەوتـە سـەر خوشـک و براکانـی سـەمیر، نـاوی سەمیریشـی تێـدا بـوو، بـێ ئـەوەی خـۆی ئـاگاداری ئـەو ڕیکلامـە بێـت، سوپاسـی هەمـوو ئەوانەیـان کردبـوو کـە بەشـدار بـوون لـە پرسـەکەدا و دوعـای خێریـان بـۆ دایکیـان کـردووە، زاهیـر بـەرواری وەفاتەکـەی خوێنـدەوە، هەینـی ڕابـردوو بـوو، ئـەو ڕۆژەی سـەمیر لـە ماڵیـان بـوو (ماڵـی زاهیـر)...

زاهیـر شـۆک بـوو: «دیـارە دایکـی سـەمیر بـە ڕووداوێـک لـەو ڕۆژەدا وەفاتـی کـردووە، باشـە بۆچـی پێـی ڕانەگەیاندومـە؟!» یەکسـەر پەیوەنـدی بـە سـەمیرەوە کـرد.

- سەمیر، سڵاو...

- سڵاو زاهیر.

- لـە ڕۆژنامـە خوێندمـەوە، ئـەوە دایکـت بـوو کـە هەینـی ڕابـردوو وەفاتـی کـردووە؟

سەمیر شۆکبوو، پەشۆکا:

- بەڵێ، خودا لێی خۆش بێت.

- خودا لێی خۆش بێت، بۆ خۆتان خۆشبن... چۆن؟ بە ڕووداوی هاتوچۆ؟

- نەخێر،ئەو... بەڵێ... نەخۆش بوو.

زاهیر هەستی بەو شەرمەزارییە کرد کە سەمیر تووشی بووە، بۆیە جارێکی تر سەرەخۆشی لێ کرد و پەیوەندییەکەی کۆتایی پێ هێنا، پاشان لە دڵی خۆیدا وتی: «کەواتە سەمیر لەگەڵمان دانیشتبوو گۆشتی برژاوی دەخوارد و گوێی لە نوکتەکانی زیاد دەگرت، لەکاتێکدا دایکی لەسەر مەرگدا بوو! ئەم پیاوە پارە دەپەرستێت! هەربۆیە دەمی لیکی کردبوو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستادا»!...

لەبەر ئەم هەڵوێستە ڕێزی سەمیر لەلای زاهیر زۆر کەم بوویەوە، گەرچی دەریشی نەدەخست...

ئێستا دەبێت ماڵەگەورە بفرۆشرێت و نرخەکەی لەسەر منداڵەکان دابەش بکرێت، تالە پێشنیاری کرد یەک لەسەر سێی نرخەکەی تایبەت بکرێت بۆ دروستکردنی مزگەوت، سابەڵکوو پاداشتەکەی بگاتە دایک و باوکییان... ئەمجەد بیرۆکەکەی بە سەمیر وت... کەمێک بیری کردەوە... شوێنەواری چاکە و خۆشەویستی بۆ دایک و باوکی زاڵ بوو بەسەر خۆشەویستی بۆ پارە، بۆیە ڕازی بوو.

ئەمجەد دەیەوێ لە شوقەیەکی بچوکی نزیک زانکۆ بژیت، سەمیریش دەیەوێت لە شوقەیەکی نزیک لە پێشانگا و دوور لە زانکۆ بژیت. ئەمجەد هەوڵیدا چارەسەرێکی ناوەنجی بدۆزێتەوە، بەڵام سەمیر هاوکاری نەکرد، بابەتەکەش وا کۆتایی هات هەر یەکەیان شوقەیەکیان بە کرێ گرت...

پێش ئەوەی خانووی خانەوادەکەیان بدەنە دەست کڕیار، خوشک و براکان تێیدا کۆبوونەوە، یادگاری منداڵییان لەگەڵ دایک و باوکیان

-بەڕەحمەت بن- بە بیر هاتەوە... عاسم و ئەمجەد لە هەندێک شوێنی ماڵەکە وێنەیان چرکاند، تالە لەسەر جۆلانێیەکە دانیشت، سەعیدیش هەندێک ڕووەکی برد بۆ ئەوەی لە ماڵەوە هەڵی بگرێت. تەنانەت سەمیریش لەگەڵ کۆتا سەیرکردنی بۆ ماڵی خانەوادەکەی هەستی بە کەمێک ترس کرد... پاشان ماڵەکەیان بەجێ هێشت...

سەمیر و ئەمجەدیش لێک جودا بوونەوە، بەم شێوەیەش سەمیر ئەوەندە کاتە کەمەی ئەمجەدی دەبینی، ئەویشی لە دەستدا، چونکە سەمیر بەو بێ ئاگاییەشی بە ئەمجەد کاریگەر دەبوو، گەرچی کاریگەر بوونەکەی کەمیش بێت.

ساڵێک تێپەڕی، تیایدا ئەمجەد گەڕایەوە بۆ کۆلێژی پزیشکی، بە پەرۆشییەکی زۆر و سەرکەوتنی بەرزەوە سەر لەنوێ دەستی بە خوێندنەکەی کردەوە.

لەو ساڵەدا سەمیر ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ پێشانگاکە... نرخی فرۆشتنەکان ناوازەن، بەڵام هەندێک جار لە چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکاندا کەمتەرخەمی دەکات. هەروەها بۆ ئەوەی بازرگانییەکەی شکست نەهێنێت و ناوی نەزڕێت، خەرجی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلە فرۆشراوەکە دەگرێتە ئەستۆ ئەگەر کڕیارەکە لە حەقی خۆی بێدەنگ نەبێت.

ئەمجەد هەوڵی دەدا پەیوەندی لەگەڵ سەمیر بمێنێت... .بانگێشتی کرد بۆ ئەوەی بەیەکەوە بچنە دەرەوە و نانێک بخۆن... سەمیر یەکەمجار وەڵامدانەوەی هەبوو، جاری دووەمیش کەمێک خۆی دواخست بەڵام دواجار پێکەوە چوونە دەرەوە... دواتر وای لێهات دوای دەخست و هەموو جارێک بەهانەی ئەوەبوو سەرقاڵە، هەتا وای لێهات ئەمجەدیش سەرقاڵی زۆری بۆ دروستبوو.

خێرایی گەشەسەندنی سەمیر وەکو بازرگانێکی ئۆتۆمبێل بووە جێی سەرسام بوونی مامۆستا پێی، بەتایبەت لەبەر ئەوەی

لەو ماوەیەدا بەدەست زەرەرکردن و نزم بوونەوەی بەشێک لە وەبەرهێنانەکانی تری دەینالاند، بۆیە پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ سەمیر بەهێزبوو، چیدی زاهیریان نەدەکردە (نێوەند)ێک لە نێوان خۆیان، سەردانی کردنی سەمیریش بۆ کۆشکی ئەبو عەزام زیادی کرد.

حەنانی کچی ئەبو عەزام، کچێکی تەمەن بیست ساڵانە، نازداری دایک و باوکییەتی و هیچ داواکارییەکی ڕەت ناکرێتەوە، لە ئامادەیی کەوت بۆیە دووبارەی کردەوە... ئێستا ئەو یەکەم ساڵییەتی بۆ دیبلۆمی گرافیک دیزاین... بیرکردنەوەی ڕووکەشانەیە... ئەم کوڕە تەماحبازەش -سەمیر- سەیرکردنەکانی سەرنجی ڕاکێشا، زۆر جار گەر بهاتایە بۆ کۆشک ئەو دەرگای لێ دەکردەوە و پێشوازی لێ دەکرد، سەمیریش بە هەمان شێوە هەستی بە گرنگیدانی ئەو دەکرد...

سەمیر بیری کردەوە: «ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە هاوسەرگیری بکەم و خێزان پێک بهێنم؟ خوشک و براکانم هەموویان هاوسەرگیریان کردووە -ئەمجەد نەبێ- و منداڵەکانیشیان وا خەریکە گەورە دەبن، لە چیم کەمە هەتا زەواج نەکەم؟»

سەمیر بیری لەوە کردەوە بچێتە خوازبێنی حەنان، بەڵام پاشگەز بوویەوە و لە نەفسی خۆیدا وتی: «مەحاڵە، مامۆستا ملیۆنێرە و منیش کەسێکی ئاساییم، تەنیا هاوبەشم لە یەکێک لە وەبەرهێنانە بچووکەکانیدا. بەهەمان شێوە من زانکۆشم تەواو نەکردووە... مامۆستا ڕازی نابێت، لەوانەیە کچەکەشی ڕازی نەبێت، چونکە هەر کەسانی زەنگینی وەکو خۆی هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەن».

«بەڵام هەست دەکەم ئەویش بەهەمان شێوە گرنگیم پێ دەدات... بۆچی تاقی نەکەمەوە؟».

دوای دوو دڵییەکی زۆر، سەمیر بڕیاریدا تاقی بکاتەوە و بابەتەکە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ مامۆستا بکاتەوە و بزانێت ڕای چییە، بەڵام دوای مانگێکی ناوازە و پڕ قازانج، سەمیر هەموو کۆتایی مانگێک لەگەڵ (ئەبو عەزام) کۆ دەبوویەوە، بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێلە کڕدراو و فرۆشراوەکان و ڕێژەی بووژانەوە لە بازرگانییەکەیانی پیشان بدات.

هەوڵ و تێکۆشانی سەمیر زیادی کرد، مانگێکی پڕ قازانج هات، چل و پێنج ئۆتۆمبێل فرۆشرا، کۆی قازانجەکان ٢دەفتەر بوو، ١٤٪ لە مانگی ڕابردوو زیاتر بوو، بۆیە لە کۆتاییدا بڕیاریدا داخوازی حەنان بکات.

سەمیر بە کەشخەییەوە چوو بۆ کۆبوونەوەی مانگانەی لەگەڵ ئەبو عەزامدا، پوختەی دەستکەوتەکانی مانگەکانی ڕابردووی لە چەند خشتەیەکی ژمارەییدا کورت کردبوویەوە، پێشنیارێکیشی لەگەڵ خۆی برد بۆ فراوانکردن و کڕینی پێشانگاکە لەجیاتی ئەوەی کرێی سالانەی بدەن. ئەبو عەزام بە خێرایی گەشەسەندنی بازرگانی ئۆتۆمبێلەکان سەرسام بوو و هەستی بەو پەرۆشییە مەزنەی سەمیر کرد، بەدەم قسەکردنی سەمیرەوە بیری دەکردەوە کە چۆن دەکرێت توانای ئەم کوڕە تەمەنی ٢٣ ساڵە بەکار بخات بۆ ئەوەی زیاتر سوودی لێ ببینێت.

دوای ئەوەی مامۆستا سەرسامی خۆی و ڕازی بوونی دەربڕی بۆ پێدانی بڕی ٤٥دەفتەر بۆ ئەوەی بینای پێشانگاکە لە خاوەنەکەی بکڕنەوە، سەمیر وتی:

- «مامەگیان، ئەبو عەزام، من زۆر خۆشحاڵم بە کارکردن لەگەڵ تۆ و هیوادارم پەیوەندییەکەمان قوڵ تر ببێتەوە». ئەمە یەکەم جاربوو بە مامە بانگی بکات، چونکە هەردەم بە (مامۆستا) بانگی دەکرد.

ئەبو عەزام وەڵامی داوە:

- منیش بەناسینت خۆشحاڵم سەمیر، لەسەر ئەم چالاکییە بەردەوام ببە و پشتگیرییەکی کراوە لەمن وەربگرە.

- دەتوانم داوای شتێکی ترت لێ بکەم کە زیاتر تۆم لێ نزیک بکاتەوە، بێجگە لە پشتگیری ماددی.

ئەبو عەزام پێی سەیر بوو: فەرموو.

- «لەوانەیە هێشتا باری کۆمەڵایەتیم سادە بێت، بەڵام ئاواتم هەیە و... ئێ.. سەبارەت بە... خاتوو حەنان...» سەمیر شەرمی کرد ڕاستەوخۆ داواکارییەکەی بکات و لە ڕەتکردنەوەی مامۆستا دەترسا.

ئەبو عەزام بەو داواکارییە شۆک بوو، پاشان کەمێک بەدەم بیرکردنەوە بێدەنگ بوو، دواتر وتی:

- باشە، با بابەتەکە لەگەڵ حەنان و دایکی باس بکەم.

سەمیر خۆشحاڵبوو، چونکە مامۆستا ڕاستەوخۆ ڕەتی نەکردەوە، مۆڵەتی وەرگرت و ڕۆیشت.

ئەبو عەزام دەیزانی کە کچە جوانەکەی ئەگەری هەیە پیاوانی بازرگان و دەوڵەمەند و خاوەن پێگە بچنە داوای، بەڵام هەستی کردبوو حەنانیش گرنگی دەدات بە سەمیر، بە کەسێکی گونجاوی بینی کە هاوکاری بێت لە پرۆژە و وەبەرهێنانەکانیدا... «کوڕێکی گەنج، خاوەن ئاوات، جددی لە کارەکانیدا، دەتوانم بیکەمە هاوبەشی بیرکردنەوە بۆ چارەکردنی ئەو کێشانەی بەم دواییانە بووە هۆی زەرەرمەند بوونم، دەتوانم بە هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ حەنانی کچم و باشترکردنی دۆخی کۆمەڵایەتی پشتگیری ئەو بەدەست بهێنێم، بەم شێوەیەش هیچ لە دەست نادەم، کچەکەیشم سوودمەند دەبێت».

ئەبو عـەزام دوو کـوڕی هەیـە، گەورەکـەی لـە هیـچ شـتێک پشـتی پـێ نابەسـترێت، کاتەکانـی لەگـەڵ برادەرەکانـی بەسـەر دەبـات و لـە هەمـوو بەرپرسـیارییەتییەک هەڵدێـت کـە باوکـی پێـی بـدات، ئـەوی تریش بچوکـە... بۆیە ئەبو عـەزام پێی خۆش بـوو گەنجێک لێی نزیک بێتـەوە کـە هـاوکاری بـکات.

ئەبو عەزام لەگەڵ حەنان و دایکی دانیشت...

- سـەمیر بـە ماوەیەکـی کـورت سـەرکەوتنێکی سەرسـامکەری بەدەسـتهێناوە.
- باوکە، وا دیارە زیرەک و چالاکە.
- بەڵێ...

بە خەندەوە وتی:

- دەزانی ئەمرۆ داوای چی لێ کردم؟
- چی؟
- بیر لە مارەکردنت دەکاتەوە.

ڕووی حەنان سوور هەڵگەڕا و هەستی بە دڵخۆشییەکی زۆر کرد.

دایکی حەنان هەڵچوو:

- مەحاڵـە، ئـەم کـوڕە سـادەیە... حەنـان دەبێـت هاوسـەرگیری لەگـەڵ کەسـێکدا بکات کـە لـە ئاستی ئێمـەدا بێت. هاوڕێکانم خەریکە چـاو دەخەنـە سـەر حەنـان بـۆ کـوڕ و بـرا زەنگینەکانیـان، منیـش هـەر بابەتەکـە دوا دەخـەم، چونکـە حەنـان هێشـتا منداڵـە.
- ئەم گەنجە داهاتووی هەیە، حەنان دڵخۆش دەبێت لەگەڵی.
- ئـەی گـەر کەسـوکار و هاوڕێکانـم لەسـەر سروشـتی کارەکـەی پرسـیاریان لـێ کـردم، چـی بڵێـم؟!
- پێیـان بڵـێ: پیاوێکـی بازرگانـە و هاوبەشـی ئەبو عەزامـە لـە هەندێک لـە وەبەرهێنانەکانیدا. سـۆزان، هـاوکاری دەبـم بـۆ ئـەوەی بەخێرایی

گەورە بێت... کوڕەکە ئامادەباشی تێدایە... باشترین شت ئەوەیە هەر نزیکی خۆمان دەبێت، هەرکاتێک بمانەوێت دەتوانین حەنان ببینین... بەرگە دەگریت کەسێک حەنانمان لێ ببات و سەربەخۆ بژی، لەوانەیە بیباتە شارێکی تر یان تەنانەت دەوڵەتێکی تر؟...

- بێگومان نەخێر... حەنون ڕووحی منە... بەڵام لەکوێ دەژین؟
- «لە ڤێلای یاسەمینەکە»... ئەم ڤێلایە خانەوادەی ئەبو عەزام تێیدا ژیابوون پێش ئەوەی زیاتر دەوڵەمەند ببن، دواترماڵیان گواستەوە بۆ کۆشکەکە و ڤێلاکەیان نەفرۆشت.

سۆزان بە کچەکەی وت:

- حەنان، گیانی دایە، ئایا بە کوڕێک ڕازی دەبیت زانکۆی تەواو نەکردبێ؟
- دایە، سەمیر کوڕێکی جیاواز و زیرەک و ئامانجدارە.
- بەڵام...

ئەبو عەزام تەداخولی کرد:

- سۆزان، منیش زانکۆم تەواو نەکردووە، ئایا لە ژیانمدا شکستخواردووبووم؟
- ئەو کوڕە بچووکە.
- گونجاوە بۆ کچە بچوکەکەمان...

دوای مشتومڕێکی دوور و درێژ، دایکی حەنان بە نابەدڵی بێدەنگ بوو.

لە ڕۆژی دواتر ئەبو عەزام چووە ئۆفیسە شاهانەکەی، لە کاتی دانیشتنی لەگەڵ زاهیری سکرتێری، سەرکەوتنە ناوازەکەی پێشانگاکەی سەمیری پێ ڕاگەیاند، هاوکاتیش ئەوەی باسکرد نیازی ئەوەی هەیە حەنانی کچی بدات بە سەمیر.

لێرەوە، زاهیر هەستی بە ئیرەییەکی زۆر کرد بەرانبەر سەمیر! چونکە ئەو خۆی مامۆستای پێ ناساند، لەگەڵ ئەوەش وایان

لێ هاتووە بەسەریدا تێدەپەڕن و بانگێشتی ناکەن بۆ زۆرێک لە کۆبوونەوەکان، مامۆستاش بە سەرسامییەوە سەیری دەکات بگرە دەیەوێ کچەکەی خۆی پێ بدات!

بەپاڵنەری ئیرەییەوە وتی:

- مامۆستا، سەمیر ناوازەیە وەکو بازرگانێک، منیش لەم خاڵە هاوڕاتم، بەڵام ببێت بە زاوای تۆ، ڕێگەم بدە... حەنان وەک کچی منە... سەمیر گونجاو نییە بۆی، من ئەوەم پێ نەوتبووی، باوەڕ دەکەیت کاتێک ئێمە لەیەکەم چاوپێکەوتن نانمان لەگەڵ دەخوارد، لەو کاتەدا دایکی لەسەرە مەرگدابوو؟!

مامۆستا هەستی کرد وشەکانی ئیرەیی زاهیری وروژاندووە، بۆیە زۆر گرنگی بە قسەکانی نەدا:

- مەحاڵە زاهیر...

- گەورەم باوەڕکە، لێی بپرسە، بە هەموو نرخێک دەیویست بتبینێت... بمبوورە، بەڵام کەسێک چاکەی بۆ دایکی نەبووبێت، چاکەی بۆ کچەکەی تۆیش نابێت.

مامۆستا شێوازی زاهیری لە بەرهەڵستیکردنەکەی بۆ سەمیر بەدڵ نەبوو، بۆیە بە وەڵامێکی سەیر وەڵامی دایەوە بۆ ئەوەی دەمکوتی بکات:

- «ئەگەر سەمیر بەو ڕادەیە دڵسۆزی هەبێت بۆ کارەکەی، ئەوا ئەوە دەبێتە یەکێک لە کلیلەکانی سەرکەوتنی»... زاهیریش بە ڕقێکی زۆرەوە بێدەنگ بوو.

مامۆستا بە ئەنقەست هەفتەیەک خۆی دواخست لە پەیوەندی کردن بە (سەمیر)ەوە، دواتر بانگهێشتی کرد بۆ کۆشکەکەی، لەگەڵ حەنان و دایکیدا چاوەڕێیان دەکرد.

ئـەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژی ژیانـی سـەمیر بـوو، هەواڵـی یـەک لـە دوای یـەک: هاوسـەرگیری لەگـەڵ کچـی مامۆسـتا دەکات، مامۆسـتا لـە ڤێلاکـە نیشـتەجێیان دەکات وەکـو دیـاری هاوسـەرگیرییەکەیان، زەماوەندەکـەش لـە هۆتێلێکـی شـاهانە دەکرێت، دەوڵەمەنـدان و پیاوانی بازرگانـی بـۆ بانگهێشـت دەکرێت.

سـەمیر نەیدەتوانـی خۆشـحاڵبوون و سەرسـام بوونـی خـۆی بشـارێتەوە! چەندیـن جـار لیکـی خـۆی قـوت دا... بـەڵام لەکاتـی باسـکردنی زەماوەندەکـە، ئامـاژەی بـە خەرجـی پێشـبینیکراو کـرد، مامۆسـتا وتـی:

«بابەتەکـە بـۆ مـن لێگـەڕێ و خۆشـترین زەماوەندتـان بـۆ سـاز دەکـەم».

شـەش مانـگ تێپـەڕی، لـەو شـەش مانگـەدا هەڵسـوکەوتی زاهیـر لەگـەڵ سـەمیردا گـۆڕا، بـەڵام سـەمیر پشـتگوێی دەخسـت، درکـی بـەوەش کردبـوو کـە خەریکـە ئیرەیـی پـێ دەبـات...

ڕۆژی زەماوەنـد هـات، سـەمیر تەنیـا خوشـک و براکانـی و خانەوادەکانیانی بانگێشت کـرد، بێ ئـەوەی خزمەکانی تری بانگهێشت بـکات، لەبـەر دیاریکـراوی ئـەو کارتانـەی ئەبـو عەزامـی (مامـی) پێـی دابـوو. چـەن خولەکێکـی کـەم تێنەپـەڕی بەسـەر دەسـتپێکردنی زەماوەندەکە، خوشک و براکانی و هاوسـەرەکانیان بە ناڕەحەتییەوە لـە زەماوەندەکـە چوونـە دەر و شـۆک بووبـوون لـەوەی بینییـان!

زەماوەنـدی سـەمیر و حەنـان بازدانێکـی گـەورە بـوو، وایکـرد سـەمیر لـە خوشـک و براکانی و ژینگە و خانـەوادە و پەروەدەکەیـان دوور بکەوێتـەوە، لـە ژینگـەی ئەبـو عەزامیـش نزیکتـر ببێتـەوە.

سـەمیر خۆیشـی شـۆک و شـەرمەزاربووبوو لە هەندێک دەرکەوتن و ڕێکخسـتنەکان، بـەڵام هەسـتی کـرد شـیاو نییـە هیـچ ناڕەحەتـی و

بەرهەڵستییەک دەر ببڕێت بەرامبەر ویستی ئەبو عەزام، کە بە چاکەکانی دەوری دابوو: «سەرمایەی پێدا بۆ پێشانگا، کچەکەی پێدا، ڤێلاکە، دابینکردنی خەرجی زەماوەندەکە، ئێستا وا بە دڵخۆشییەوە بەو هاوڕێ شاهانانەی دەیناسێنێت، کە سەمیر خەونی بەوە دەدی میوانی زەماوەندەکەبن و تەوقەیان لەگەڵ بکات و پێشوازییان لێ بکات و وەها لە پێشچاویان بناسرێت کە: «کوڕە بازرگانێکی گەنجی سەرکەوتوو، هاوبەشم لە هەندێک لە وەبەرهێنانەکاندا» وەک چۆن ئەبو عەزام هەر وای دەوت.

ئەبو عەزام بووبووە ئەو هەوایەی سەمیر هەڵی دەمژی! چیدی نەیدەتوانی دەستبەرداری ببێت و لە هیچ شتێک نەیدەتوانی بڵێت: (نەخێر)، لە هەمان کاتدا لە زەماوەندەکەی لەسەر زۆر شت بێدەنگ بوو، وەک هەموو جارێک پاساوی بۆخۆی دەهێناوە.

زەماوەندەکە تەواو بوو، تازە بووک و زاوا گەشتیان کرد بۆ ئەوەی دوو هەفتە لە قوبرس بەسەر ببەن، پاشان گەڕانەوە بۆ ئەو ڤێلایەی ئەبو عەزام و سەمیر بە نیوەیی خەرجی کەلوپەلەکانیان کرد، ژیانیان بە لێکتێگەیشتن و سۆز دەستی پێکرد، هەریەکەیان بە ئەوی تر خۆشحاڵبوو، سەمیر دەیویست سوپاسگوزاری خۆی بۆ خودا دەرببڕێت، بۆیە لە هەفتەکانی یەکەمدا پابەند بوو بە نوێژەکانیەوە، حەنانیشی فێری نوێژکردن کرد! چونکە حەنان کۆتا نوێژ کە بینیبێتی، نوێژی باپیری (باوکی دایکی) بوو، ئەویش پێش وەفات کردنی واتا چەندین ساڵ پێش ئێستا، کاتێک جل و بەرگی نوێژیان کڕی و حەنانیش لەبەری کرد، جوانی و سۆزی لە دڵی سەمیر زیادی کرد، بەڵام بابەتی باڵاپۆشی لەم ژینگەیە بەهیچ شێوەیەک نەدەهاتە گۆڕێ و نەشی دەوێرا لەگەڵ حەنان ئەم باسە بکاتەوە.

مانگێکی تەواو بەسەر زەماوەندەکە تێپەڕی، سەمیر بە خەیاڵیدا نەدەهات پەیوەندی بە خوشک و براکانیەوە بکات، ئەوانیش پەیوەندییان پێوە نەدەکرد، چونکە لێی زویر بووبوون.

ئایا لە کۆتاییدا کێ پەیوەندی پێوە دەکات؟ چی پێ دەڵێت؟
زاهیر بە پاڵنەری ئیرەییەوە چی دەکات؟
یەکەمین منداڵی سەمیر کوڕە یان کچ؟

با بەردەوام بین.

***

تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن ( ئامینە سیامەند ) کراوە**
**بە PDF و پێشکەش بە خوێنەر کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link





# ٩

# پێم دەبەخشێت، کەواتە خۆشی دەوێم

دوای مانگێک لە زەماوەندی سەمیر، ئەمجەد پەیوەندی پێوە کرد و داوای لێ کرد کاتێک دابنێت بۆ ئەوەی سەردانیان بکات... سەمیر پێشوازی لێ کرد و بانگهێشتی کرد بۆ ڤێلاکە. ئەمجەد هات و پاکەتێک شیرینی وەکو دیاری هاوسەرگیری لەگەڵ خۆیدا برد.

لە ئاسودەیی سەمیر لەگەڵ حەنانی هاوسەری و سەرکەوتنی لە کارەکەیدا دڵنیا بوویەوە، دواتر سەمیر پرسیاری خوێندنەکەی لێکرد و چۆن کاتەکانی بەسەر دەبات لەگەڵ ئەم ژیان کردنەی بەتەنیا.

دوای هەموو ئەم پێشەکیانە ئەمجەد بە دەنگێکی هێمن و خەماوییەوە وتی:

- سەمیر تۆ زۆر دوور دەکەویتەوە.

سەمیر لە مەبەستی براکەی تێگەشت و نیشانەی تێکەڵبوون دەستکردن بە گفتوگۆ لەسەر ڕووخساری لاچوو، بێدەنگ بوو.

ئەمجەد وتی:

- براکەم، دایک و باوکمان ئاوا پەروەردەیان نەکردین، نوێژەکانت، پەیوەندیت لەگەڵ خودا... گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، سەمیر...

سەمیر قسەکەی پێ بڕی:

- ئەمجەد، من ڕەخنەم نەگرت، بەڵام وا دیارە تۆ هاتووی سیمینارم بۆ بدەی، تەنانەت بیرت چوو پێم بڵێیت: (زەماوەندەکەت پیرۆز بێت).

- براکەم، بەڕاشکاوی بیڵێم، ئەوەی لە زەماوەندەکە ڕوویدا خودا بەرەکەتی تێ ناکات، ناتوانم فێڵت لێ بکەم و موجامەلەت بکەم.
- براکەم، شتەکە تەسک مەکەنەوە، شەوی ژیانم بوو، مرۆڤ حەز دەکات خۆشحاڵ بێت.
- براکەم، گەر تۆ تەنیا بەو شتانە خۆشحاڵ دەبیت کە خودا تووڕە دەکات، ئەوە پێی دەوترێت غەفڵەت! کاتێک خودا بەخششێکت پێ دەبەخشێت، دەبێت لە لوتکەی منەت پێبوون و گوێڕایەڵیدا بیت.
- مەڵێ غەفڵەت... من غافڵ نیم! کاتێک ئەوەتان بۆ پێشنیار کردم بەشێک لە میراتی دایک و باوکم بۆ بونیادنانی مزگەوت تەرخان بکرێت، ڕازی بووم، بە بەردەوامی کاری خێرخوازی دەکەم و پێویست ناکات هەموویت پیشان بدەم، کاتێک لە ماڵی دایک و باوکی ڕەحمەتیمان دەرچووین دەمتوانی لە بانک شوقەیەک وەرگرم، بەڵام نەمکرد و شوقەیەکی سادەم بەکرێ گرت، نوێژیش... کێ بەتۆی وت من نوێژ ناکەم؟ هەندێ جار لێی دا دەبڕێم، بەڵام بەتەواوی وازم لێی نەهێناوە، بگرە حەنانیشم هانداوە و ئێستا هەندێک جار لەگەڵم نوێژ دەکات، بۆیە تکایە، خۆت مەکە بە دادوەر لەسەر پەیوەندییەکانی من لەگەڵ خودادا.
- براکەم، لەبەر خۆت ئامۆژگاریت دەکەم... بەندە نابێت ئەوەندەی بەس بێت کە هەرکاتێک بییەوێت هەندێک لەوانە جێبەجێ بکات کە خودا فەرمانی پێکردوین... سەمیر چاوەڕێی ئەوەم دەکرد زیاتر مافەکانی خودای بەگەورەبزانیت، نەک بەکەم تەماشایان بکەیت.

لێرەدا، تووڕەیی سەمیر زیادی کرد:

- من مافی خودا بەکەم نازانم، بەڵکو خودام خۆش دەوێ و دڵنیام خودا منی خۆش دەوێت... سەیرکە چۆن خودا لە بازرگانییەکەم

سەرکەوتووی کردم و بە خێرایی سەرکەوتوو بووم، سەیرکە چۆن لە ڤێلایەکی شاهانە نیشتەجێ بووم، بەردەوام نزا دەکەم و خودا وەڵامم دەداتەوە، لە نەخۆشکەوتنم، لە بازرگانییەکەم، لە مامەڵە کردن و پەیوەندییەکانمدا.

- «سەمیر، هەموو ئەوانەی ئاماژەت پێ کردن دونیاین، خودا دونیا دەبەخشێت بەوەی خۆشی دەوێت و خۆشی ناوێت، ئیمانیش تەنها دەبەخشێت بەوەی خۆشی دەوێت. خۆشەویستی خودا لە سەرکەوتنت لە ئایینەکەتدا و ڕازیبوونی دایک و باوکتدا دەیزانیت. ئەو ڕۆژەی دایکم وەفاتی کرد...»

لێرەدا ڕووی سەمیر لە توڕەییدا سوور هەڵگەڕا، چونکە ڕۆژی وەفاتی دایکی ئەو دەمارە گرگرتووە بوو، کە بەرگەی نەدەگرت هیچ کەس لێی نزیک ببێتەوە، بەرگەی نەدەگرت بەراورد بە خوشک و براکانی بکرێت سەبارەت بەو ڕۆژە، قسەی ئەمجەدی بڕی و گوتی:

- ڕەحمەتی خودا لە دایک و باوکم. ئەمجەد، وامزانی هاتووی بۆ پیرۆزبایی کردن لە هاوسەرگیرییەکەم، بەهەر حاڵ سوپاس بۆ سەردانی کردنت و دیارییەکەت، خوداش ڕێنیشاندەری هەموومان بێت...

ڕوون بوو کە دەیویست ئەو سەردانییە کۆتایی پێ بێت.

ئەمجەد بەداخەوە بۆ حاڵی براکەی چووە دەرەوە، پەی بەوە برد کە تێڕوانینی تەواو بە دونیاوە تەسک بۆتەوە، پەیوەندییەکانی بە خودا بە سەرکەوتنی دونیایی دەپێوێت، ئەمجەد سەر ئۆتۆمبێلەکەی کەوت و پێش ئەوەی بەڕێ بکەوێت، بە موبایل نامەیەکی بۆ براکەی نارد کە دوو ئایەت بوو:

﴿فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّاۖ﴾

واتە: بەڵام مرۆڤی خوانەناس کاتێ کە پەروەردگاری تاقیکردەوە بە پێدانی ماڵ و دارایی، جا ڕێزی لێناو سەروەت و سامانی پێبەخشی و نعیمەت و بەهرەی بە سەردا ڕشتێ تا دەرکەوێ سپڵەیە، یان سوپاسگوزار، دەڵێت: پەروەردگارم ڕێزی لێناوم، چونکە شایەنی ئەو بەهرەیەم بۆیە پێیداوم. بەڵام کاتێکیش تاقیکردەوە بە تەنگانە، ڕزق و ڕۆزی لێگرتەوە، بە ئاگاییەکەوە دەڵێت: پەروەردگارم سووکایەتی پێکردوم! چونکە وا دەزانێ ڕێزی مرۆڤ بە سامانەوەیە. نەخێر هیچی وانییە...

سەمیر نامەکەی کردەوە ئەوەی ئەمجەد دەیویست تێیبگەیەنێت، تێگەشت: (ڕێزلێنانی خودا و سوکایەتی کردنی خودا، بەپێی ڕۆزی دونیایی نییە)...

سەمیر وەسیەتی دایکی و نزاکردنی بۆ خوشک و براکانی و بێبەش بوونی خۆی بیرهاتەوە... بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو و حەنانی تازە بووک بانگی کرد، بۆیە لە دڵی خۆیدا وتی: «لەوانەیە پێویست بکات بیر لەم بابەتە بکەمەوە، بەڵام ئێستا نا، ئەوەندە بەس بوو بەم زاوایەتییەی خۆم سەرودڵم گیرا، دوایی بیری لێ دەکەمەوە، لە نزیکترین دەرفەتدا... چووە لای حەنان...

ساڵێک تێپەڕی، دوو شتی سەرەکی تیایدا ڕوویدا:

یەکەم: ئەبو عەزام بێجگە لە پێشانگای ئۆتۆمبێلەکان دەستی کردبوو بە هاوبەشیکردنی سەمیر لە وەبەرهێنانەکانی تریدا، بە پێشاندانی سروشتی ئەم وەبەرهێنانانە و کێشەکانیان و داواکردن لە سەمیر بۆ ئەوەی چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە... فایلی ئەم وەبەرهێنانانە لەلای زاهیری سکرتێر بوون، دوای هەموو کۆبوونەوەیەک مامۆستا بە سەمیری دەوت:

- لەگەڵ زاهیردا بەدواداچوونی بۆ بکە، وردەکارییەکانی لێ وەربگرە.

زاهیر دڵی پڕ لە ڕقبوو بەرانبەر ئەو کوڕە نازدارە (سەمیر)، کە مامۆستا پشتی پێ دەبەست بۆ ئەو کێشانەی کە زاهیر نەیتوانیبوو چارەیان بکات: «من تۆم بۆ لای ئەبو عەزام هێنا، کەچی ئێستا بۆ کۆبوونەوەکان بەسەرمدا تێ دەپەڕن، ئەوەندەشی نەبرد کچەکەی لێت مارەکرد، لەکاتێکدا تۆ هیچ نیت! پێی وایە تۆ لەمن بەتواناتری بۆ چارەکردنی کێشەکان؟!»

هەر بۆیە زاهیر بە وشکی هەڵسوکەوتی لەگەڵ سەمیر دەکرد، بە ئەنقەست بەشێک لە وردەکارییەکانی درەنگ پێ دەدا و پاساوی سەرقاڵی بۆ دەهێناوە، بگرە هەندێک لە وردەکارییە گرینگەکانی لێ دەشاردەوە و بە ئەنقەست زانیاری سەرلێشێوێنەری پێ دەدا! هەموو ئەوانە بۆ ئەوەی سەمیر شکست بهێنێت.

سەمیریش دەیزانی زاهیر چی دەوێت، بۆیە بە شێوەیەکی زیرەکانە پەیوەندییەکانی تۆمار دەکرد و بەشێک لە نامەکانی نێوان خۆیانی هەڵ دەگرت و وا خۆی دەر دەخست کە گومانی چاکی پێ دەبات، بۆ ئەوەی زاهیر لە فێڵەکانی بەردەوام بێت، لە کاتێکدا سەمیر لە دڵی خۆی دەیوت: « حەز ناکەم ئەزیەتی کەس بدەم، بەڵام ئەوەی لەسەر ڕێم بوەستێت... پێی لێ دەنێم!»

خۆبەزلزانین! لە ڕۆژی زەماوەندەکەوە لە دڵی سەمیردا لە دایکبوو، شوێنەوارەکانیشی ڕۆژی ئامۆژگارییەکەی ئەمجەد بەدەر کەوت... ئەوەتا هەر وا لە گەشەکردن دایە... وردە وردە سەمیر وا هەستی دەکرد ئەو نیعمەتەی تێیدایە بەرهەمی زیرەکی و چالاکییەتی، هەردەم لەبەردەم خۆیەوە ئەوەی دەوتەوە: «سەرکەوتن لەگەڵتە»... «سەرکەوتن لەگەڵ هەنگاوەکات دەڕوات»، هەندێک جاریش لە تەنیاییدا خۆی لە یاد دەکات و لێوەکانی بە

خۆبەزلزانییـەوە ستایشـی دەکات و دوو پەنجەگەورەکـەی وەکـو نیشـانەی سەرسـامی ڕا دەکێشـێت و دەڵێـت: (you deserve) (تـۆ شـایەنی ئەوەیـت)!

سەرسامبوو بەخۆی چونکە ئەو بەڵگانـەی لـە دژی زاهیـر کـۆی کردۆتـەوە، زاهیری لەنـاو دەبرد، کە نیازی هەبـوو پێشکەشـی ئەبـو عەزامـی بـکات.

بـەڵام ئـەوەی لـەوە دوای خسـت ڕووداوی دووەم بـوو، ئەویـش منداڵبوونـی حەنانـی هاوسـەری، کـە یەکـەم منداڵیـان بـوو...

ئەبـو عـەزام هاتـە نەخۆشـخانە، بـە دڵخۆشـییەوە یەکـەم نـەوەی هەڵگـرت:

- کوڕە ناوت بنێین چی؟ ناوت بنێین چی؟... ئممم... ئەشرەف..

- سۆزان، لەگەڵ ئەشرەف وێنەم بگرە.

وێنـەی گرتـن و وێنەکەی نـارد، ئەویش موبایلەکـەی دەرکرد و لـە فەیسبووک نووسـی: «لەگەڵ یەکەم نەوەم، ناویشـم ناوە ئەشرەف بۆ ئەوەی ببێتـە نیشـانەی شـەرەف لـە سـەردەمی فێڵ و هەڵخەڵەتاندندا...

ئـەوەی سـەیر بـوو، ئەبـو عـەزام بیـری لـە پرسـکردن بـە سـەمیر نەکردەوە... سـەمیریش ناوێکـی بـۆ لـە دایکبووەکـەی ئامـادە کردبـوو، بـەڵام وەکـو لێکتێگەشـتنێک لـە دڵخۆشـییەکەی ئەبـو عـەزام بـە یەکـەم نـەوەی بێدەنـگ بـوو.

لـە دایکبووە تازەکـە ماڵـی سـەمیر و حەنانی پڕ کـرد لـە دڵخۆشـی، خوشـک و براکانیشـی دوای هەفتەیـەک لـە لـە دایکبوونـی ئەشـرەف بـۆ پیرۆزبایـی سـەردانیان کـردن، وەکـو هەلێـک وابـوو بـۆ یەکترناسـینی حەنـان و تالـە و هاوسـەری عاسـم و هاوسـەری سـەعید، سـەرەڕای بوونـی دژیەکییـەک لـە سروشـتیان کەچـی سـەردانی کردنەکـە شـتێک لـە تێکەڵبـوون و خۆشـحاڵی بـە لـە دایکبـووە تازەکـەی تێـدا بـوو.

دوو مانگ تێپەڕی، سەمیر کاتی گونجاوی دۆزییەوە بۆ «دوورخستنەوەی زاهیر»، بۆیە داوای لە مامۆستا (خەزوری) کرد هەر سێکیان کۆ ببنەوە.

لە ئۆفیسی مامۆستا کۆبوونەوە، بۆیە سەمیر فایلێکی تەواوی هێنا لەو بەڵگانەی بە ڕوونی ئیدانەی زاهیر دەکات، ئەوە دەردەخات کە بە ئەنقەست کاری سەمیر گیر دەکات و دەیەوێت شکستی پێ بهێنێت. بە هەمان شێوە هەندێک لە پەیوەندییە تۆمارکراوەکانی کردبوو بە نوسین و بگرە چەندین بەڵگەی ئامادە کردبوو لەسەر کەمتەرخەمی و پشتگوێ خستنی زاهیر لە بەڕێوەبردنی بەشێک لە وەبەرهێنانەکاندا...

ئەبو عەزام بە گرژ و مۆنییەوە لاپەڕەکانی هەڵ دەدایەوە، هاوکات زاهیریش بە گوێپێنەدانەوە ڕووی لە پەنجەرەکە کردبوو...

سەمیر وتی:

- مامەگیان، چیدی ناتوانم هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم کەسە بکەم، شایەنی باسیشە کە ئەو شایەنی ئەو ١٠٪ یە نییە کە لەسەری ڕێککەوتبووین بۆ قازانجی پێشانگاکە، چونکە ئەو هیچ جۆرێک ڕۆڵی نەبووە لە سەرخستنی پێشانگاکەدا.

ئەبو عەزام چاوەکانی لەسەر فایلەکە هەڵگرت و بە تووڕەییەکەوە کە دەیویست بەسەریدا زاڵ بێت لە چاوەکانی زاهیری ڕوانی، سەمیریش بە خۆشحاڵییەکەوە بەم دۆخەی زاهیر، وتی:

- مامەگیان، گەر بڕیارت داوە واز لە زاهیر بهێنیت، پێشنیار دەکەم لێپێچینەوەی لەگەڵ نەکەیت، پێویستیش ناکات ناوی بزڕێنیت، بەڵکو کارێکی تر بدۆزێتەوە و بە سەرەتایەکی دروست دەست پێ بکات.

زاهیر خەندەیەکی ناڕوونی کرد، جگەرەیەکی دەرهێنا و دایگیرساند و وتی:

- مامۆستا منیش پێشنیار دەکەم بە دوای کەسێک بگەڕێیت نهێنی فایلی (ئاسانکارییەکان)ت بۆ بپارێزێت، پێش ئەوەی بیر لە وازهێنان لە من بکەیتەوە!

سەمیر لەمەبەستی زاهیر بە وتنی: (نهێنی فایلی ئاسانکارییەکان) نەگەشت، بەڵام بە کاردانەوە چاوەڕوان نەکراوەکەی ئەبو عەزام شۆک بوو، ڕووی کردە پەنجەرە و جگەرەیەکیشی بەدەستەوە بوو وتی:

- زاهیر، نامەوێت ئەم هەڵسوکەوتەت لەگەڵ سەمیر دووبارە ببێتەوە، دەبێ هەموومان هەموو ڕاجیاییەک بەلاوە نێین و بەرژەوەندی کار پێش بخەین.

ئاوا بە سادەیی!

زاهیریش بە بێدەنگی مایەوە، بێدەنگییەکی ترسێنەر!

پاشان ئەبو عەزام هەستا بە دابەشکردنی کارەکان لە نێوانیان بۆ ئەوەیی هەریەکەیان سنووری خۆی بزانێت، بە زاهیریشی ڕاگەیاند کە ٥٪ی پشکەکەی کەم دەکاتەوە لەبەرامبەر کەم کردنەوەی بەرپرسیارییەتییەکانی لە پێشانگاکەدا بۆ بەرژەوەندی سەمیر، ڕێژەی قازانجی ئەبو عەزامیش بەرز دەبێتەوە بۆ ٥٥٪

کۆبوونەوەکە تەواو بوو و زاهیر چووە دەرەوە، سەمیر لە پرسیارکردن لە خەزوری سەبارەت بەم وەڵامە ساردەی ترسا، بۆیە بڕیاریدا بڕوات، بەڵام ئەبو عەزام ڕایگرت و داوای لێکرد هەموو ئەو بەڵگانەی کە ئیدانەی زاهیر دەکەن ڕادەستی بکات بۆ ئەوەی هەڵی بگرێت.

سەمیر دەرچوو و بڕیاری دا بزانێت(نهێنی فایلی ئاسانکاری) چییە، بۆیە وای لێهاتبوو لە دوای مامۆستا و زاهیر پشکنینی دەکرد، هەوڵیشی دەدا لە دەرەوەی کارەکەی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەبێت کە پەیوەندییان بە وەبەرهێنانەکانی تری مامۆستاوە هەیە،

بگرە لەو کاتانەی زاهیر لەوێ نەدەبوو ئەو هەلەی دەقۆستەوە بۆ سەیرکردنی کۆمپیوتەرەکەی، هەڵدانەوەی کاغەزەکانی ناو ئۆفیسەکەی... لەو کاتانەی مامۆستا بۆ پەیوەندییەک کە نەیدەویست کەس گوێبیستی ببێت دەرگای دادەخست سەمیر لە دەرگاکە نزیک دەبوویەوە... سەمیر ئەم سیخوڕییەی لەو دەمەوە دەست پێ کرد کە بێ هیوا بوو لەدوورخستنەوەی زاهیر، کە هەردەم هەڵسوکەوتی خراپی بەرانبەر دەکرد و هەوڵی دەدا شکستی پێ بهێنێت...

دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە دوومانگ، سەمیر خەریک بوو هەندێک شتی بۆ ڕوون دەبوویەوە، بەڵام مامۆستاش بۆی دەرکەوت کە زاواکەی چاودێری دەکات، چونکە ئەو هاوڕێیانەی کە سەمیر بە شێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ هەوڵی دەدا زانیاری لێیان دەستکەوێت، ئەوەیان پێ ڕاگەیاندبوو.

مامۆستاش سەمیری بانگ کرد بۆ ئۆفیسەکەی.

ئاخۆ دەبێت چی ڕوو بدات لە کۆبوونەوەی نێوان ئەبو عەزام و سەمیردا؟

بۆچی زاهیری سکرتێری دەرنەکرد؟

ئەم ئاسانکارییانە چین کە زاهیر باسی دەکردن؟

سەمیریش چی بۆ دەرکەوت سەبارەت بە جیهانی زاهیر و ئەبو عەزام؟

با بەردەوام بین...

***



# ١٠

# نه شیش بسوتێت نه کەباب

مامۆستا سەمیری بانگهێشتی ئۆفیسەکەی کرد، دەرگای لەسەر خۆیان داخست، ڕووی کورسییەکەی سوڕاند بۆ لای جامخانەکە و دوور لە سەمیر، جگەرەیەکی دەرهێنا و دایگیرساند، قومێکی قوڵی لێدا و دوکەڵەکەی لە دەمیەوە دەرکرد... دواتر بە سەمیری وت:

- سەمیر، مرۆڤ شتانێک لە ژیانەوە فێر دەبێت، کە ناکرێت لە زانکۆ یان کۆرس یان کۆنفرانسەکانەوە فێری ببێت، لەوانەشی کە فێری دەبیت ئەوەیە پەندەکان و بەهاکان بێگومان شتانی گرنگن... گرنگە بۆ ئەوەی بە دەروونێکی تەندروستەوە بژیت و هەست بکەیت لە خۆت ڕازیت. بەڵام گەر وات کرد ئەم بەهایانە زۆر تێکەڵ بینە ناو ژیانت، ئەوا کۆت و بەندت دەکەن و هەموو کەس لە گۆڕەپانی پێشبڕکێیەکە لێت دەبەنەوە، ئەوەشی لە گۆڕەپانی پێشبڕکێ دوا بکەوێت، تەنیا بردنەوەیەکی کەمتر ناباتەوە! بەڵکوو زریان دەبیات، چونکە ئێمە لە جیهانێکداین ڕەحم بە کەس ناکات.

مامۆستا کورسییەکەی بەرەو ڕووی سەمیر سوڕاند و هەندێک پارچەی ئۆفیسەکەی کە لەپێشی بوون، هەڵی گرت و وتی:

- سەمیر، ئەم پارچەیە وەک تەختە دار وێنا بکە، ئەم ئۆفیسەش وەک دەریایەک وێنا بکە کە با شەپۆلەکانی دەجولێنێت، پارچەکانیش

دێن و دەچن، نزیک دەبنەوە و دوور دەکەونەوە... ئایا من دەتوانم بینایەکی بڵندی لەسەر دروست بکەم؟

سەمیر وتی:

- بێگومان نەخێر.

مامۆستا بە خەندەیەکەوە وتی:

- بەها و نموونەی بوونیش لە جیهانی ئێمەدا ئاوان: کۆمەڵگا دەریاکەیە، بارودۆخ و گۆڕانکاری و کێشەکان باکەیە، پارچە دارەکانیش دەرفەتەکانی ژیانمانن... ئەو شوێن پێیانەن کە دەکرێ بۆمان بڕەخسێن. گەر ڕۆژێک با کەم بوویەوە و تەختە دارەکان لێک نزیک بوونەوە و هەوڵماندا نمونەی بەرز و بەهای مەزن لەسەر بنەمای ئەم پارچانە بونیاد بنێین، لەگەڵ یەکەم هەڵکردنی با و شەپۆلی دەریا چی ڕوو دەدات؟

سەمیر وتی:

- دەڕووخێت

مامۆستاش وتی:

- ئافەرین! دەڕووخێت، تۆش لەگەڵی دەڕووخێیت! چەندێ نمونەیی تر بیت، ڕووخانەکە خێراتر دەبێت. بۆیە، لەدوای ئەوەی زیاتر لە چارەکە سەدەیەکە لەناو بازاڕی کاردام، فێر بووم کە بەها ئایینییەکان و پەندە ئەخلاقییەکان شتانێکی جوانن، بەڵام ئەوە منم ڕێگە دەدەم بچنە ناو ژیانمەوە بەو بڕەی پێویستن بۆ ئەم واقیعە، واتا بۆ هەر تەختە دارێک بەپێی توانای خۆی شتی پێ هەڵدەگرم، ئەوەندەی پێ هەڵ دەگرم کە هەرچەندە با هەڵبکات و شەپۆلەکان بەرز ببنەوە پارێزراوبن. کەسانی تر لەوانەیە سووربن لەسەر دروست کردنی بینای بەرز، بەڵام کاتێک بیناکەی دەڕووخێت ئامادە دەبێت بۆ وازهێنان لە هەموو

بەهاکان و ڕەوشتەکانی، خۆی بە تەختەدارەکان دەگرێت تاکو نەڕووخێت! نەخێر ئەزیزم، کەمێکی بەردەوام باشترە لە زۆرێکی پچڕ پچڕ، نە شیش بسوتێ و نە کەباب.

سەمیر بێدەنگ بوو و تفی قوت دەدا... وا بۆی دەرکەوت کە ئەبو عەزام شتێک لە لۆژیکی هەیە لەو قسانەی کە دەیڵێت!

ئەم پێشەکییە دووردرێژە، ڕێ خۆشکردنێکبوو بۆ ئەوەی زیاتر لەکاتژمێرێک سەبارەت بە سروشتی (ئاسانکارییەکان) و(بەڕێکردن) بۆ سەمیری زاوای بدوێت کە لە وەبەرهێنانەکانی کاری پێ دەکات.

سەمیر بۆی دەرکەوت جیهانی ئەبو عەزام و زاهیر پڕە لە فێڵ و ساختەکاری و بەرتیل! زۆر ئاڵۆزترە لەو فێڵە سادەیەی سەمیر کە کڕیاری یەکەم (عەلی)ی پێ هەڵخەڵەتاند، ئاڵۆزترە لەو فێڵە سنوردارەی کە لە چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکان لێی ڕاهاتبوو، سەمیر بۆی دەرکەوت زاهیر تەنیا سکرتێرێک نەبوو، بەڵکو جێبەجێ کاری ئەو کارانە بوو کە مامۆستا ناوی دەنا (ئاسانکاری، بەڕێکردن)، بۆ ئەوەی مامۆستا لەو وێنەیە دەر نەکەوێت و پارێزگاری لە ڕێز و پێگەی خۆی بکات!

هەر بۆیە مامۆستا کاتێک بۆی دەرکەوت بە ئەنقەست شکست بە سەمیر دەهێنێت، بە جددی هەڵسوکەوتی لەگەڵ زاهیر نەکرد، بۆ ئەوەی نەگاتە قۆناغێک وشک و تەڕ پێکەوە بسوتێت و هەموو نهێنییەکان ئاشکرا ببن و ماڵی هەموویان وێران بێت!

سەمیر بە سەرسوڕمانەوە لە ئۆفیسی ئەبو عەزام گەڕایەوە پێشانگا، پێشتر پاساوی لەسەر فێڵکردنێک بۆخۆی دەهێناوە کە بە بڕی ٣٠٠ یان ٥٠٠هەزار دینار بوو، بەڵام ئێستا

پێویستە خۆی بگونجێنێت لەگەڵ پلەیەکی زۆر بەرزتر! بۆ ساتێک، سەمیر بیری کردەوە لەم جیهانە نەخۆشە بکشێتەوە... بەڵام چۆن بکشێتەوە؟ ئەبو عەزام بووبووە ئەو هەوایەی نەیدەتوانی وازی لێبێنێت! ئەو بوو بووە ڕێگای بەدی هێنانی ئارەزووەکانی و نەخشاندنی چیرۆکی سەرکەوتنەکەی...

بەو بۆنەیەوە، سەمیر بە ڕووکەش ئارەزووەکانی هاتبووە دی، بارودۆخی ماددی تا ڕادەیەک وەک بارودۆخی خوشک و براکانی لێهاتبوو، ئەوەتا هاوسەرگیری کردووە و منداڵیشی هەیە، ئێستا وا خاوەن پێگەی خۆیەتی لە نێوان فەرمانبەرەکانی پێشانگاکە و کڕیارەکانی و فەرمانبەرەکانی وەبەرهێنانەکانی تری ئەبو عەزام و ناسیاوەکانی لە چینی (شاهانە)، بەڵام زۆر سەرقاڵبوونی و ڕق هەڵگرتن لە زاهیر و دژایەتی کردنی و پاشان سیخوڕی کردن بەسەر زاهیر و مامۆستاوە، هەموو ئەوانە وای لێ کرد ساتی بەدیهێنانی ئارەزووەکانی تێ بپەڕن بێ ئەوەی تێبینی بکات یان چێژی لێ ببینێت.

لەگەڵ ئەوەشدا بۆی سەخت بوو واز لەم ژیانە بهێنێت، سەمیر بەدڵێکی نەدەدۆزییەوە بێجگە لە (خۆگونجاندن) لەگەڵ زانیارییە نوێیەکانی سەبارەت بە جیهانی ئەبو عەزام، کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام سیانەیەک هەوڵیاندا ڕایبهێنن: ئەبو عەزام، شەیتانی جن، ئەو نەفسەی کە فەرمانی بە خراپە پێ دەکرد! ئەو سیانە پشتی یەکیان گرت وایان کرد نەفسە گلەییکارەکەی (نەفسی لەوامە) هەر لەژێر بەنجدا بمێنێتەوە! هەر کاتێک هەڵدەستا دەرزییەکیان لە دەرزییە جۆراوجۆرە ئامادەکراوەکان لێ دەدا: «تۆ لە کەسانی تر باشتریت»، «ژیان ئەوەی دەوێت»، «خەڵکیش هەر وا دەکەن»، «بە کاری خێرخوازی قەرەبووی بکەرەوە»، «پەند شتێکە

و واقعیش شتێکی تره»، «ناکرێت ئەوەی لە بازرگانییەکەم و بارودۆخی کۆمەڵایەتی پێکم هێناوە بیڕوخێنم»، «بەزەیی خودا فراوانە، تۆش دەگرێتەوە»، «کاتێک ئارەزووەکانم دێتە دی، بارودۆخی دەروونم جێگیر دەبێت و کاتی پێویست دەبەخشم بە ئایینەکەم»، «ڕۆژێک لە ڕۆژان دەچمە حەج، لەلای کەعبە دەگریم و پەڕەیەکی نوێ هەڵ دەدەمەوە»...

هەموو ئەوانە لەگەڵ دەرزییە بنەڕەتییە کۆنەکەدا:

«نامەوێ لە کەسانی تر کەمتر بم، نامەوێت بە شکستخواردوو وەسف بکرێم».

هاوکات ئەبو عەزام بەشداری بە سەمیر دەکرد لەو کارە خێرخوازییانەی ئەنجامی دەدا! بەربانگ کردنەوەی ڕەمەزانان و دابەشکردنی سەبەتی خۆراکی دەخستە ئەستۆی سەمیر... بەڵام ئەبو عەزام لەبیری نەدەچوو وێنەی ئەم کار و چالاکییانە بگرێت، کاتێکیش هەواڵەکەی لە سایتی وەبەرهێنانەکانیدا بڵاو دەکردەوە، ژمارەکانی دووهێندەی ڕاستییەکان دەبوون! بەربانگێکی ڕەمەزانی بۆ سەد منداڵی بێباوک ساز دەکرد... لە ڕیکلامەکەدا: سێسەد منداڵ، لەگەڵ ئەمەیشدا بە هونەرەوە وێنەی دەگرتن بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر دەربخات!

لە ڕاستیدا: سەد سەبەتەی خۆراکی دابەش دەکرد بەسەر کەم دەرامەت و هەژاراندا... لە ڕیکلام: دووسەد سەبەتی خۆراکیی...

سەمیر باوکی بەبیر هاتەوە، کاتێک چۆن عاسمی برای بانگ دەکرد و کیسێک پڕ لە (برنج و شەکر و شیر و شوکولاتە)ی پێ دەدا و دەیوت:

- عاسم، بابە گیان، ئەم کیسە ببە بۆ ماڵی دایکی ڕەئفەت، بەڵام ئاممان کەس نەتبینێت.

دایکی ڕەئفەت بێ هاوژینبوو و مێردەکەی بە شێرپەنجە وەفاتی کردبوو، سێ منداڵی بۆ جێهێشتبوو. باوکی سەمیر بەشە خۆراکی بۆدەبردن و نەیدەویست کەس پێی بزانێت، عاسم هەموو چەند ڕۆژ جارێک دەچووە لای ماڵەکەی و سەیری ئەملا و ئەولای دەکرد، کە دڵنیا دەبوویەوە کەسی لێ نییە ئینجا کیسەکەی لەپێش دەرگاکەیان بەجێ دەهێشت، لە زەنگی ماڵەکەی دەدا و بە خێرایی پێش کردنەوەی دەرگاکە هەڵ دەهات. کاتێک سەرکەوتنی کارەکەی بە باوکی ڕادەگەیاند، باوکی خەندەی دەکرد و دەیوت:

- سوپاس بۆ خودا، خودایە سەدەقەیەک لە بەندەکەت قبوڵ بفەرموو کە خۆت پارەکەیت پێ بەخشیوە، هەر خۆت دەرهێنانەکەیت خوستوتەتە دڵیەوە.

سەمیر ئەم دیمەنە و ئەم وشانەی لەیاد بوو، بەڵام لە یادگەیدا دەری نەهێنا هەتا کارە خێرخوازییەکانی ئەبو عەزامی نەبینی کە کەڕەتی دوو و سێ دەکران بۆ بەرژەوەندییە بازرگانییەکانی...

ئەبو عەزام زانی چۆن کەم کەمە سەمیر ڕابهێنێت و دەستەمۆی بکات، سەرەتا شتێکی لە ڕاستییەکانی (ئاسانکاری) پێ وت، شتی زۆر خراپتری لێ شاردەوە، لە قۆناغی ڕاهێنانی سەمیر لەسەر بێدەنگبوون، لەم (ئاسانکاری)انە و چووە سەر قۆناغی هاوبەشی پێ کردنی لە هەندێکیان... هەنگاو بە هەنگاو، هەر کاتێک دەیبینی ڕاهاتبوو لە وازهێنان لە شتێک لە ئایینەکەی و بەهاکانی، بە نەرمی دەستی بە دەرهێنانی بەهایەکی تر دەکرد کە دایک و باوکی بە منداڵی تێیدا چەسپاندبوویان، وای لە سەمیر دەکرد هەوڵی بەرهەڵستی کردن ببێتە ئاڵۆزی و توندڕەوییەکی ناپێویست، بۆیە سەمیر ناوێرێت بەرهەڵستی بکات!

لەگەڵ دەرکەوتنی کاغەزەکانی ئەو گەڕان و سوڕانەی سەمیر و پاشان بەشداری پێکردنی، ڕێزی لەلای ئەبو عەزام کەم بوویەوە. سەمیر لە زۆر شت گوێڕایەڵی دەکرد و لە زۆر خوار و خێچی بێدەنگ دەبوو، بۆ ئەوەی ڕازیبوونی بەدەست بهێنێت، هەروەها بەردەوام بێت لە پشتگیری کردنی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە وای دەکرد لە چاوی ئەبو عەزام ببێتە ئامرازێکی شیاو بۆ بەکارهێنان، لە جیاتی ئەوەی ببێتە کەیانێکی سەربەخۆ و ڕێزی خۆی هەبێت!

زۆرجار ئەبو عەزام وای دەکرد سەمیر هەست بکات دەستکەوتەکانی بەپێی پێویست نین و پێشبینی دەرئەنجامی باشتری لێ دەکرد، تەنیا بۆ ئەوەی هەموو تواناکانی سەمیر بگوشێت...

سەمیر هەستی کرد کە وازهێنان لە پرەنسیپەکانی وای لێکردووە ڕێزی لەلای ئەبو عەزام نەهێشتووە، هەوڵیدا بیگەڕێنێتەوە و وای دەربخات کە خاوەن پرەنسیپە بۆ ئەوەی سەر لەنوێ ڕێز پەیدا بکات! جۆرێک لە بەرهەڵستی دەرخست لەسەر شتانێک بەم دواییانە ئەبو عەزام ڕایهێنابوو لەسەری، بەڵام هۆکاری ئەم بەرهەڵستییانە لای ئەبو عەزام ڕوون بوون، بۆیە هەرکاتێک سەمیر بەرهەڵستی دەکرد، بە خەندەیەکی ساختە و پێکەنینێک کە بەکەم زانینێکی تێدا بەدی دەکرا وەڵامی دەدایەوە، پاشان قسەی خۆی تەواو دەکرد وەک بڵێیت سەمیر هیچی نەگوتبێت.

سەرەڕای ئەو بێئاگاییە زۆرەی سەمیر و نوقم بوونی لە زەلکاوی ئەبو عەزامدا، یەک مەبدەئی هەبوو دەستی پێوە گرتبوو و تەواوی ئەم چەند ساڵە وازی لێ نەهێنابوو، ئەم مەبدەئە خێرایی داڕووخانی کەم دەکردەوە، مامۆستا زۆر پێداگری نەدەکرد لەسەری، بۆ ئەوەی نەفسە گلەییکارەکەی (نەفسی لەوامە) لەناکاو بەخەبەر نەیەت!

دەبێت ئەم مەبدەئە چی بێت؟

لـە دوای ئـەم پەرەسـەندنانە ژیانـی سـەمیر و حەنـان چـی بەسـەرهات؟

ئایـا سـەمیر بـۆ پاراسـتنی مافـی کارەکـەی لەگـەڵ ئەبـو عـەزام گەرەنتـی هەبـوو؟

با بەردەوام بین.

***



# ١١

# پاشماوەی فیترەت

سەرەڕای ئەو بێئاگاییە زۆرەی سەمیر و نوقم بوونی لە زەلکاوی ئەبو عەزامدا، یەک مەبدەئی هەبوو دەستی پێوە گرتبوو و تەواوی ئەم چەند ساڵە وازی لێ نەهێنابوو. سەمیر بە مەزن دانانی خودای هەبوو، ڕاستە ئەو بە مەزن دانانە لاوازبوو و ڕێگری لێ نەدەکرد لەوەی هاوبەشی تاوان نەبێت لەگەڵ ئەبو عەزامدا، پاڵنەر نەبوو بۆ بەردەوام بوون لەسەر نوێژەکانی، بەڵام لەوە دەترسا شتێک بکات پێی لە ئیسلام بچێتە دەرەوە.

ئەبو عەزام و زاهیر سوکایەتییان بە ئایین دەکرد، جارێکیان ئەم سوکایەتییەیان بە گاڵتەکردن لەلای سەمیر دەرخست، سەمیر لەمەدا موجامەلەی نەکردن، بگرە نێوچاوانی دا بەیەکدا و ناڕەحەتی دەربڕی و بابەتەکەی گۆڕی، بۆیە ئەوانیش وایان لێهاتبوو ئەم جۆرە گاڵتانەیان لەبەردەمی ئەودا نەدەکرد.

ئەم تۆوە چاکەیە کە تێدا بوو باوکی پارێزگاری لێ کردبوو. هێشتا بیری ماوە جارێکیان لەگەڵ باوکی چوونە خوانێک بۆ لای ئامۆزای باوکی (باوکی حلمی)، سەمیر لەوکاتەدا دە ساڵان بوو، لەسەر خوانەکە باوکی حلمی ویستی ئامادەبووان بخاتە پێکەنین و گوتی:

- ئایا گوێبیستی کۆتا نوکتە بوون؟ جوبرائیل دابەزی و چووە دوکانێک و...

سەمیر بیری مابوو چۆن یەکسەر ڕوخساری باوکی گۆڕا و قسەی باوکی حلمی بڕی:

- پەنا بەخوا باوکی حلمی، گاڵتە بەدین مەکە.
- باوکی سەعید تەنیا تۆ گوێ بگرە.
- نەخێر، بە شتێک پێ ناکەنین پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێ و پاشان لەسەری مشتومڕ بکەین ئایا ڕاستە یان هەڵە... خودا لێت ڕازی بێت... هەرچییەک بێ تەنیا توڕەیی پەروەرێنی جیهانیان نەبێ.

یەکێک لە ئامادەبووان هاتە ناو مشتومڕەکە وتی:

- باوکی سەعید ڕاست دەکات، ئەم شتانە مەخە ناو نوکتەوە. جوبرائیل فریشتەیەکی بەڕێزە و خودا لەسەری دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ١٩ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ٢٠ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ﴾

باوکی حلمی بێدەنگ بوو، وتی:

- أستغفرالله...

هەتا ئێستاش ئەم هەڵوێستە لە یادەوەری سەمیر هەڵکۆڵراوە، بە ڕووخسارە توڕەکەی باوکی و دەنگە بەرزەکەی و گوڕ تینی ئیمانی و غیرەتی بەرامبەر ئایینەکەی.

باوکی سەعید خاوەن زانست نەبوو، بگرە لە موسڵمانە سادەکان بوو، بەڵام ئەو خودای خۆش دەویست و بە مەزنی دادەنا.

سەمیر هەڵوێستێکی تری باوکی هێشتا لەبیر مابوو، ئەو پسوڵانەی ناوی خودای لەسەر نوسرابوون، پێش ئەوەی فرێی بدات ناوی خودای لێ دەکردەوە و دەیپاراست...

هێشتا ئەو فەرموودەیەی لەیاد بوو کە باوکی چەندین جار دەیوتەوە:

کە پێغەمبەر(ﷺ) باسی پیاوێکی کرد لە نەتەوەکانی ڕابردوو، کە خودا سامان و منداڵی پێ بەخشی بوو، کاتێک گەیشتە سەرەمەرگ بە منداڵەکانی وت: (چۆن باوکێک بووم بۆتان؟) وتیان: (باشترین باوک). ئەویش وتی: (دەی منیش هیچ کارێکم نەکردۆتە زەخیرە بۆ ڕۆژی دواییم لەلای خودا).

بۆیە وەسیەتێکی سەیری کرد بۆ منداڵەکانی وتی: (ئەگەر مردم، بمسوتێنن هەتا دەبم بەخەڵوز دواتر بمهاڕن، ئینجا ئەگەر ڕۆژێک بایەکی قایم هەبوو بمدەمە دەمیەوە فڕێدەن) واتە: خۆڵە مێشەکەم فڕێدەن بۆ ئەوەی بڵاو و پەرت بێ لەگەڵ باکەدا، ئەمە هەمووی لەبەرچی؟ وتی: (سوێند بەخودا، ئەگەر خودا بتوانێت زیندوم بکاتەوە، ئەشکەنجەیەکی وام دەدات کەسی وا ئەشکەنجە نەدابێت)!

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (لەسەر ئەمە بەڵێن و پەیمانی لێوەرگرتن، سوێند بەپەروەردگارم وایان کرد، لە ڕۆژێکدا کە بایەکی قایم هەبوو دایان بەدەم باکەوە. دواتر خودای گەورە فەرمووی: ببە، بویەوە پیاوەکە، خوای گەورە فەرمووی: بەندەی من بۆ وات کرد؟ وتی: لە ترسی تۆ! خودای گەورە بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی وەریگرت لە لای خۆی... واتە: ڕەحمەتی خۆی پێ گەیاند کاتێک ئەو وشەیەی وت.

هێشتا سەمیر بیری مابوو باوکی سەرەڕای توندییەکەی چۆن دەنگی پڕ لە گریان دەبوو و ڕوخساری ناسک دەبوویەوە هەر کاتێک ئەوەی دەوتەوە (خودا لێی خۆشبوو)، سەرەڕای دووبارەکردنەوەی فەرموودەکە لە چەندین بۆنەدا، چۆن پێی دەوتن: «ڕۆڵەکانم چ شتێک ئەم پیاوەی ڕزگار کرد؟ بە مەزن دانانی خودا. ئاگاداربن هەرچەندە هەڵەتان کرد ئەم پەتی ڕزگاربوونە بەر مەدەن، ڕێگە مەدەن هیچ کەسێک ئەم گەوهەرەتان لێ بفڕێنێت بە نوکتەیەکی پڕ

و پوچ، یان قسەیەکی بێ کەڵک کە پێی پێ بکەنن و مووجامەلەی بکەن و دوارۆژتانی پێ لەناو ببەن».

ئەم بەمەزندانانە لەلای سەمیر، سەرەڕای لاوازییەکەی، پەتێکبوو وای دەکرد پەیوەندی بە ئاینەکەیەوە هەبێت، وەکو پشکۆیەک کە کزبووبوو، بەڵام ئەگەری گەشانەوەی هەبوو، ئەبو عەزامیش خۆی لەم هێڵە سوورە نزیک نەدەکردەوە...

دوای چەندین مانگ لە تێوەگلانی سەمیر لە وەبەرهێنانەکانی تری ئەبو عەزامدا، بێجگە لە پێشانگای ئۆتۆمبێل، کاریگەری خستە سەر ژیانی سەمیر لەگەڵ حەناندا و دڵخۆشییان تێکچوو...

چونکە لەم چەند ساڵەدا سەمیر ئەو ڕاستییە تاڵەی بۆ دەرکەوتبوو کە: ئەبو عەزام لەبەر چاوەجوانەکانی، کچەکەی خۆی و ڤێلاکەی پێ نەداوە، لەبەر ئەوەش نەبوو کە خۆشی ویستووە و بە کوڕی خۆی داناوە، وەک چۆن سەمیر ڕۆژانێک وای خەیاڵ دەکرد! بەڵکوو بۆ ئەوەبووە ببێتە ئەنگوستیلەیەک لە دەستیدا و لە وەبەرهێنانەکانیدا بەکاری بهێنێت و بەپێی توانا سوودی لێ ببینێت. ڕێزی ئەبو عەزام لای سەمیر کەم بوویەوە، لەبەر ئەو نا ئەخلاقییاتەی لە (ئاسانکاری) و (بەرێکردن) بەکاری دەهێنا، هۆکارێکی تریش کە سەمیری زۆر بێزار دەکرد: سەمیر بە تێپەڕ بوونی کات بۆی دەرکەوت ئەبو عەزام سوورنەبوو لەسەر کۆتایی پێ هێنانی ئەو کێشانەی کە سەمیر بەدەستییەوە دەینالاند لەگەڵ زاهیردا، بگرە خۆشحاڵیش بوو بە بەردەوام بوونی بۆ ئەوەی بیانقۆزێتەوە! بە ئەنقەست بەراوردی دەکرد لە نێوانیان بۆ ئەوەی گڕ لە پەڕۆشی هەردووکیان بەردات، بۆ ئەوەی هەر یەکەیان باشترینی خۆیان پێشکەش بکەن، تەنانەت گەرچی ئەوە لەسەر دەروونیان و زیادبوونی ئیرەییشیان بووایە! ئەگەر هەستی کردایە

زیـان بـە بەرژەوەنـدی کارەکـە دەگەیەنێـت سـنووورێکی بـۆ ئـەو ڕق ئەسـتوورییەی نێوانیـان دادەنـا.

سـەمیر خـۆی و زاهیـری وەکـو دوو ئەسـپ (بگـرە وەکـو دوو کـەر) دەهاتـە پێش چاو کـە گالیسکەیەک ڕا دەکێشـن، ئەبو عەزامیش لەسـەرەوە بـە قامچییـەک لێیـان دەدات، بـۆ ئـەوەی خێراتـر و خێراتـر بـڕۆن!

هەروەهـا، بابەتـە داراییەکانـی نێـوان ئەبـو عـەزام و سـەمیر ڕوون نەبوو، سـەمیر ڕێژەی ٤٠٪ی هەبـوو لـە قازانجی پێشـانگای ئۆتۆمبێل، باشـە ئـەی ماندووبوونـی لـە بەدواداچـوون بـۆ کێڵگـەی پەلـەوەر؟ زنجیـرە چێشـتخانەکان و ژەمەخێـراکان؟ کۆمپانیـای بەڵێندەرایەتـی؟ پشـکەکانی کۆمپانیـای بیمـە؟ ئەبـو عـەزام زاواکـەی پەلکێش کـردووە بـۆ هاوکاریکردنـی لـە بەڕێوەبردنـی ئـەم بەرژەوەندییانـە، بـێ ئـەوەی ڕێـک بکـەون لەسـەر کرێـی سـەمیر بەرانبـەر ئـەو ماندووبوونانـەی تێیـدا دەیکات، ئایـا ئـەو شـەریکە؟ ئایـا ئـەو فەرمانبـەرە؟ هیـچ شـتێک لەسـەر کاغـەز دانەنـراوە! هەتـا ئێسـتاش پاداشـتی مـاددی لەبەرانبـەر ئەوانـەدا لـێ وەرنەگرتـووە.

ئەڵبەتـە کردنـەوەی ئـەم بابەتـە لەگـەڵ ئەبـو عەزامـدا سـەخت بـوو، چونکـە لـە ڤێـلا شـاهانەکەیدا دەژیـا بەبـێ بەرامبـەر و ئۆتۆمبێلێکـی (جیـپ)ی شاهانەیشـی بـۆ کڕیبـوو، گەرچـی هێشـتا هەلێـک نەڕەخسـاوە بۆئـەوەی بـە نـاوی سـەمیرەوە تۆمـار بکرێـت! ئەبـو عـەزام جـار جـارە سـوپرایزی بـۆ دەکـردن و بلیتـی بـۆ سـەمیر و هاوسـەرەکەی دەکـڕی بـۆ ئـەوەی گەشـتی شـوێنە گەشـتیارییەکان بکـەن، یاخـود ئـەو تەنەکـە ڕۆن و سـندوقە میـوە و کیسـە گۆشـتی بـۆ دەنـاردن، ئـەو ڕۆژەشـی حەنـان منداڵـی بـوو، ئەبـو عـەزام دەسـتپێشـخەری کـرد بـۆ پێدانـی خەرجـی نەخۆشـخانە، هەمـوو ماوەیەکیـش بڕێـک پـارەی دەدا بـە کچەکـەی.

لەبەرانبەر هەموو ئەوانەدا، پرسیاری سەمیر لە مامی ئەوەبوو: ئەی بەرامبەر ماندوو بوونەکانی من چی؟ دەبێتە پرسیارێکی ناشرین لە دیدی ئەودا! چونکە لەوە باشتر چی دەوێت؟ بەڵام ئەو لەگەڵ ئەوەشدا ئاسودە نەبوو لەبەر ناڕوونی کرێیەکەی لە بەرامبەر بەفیرۆدانی ژیانی بۆ وەبەرهێنانەکانی مامی.

بێجگە لە هەموو ئەوانە، سەمیر وای لێهاتبوو درەنگ لەسەر کارەکەی دەهاتەوە، تەنانەت زۆربەی ئەو کاتانەی لە ماڵەوەش بوو بە هەڵگرتنی پەیوەندی تەلەفوونی پەیوەست بە کارەکەیەوە بەسەری دەبرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک کێشە ڕووی دەدا کە تورەی دەکرد و کاتەکانی لەگەڵ حەنان تێک دەدا، لە هەموو ئەوانەدا سوربوو لەسەر ئەوەی لەبەردەم مامۆستادا خۆی بسەلمێنێت و زاهیر بخاتە پەراوێزە، زاهیریش لەژێرەوە کێشەی دەخستە کارەکانی سەمیرەوە، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک لە دوای خۆی جێ بهێڵێت، چونکە لە وانەی ڕابردوو کاتێک سەمیر بەڵگەکانی لەسەر کۆ کردنەوە پەندی وەرگرتبوو!

حەنان پیاوەکەی خۆی خۆشدەویست، داوای سۆز و خۆشەویستی لێ دەکرد:

- خۆشەویستم من و ئەشرەف چاوەڕێت دەکەین، وێنەکەتم لە سەر موبایلەکەم پیشانی ئەشرەفدا، خەندەی کرد و وتی: (بابە... بابە)، لەلای دەرگا ڕاوەستاوە و چاوەڕێت دەکات، کەی دێیتەوە؟

- هههههە... گیانەکەی منە بابە، باشە کەمێکی تر دەگەڕێمەوە.

لەماڵەوە پێی دەوت:

- خۆشەویستم، تکایە نامەوێت بە بێتاقەتی بتبینم، کاتێک لەگەڵ ئێمەیت دڵت لەلای ئێمە بێت و واز لە کارەکەت بهێنە.

سەرەتا سەمیر بەزەیی بە حەناندا دەهاتەوە کاتێک سۆز و خۆشەویستی ڕاستەقینەی لە چاوەکانیدا دەبینی، بۆیە وەڵامدانەوەی دەبوو، هێدی دەبوویەوە، بۆیە هەندێک جار موبایلی وەلا دەنا بۆ ئەوەی کات بە حەنان و ئەشرەف ببەخشێت.

بەڵام، بە تێپەڕبوونی کات شێوازی وەڵامدانەوەی گۆڕا:

- تکات لێ دەکەم وەرەوە، من و ئەشرەف بیرت دەکەین.

- بە بەرژەوەندییەکانی باوکتەوە سەرقاڵم.

لە ماڵەوە:

- تکایە موبایلەکە دابخە، دەمەوێ بۆ ئێمە بیت.

- «ناچارم، تاکو باوکت ڕازی بێت» بە زمانێک کە بێزاری پێیەوە دیاربوو، سەمیر پێشتر بە باوکی حەنانی دەوت: (مامم)... ئێستا: (باوکت)!

لە بەرامبەردا، حەنان تێبینی کرد ڕێزی مێردەکەی لەلای باوکی کەمی کردووە، هیچیشی لە دەست نەدەهات بەرامبەر تێکچوونی پەیوەندی هەردوو لایەن. وردە وردە ئەمیش بێزار دەبوو لە پەیوەندییەکەی لەگەڵ سەمیردا... بەڵام شتێک هەبوو پارێزگاری لە هەندێک سۆز و خۆشەویستی ئەم ماڵە کرد: حەنان بە کوڕی دووەمی سەمیر دووگیانە، لە مانگەکانی کۆتایی بە ئەنقەست وای دەر دەخست کە بێتاقەت و ماندووە و پێویستی بە ئاگا لێبوونە، بۆ ئەوەی سۆز و گرنگی پێدانی سەمیر بۆخۆی ڕابکێشێت... ئەویش بە سەختی خۆی لە گێژەڵوکەی کارکردن دەر دەهێنا بۆ ئەوەی هەندێک کات بۆ ماڵەوە دابنێت.

لە دوای سێ ساڵ لە دایکبوونی ئەشرەف، حەنان منداڵی دووەمی بوو... سەمیر بە کۆرپە تازەکەی خۆشحاڵ بوو...

بەڵام ئەوەندەی نەبرد ئەبو عەزام هات بۆ ئەوەی ئەم خۆشییە تێک بدات! هات بۆ نەخۆشخانە و بە سەمیر و بە حەنان و بە دایکی حەنانی وت: بڕیاری داوە کۆرپە تازەکە ناو بنێت صادق (ڕاستگۆ).

سەیر لەوەدابوو کە ئەبو عەزام بە خەیاڵیدا نەهاتبوو هیچ نەبێت پرسێک بە سەمیر بکات بۆ ناو لێنانی کوڕەکەی، یاخود لێی بپرسێت ئاخۆ ناوت بۆی ئامادە کردووە؟، چونکە ئەبو عەزام بێ ئەوەی هەست بکات وەکو بەشێک لە موڵکەکانی خۆی لە منداڵەکانی سەمیری دەڕوانی!

لەسەر هەژماری فەیسبووکی خۆی، وێنەیەکی بڵاوکردەوە لەو دەمەی کۆرپە نوێیەکەی بە پێکەنینەوە لە باوەشگرتووە، لەسەری نووسی: «نەوە تازەکەم، ناوم نا صادق (ڕاستگۆ) بۆ ئەوەی ڕاستگۆ بێت لەم سەردەمەی کە درۆ تێیدا بڵاوە، ئەوەش لە دوای ئەوەی نەوەی یەکەمم بە ئەشرەف ناو نا، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە شەرەف بکات لە سەردەمی فێڵ و هەڵخەڵەتاندن»... دواتر لایک و پیرۆزبایی کڕیار و هاوبەش و فەرمانبەرەکانی بۆ دەهات.

سەمیر درکی بەوە کرد مامۆستا خەریکە ناویان بۆ مەرامی بازرگانی خۆی بەکار دەهێنێت، بۆ ئەوەی لەناو ناسیاوەکانیدا ڕووی ڕاستەقینەی خۆی بشارێتەوە و وێنەی خۆی جوان پیشان بدات، سەمیر بیری لەوەکردەوە بەرهەڵستی بکات و بڵێت: «بەڵام من ناوێکم ئامادەکردبوو بۆ کوڕەکەم»، بەڵام ئەو وەکو سڕکراوێک وابوو بەرامبەر بەرهەڵستی کردنی ئەبو عەزام!

دکتۆر ئەمجەد پەیوەندی بە سەمیرەوە کرد... خوێندنی پزیشکی تەواو کردبوو و دەستی کردبوو بە پسپۆڕی وەرگرتن لە پزیشکی دەماردا، سەمیر وای زانی ئەمجەد بە هاتنی کۆرپەلە تازەکەی زانیوە... بۆیە بەلایەوە سەیربوو، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار لەگەڵ خوشک و

براکانیانیدا پەیوەندییەکەی لاوازبووبوو، بەهۆی زۆری سەرقاڵی و کێشەکانی، جەژنا و جەژن یەکترییان دەبینی، یان لە کاتی بازاڕکردندا یەکێکیانی بە ڕێکەوت دەبینی لە دوای چەندین مانگ دابڕان!

ئەوەی پەیوەندی زیاتربوو دکتۆر ئەمجەد بوو، بە نامەی واتسئاپ ئەحواڵی سەمیری دەپرسی، ئارامدەبوو لەسەر ئەوەی نامە و پەیوەندییەکانی پشتگوێ دەخست، بەردەوام دەبوو لە بەستنی پەیوەندییەکە تاکو سەمیر وەڵامی دەدایەوە... ئەمجەد سووربوو لەسەر ئەوەی لەگەڵ سەمیردا نێوانیان هەبێت گەرچی ئاوا بەلاوازییش بێت، هاوکات چاوەڕێی هەلێکی گونجاو بوو بۆ ئەوەی ئەو قسانەی دایکی پێش مردنی وتبووی پێی ڕابگەیەنێت، بۆ ئەوەی لە ژیانی سەمیر جیاوازییەک دروست بکات، بەڵام ئەم وشانەی هەڵ گرتبوو بۆ هەلێکی گونجاو، نەیدەویست لەدەمێکدا بیڵێت سەمیر لەغەفڵەتدا بێت و ئەم کارتە گرنگە بسوتێنێت، دواتر لە ناوەڕاستی سەرقاڵی و بێ ئاگاییەکەیدا لەناو بچێت، هێشتا دەرفەتی گونجاو نەهاتبووە پێشەوە... کەواتە ئەمجەد بۆچی پەیوەندی کرد؟

- سەمیر دەمەوێت بێیت بۆ شەکراوخواردنەکەم!
- ماشاءالله! کەی؟
- ڕۆژی هەینی داهاتوو کاتژمێر پێنج لە هۆڵی (النبلاء).
- جوانە، بەو بۆنەیەوە، کەمێک پێش ئێستا خودا کۆرپەلەیەکی پێ بەخشیم.
- ماشاءالله، چ ناوێکیت لێی نا؟

سەمیر بێدەنگ بوو و لە دڵی خۆی وتی: «چ ناوێکم لێی نا؟ بەداخەوە ئەوە من نەبووم کە ناوم لێی نا، خوشک و براکانم خۆیان ناو لە منداڵەکانیان دەنێن کەچی من»...

- ئەلو...

- ببورە، ناومان نا: صادق.
- ناوێکی جوانە... هەینی چاوەڕێتم و مژدەی کوڕپە تازەکەت بە خوشک و براکانم دەدەم.
- باشە، إن شاء الله، السلام علیكم.

ئەم کچەی دکتۆر ئەمجەد مارەی کردووە کێ بوو؟
پێش دوو هەفتە بە سەردان لە ماڵی تالەبوو:
- تالە... لە چواردەورت بووکێک هەیە بۆ گەنجێکی بەڕێز بەتەواوی لە من بچێت؟
تالە بە گاڵتەوە وتی:
- لەتۆ بچێت یان بەڕێزبێت؟
ئەمجەد خەندەی کرد:
- خوشکی گەورەمیت و ناتوانم وەڵامت بدەمەوە.
- قوتابییەکم هەیە لە کۆرسی پەروەردە، بە ڕەوشتە دیندارە و جوانترین شتی دڵ ناسکییەکەیەتی، زوو فرمێسک دەڕێژێت.
چاوانی ئەمجەد بریسکانەوە:
- جوانە؟
- جا تۆ کارت چییە؟ ئەمە پرسیاری هاوڕێ بەڕێزەکەتە ئەوەی بە تەواوی لەخۆت دەچێت.
- تەلول... تۆ دەزانیت مەبەستم کێیە.
- باشە لە سەرەتاو بێ ئەملا و ئەولا وابڵێ هەی ساختەچی.
- ئحم ئحم، دکتۆرێکی گەورە و گرانم کەچی پێم دەڵێیت: ساختەچی؟!
- ببورە، مەبەستم: دکتۆر ساختەچی.
ئەمجەد لەگەڵ تالە چووە ماڵی قوتابییەکەی، (جومان)، لەگەڵ ئەو و کەس و کاریدا دانیشتن... بوو بە قسمەت.

دوای دوو مانگ سەمیر لە زەماوەندی ئەمجەدی برای ئامادەبوو، کەشێکی کامەران بوو، وای لێکرد بیرێک لە دۆخی خۆی بکاتەوە... چۆن؟

چۆن ئەوەی دەیویست بەدەستی هێنا و لە هەمان کاتدا بەدەستی نەهێنابوو؟!

ئەی ئەو ڕووداوە گەورەیە چییە کە کاریگەری دەخاتە سەر ژیانی سەمیر؟

با بەردەوام بین.

***



# ١٢



## ئاوێک کە تینوێتی ناشکێنێت

لـە زەماوەنـدی ئەمجـەد، سـەمیر چـاوی بـە خوشـک و براکانـی و منداڵەکانیـان کـەوت... هەمـووان دڵخـۆش بـوون... لەخـۆی پرسـی: «بۆچـی لـە مـن خۆشـحاڵترن؟ بۆچـی ئاسـودەیی و ئارامییـەک لـەوان دەبینـم کـە لـە خۆمـدا نییـە؟ هەمـوو ڕۆژێـک لـە بەیانییـەوە دەردەچـم تاکـو شـەو، بـۆ ئـەوەی تەمەنـم تەرخـان بکـەم بـۆ بەرژەوەندییەکانـی ئەبـو عـەزام (زەوییەکانـی بەمـن دەکێڵێـت)، ناشـزانم لـە کۆتاییـدا چ خەڵاتێکـم بـۆ هەیـە... باشـە گـەر ئـەم پیـاوە بمرێـت، لـەم هەمـوو وەبەرهێنانـەدا چـی دەبێتـە بەشـی مـن؟ پارەکـە بـۆ منداڵەکانـی دەڕوات و منیـش بەفیڕۆدانـی تەمەنـم بـۆ دەمێنێتـەوە! هەژمـاری بانکیـم مـاوەی زیاتـر لـە سـاڵێکە زیـادی نەکـردووە، لەبـەر ئـەوەی مـن بـە پێشـانگاوە سـەرقاڵم، دەمەوێـت شـتێک بـۆ داهاتـووم بونیـات بنێـم...»

پێشـانگای ئۆتۆمبێل تاکە شتە سەمیر ڕێژەیەکی ڕوونی قازانجی تێیدا هەیە، هەربۆیە سـەرلەنوێ سـەرنجی خستەوە سـەر پێشانگاکە، لە دوای ئەوەی ئەبو عەزام سـەرقاڵی کردبوو بە وەبەرهێنانەکانییەوە، ئەگەر مامۆستا پرسیاری دواکەوتنی لـە بەڕێوەبردنی کارەکانی تردا لێ بکردایە، دەیوت:

- ئەمرۆ بە پێشانگاوە سەرقاڵم، سبەی دەچم بۆ کاروباری زنجیرە چێشتخانەکان... پێشانگا ئەمرۆ کاتەکانی لێبردم، سبەی کات ڕێک دەخەم بۆ دەستختنی عەلەف بۆ کێڵگە پەلەوەرییەکە.

دواتر سەمیر سووربوو لەسەر هاوردەکردنی ئۆتۆمبێلی دەستی دوو لە جیاتی مامەڵەکردن بە دەستی دووی ناوخۆ، مامۆستا حەزی بەمە نەبوو، چونکە ئەوە سەمیری ناچار دەکرد گەشت بکات و ئاگای لە وەبەرهێنانەکانی تر نەمێنێت...

مامۆستا هەوڵیدا حەماسی سەمیر گڕ بدات بە لێدان لە ژێی کێبڕکێی لەگەڵ زاهیردا:

- لەبەر ئەوەی تۆ سەرقاڵیت، بەدواداچوونی بەڕێوەبردنی کۆمپانیای بیمە ڕادەستی زاهیر بکە.
- باشە، دوو سبەی لەگەڵی کۆ دەبمەوە بۆ ئەوەی کلیلەکانی ڕادەست بکەم و بۆی ڕوون بکەمەوە.
- چاکە، بەڵکو ئەو شتێک بەدی بهێنێت کە تۆ نەتتوانیوە بەدی بهێنیت.
- منیش ئەوەی بۆ دەخوازم، با بەشتێکەوە سەرقاڵ بێ لە جیاتی ئەوەی فرت و فێڵ بکات.

مامۆستا بە وەڵامی سەمیر شۆک بوو، درکی بەوە کرد کە سەمیر خەریکە هەست بەفێڵەکەی دەکات، زانی پێویستی بەوەیە هەندێک هەست بە سەربەخۆیی بکات، بۆیە بڕیاریدا ئەم سەربەخۆییە خەیاڵییە ببەخشێت بە زاواکەی مادام هەمووی هەر دەڕژێتەوە ناو بەرژەوەندییەکانی، بۆ ئەوەی سەمیر لەژێر کۆنترۆڵیدا بمێنێتەوە!

سەرخستنی پێشانگا، گەشت کردن بۆ هاوردەکردنی ئۆتۆمبێل، لەگەڵ سەرقاڵ بوون بە وەبەرهێنانەکانی تری ئەبو عەزام، تەنانەت

گەر بە دیاری کراویش بێت، دیسانەوە سەمیری لەماڵەکەی سەرقاڵ کرد، صادقیش ئەو تۆزە گرنگی پێدانەی دەست نەکەوت کە بە بچوکی بە ئەشرەف درا...

ئەو دەمەی ئەشرەف دەیوت باوکم کەی دێتەوە، حەنان تەلەفونی بۆ سەمیر دەکرد و دەیدایە دەستی ئەشرەف قسە بکات، بۆ ئەوەی سەمیر سۆزی بۆی بجووڵێت، سەمیریش دەیوت:

- «باشە باوەگیان، دێم و دەتبەم بۆ باخچە»... درەنگ دەهاتەوە و خێزانەکەی بەپەلە دەبرد و خەیاڵی لە شوێنێکی تربوو... دواتر وای لێهات کە دەهاتەوە ئەشرەف و صادق نوستبوون، ئینجا وای لێهات زۆربەی پەیوەندییەکانی ئەشرەف و حەنانی هەڵ نەدەگرت.

پشووی کۆتایی هەفتە بە دەگمەن دەبووە پشوو بۆ سەمیر...

- بابە، وەرە یاریمان لەگەڵ بکە..

- ئێستا سەرقاڵم خۆشەویستم، کەمێکی تر دێم...

ئەشرەف دوای چەند خولەکێک دەهاتەوە...

- بابە چاوەڕێمان کردیت و نەهاتیت!

- باوەگیان چەن خولەکێک، ئێستا لێم گەڕێ، خەریکی حیساباتم، هەر کاتێک دێیت لێم تێک دەدەیت...

داماوە دوای دەمێکی تر دەهاتەوە:

- «باوەگیان دوایی؟»... «ئەشرەف بەسە، کەی تەواو بووم خۆم دێم بۆ لاتان...»

سەمیر تێبینی ئەوەی نەکرد کاتێک هاواری کرد: «ئەشرەف بەسە»، داماوە لە ترسا گیانی دەلەرزی، ڕۆیشت و نەگەڕایەوە!

بە تێپەڕبوونی کات، سەمیر سۆزی لاواز بوو بەرانبەر کوڕەکانی، کاتێک بانگی ئەشرەف یان صادقی دەکرد، وێنەی مامۆستا دەهات بەخەیاڵیدا، کە ناوی کوڕەکانی بەکارهێنا بۆ ئەوەی ناشرینییەکانی

خۆی پێ جوان بکات! هەستێکی نادیاری بۆ دروست دەبوو، وەک بڵێیت ئەم کوڕانەی هیی ئەو نییە!

گلەیی کردنی حەنان بە سۆزەوە و تکا کردنی بۆ گرنگی پێدانی زیاتر، دەستی بە هەڵگەڕانەوە کردبوو بۆ بێزاربوون و دەمەدەمەکردن لەبەردەم دوو کوڕەکەیاندا:

- درەنگ دێیتەوە و بەلای موبایل و لاپتۆپەکەتەوە دادەنیشی، منیش ئەشرەف خەمبارم دەکات، گوێ لە قسە ناگرێت و پێویستی بە هاوکاری کردنە لە خوێندنەکەیدا.

- بە بەرژەوەندییەکانی باوکتەوە سەرقاڵم...

- بەم شێوەیە باسی باوکم مەکە، ئەوەی باوکم بۆ تۆی کرد هیچ کەسێک بۆ زاواکەی نەیکردووە.

سەمیر چاوەکانی لەسەر لاپتۆپەکە هەڵگرت و بە توڕەییەوە سەیری کرد:

- باوکت چی بۆ کردووم؟ باوکت بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکارم دەهێنێت، بەدەم بیرکردنەوە لێیان و کارکردن لەسەریان بەخەبەر دێم و دەخەوم، لەبەرامبەرچیدا؟

- بەرامبەر ئەو خۆشییەی ئێستا تێیداین.

- ئەو خۆشییە بەناوی کێوەیە؟ لە هەموو ئەوانە کامیان بۆ منە؟ تەنانەت تۆش وات لێهاتووە منەتم بەسەردا دەکەی؟!

حەنان دەمێک لێی گەڕا و پاشان گەڕایەوە:

- سەمیر خۆشەویستم، مەبەستم ئەوە نەبوو منەتت بەسەرا بکەم، بەڵام تۆ کاتێک بەم شێوەیە باسی باوکم دەکەیت شەرمەزارم دەکەیت... تکایە مەمخەرە ناو کێشەکانی خۆت و باوکم.

- باشە...

- وەرە لەلامان دانیشە.

- کەمێکی تر دێم.

نیـو کاتژمێـر تـێ دەپەڕێـت و حەنـان چاوەڕێیـە... دواتـر سـەمیر دێت و منداڵەکانیـش دەمێکـە خەوتـون... حەنـان موبایلـی لـە دەسـتە، سـەمیر هەندێـک قسـەی لەگـەڵ دەکات و تۆزێـک دڵـی لێـی شـکاوە، پاشـان دەخـەون...

بە تێپەڕبوونی کات ئەشرەف و صادق لە بازنەی سەرنجی دایکییان دەچوونـە دەرەوە، هـەر وەک چۆن لـە بازنـەی سـەرنجی باوکیشیان چووبوونـە دەرەوە، سـەمیر کاتەکانی بـۆ پێشـانگاکە تەرخانکرد بۆ ئـەوەی بوونـی خـۆی بسـەلمێنێت، حەنانیش وای لێهاتبـوو سـەرقاڵی ئەوەبوو بوونی خۆی بسەلمێنێت لە ڕێگەی بەدەستهێنانی فۆلۆ و لایکی زیاتر لـە تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، هەروەهـا لەگـەڵ هاوڕێکانیدا کاتی بەسـەردەبرد، چیدی کـوڕەکان پڕۆژەی سـەرکەوتنی کەسیان نەبوو. بۆ ئـەوەی ڕزگاریان بێـت لـە بێزارکردنیـان، وایـان لێهاتبـوو زۆربـەی کات لێیان دەگەڕان لەسـەر ئامێرە ئەلکترۆنییەکان کات بەسـەر ببەن، هەریەکیان تابلێت و موبایلی خۆی هەیە، پلەی ستەیشنیشیان هەیە.

بـرا بچوکەکـەی حەنـان، ئەشـرەفی لەگـەڵ خـۆی دەبـرد بـۆ کۆبوونـەوەی هاوڕێکانی و بۆ زانکۆش -لـە کاتی پشـووی قوتابخانـەی ئەشـرەف- خـۆی بـە جوانـی خوشـکەزاکەیەوە هـەڵ دەکێشـا و سـەرنجی کچـە هاوپۆلەکانـی زانکـۆی ڕادەکێشـا، وەسـفی جوانـی ئەشـرەفیان دەکـرد، ئەشـرەفیش سـیفەتی نەرێنـی لـە هاوڕێکانـی خاڵیـەوە وەردەگـرت، خـودی سـەمیر ئـەوەی بـەدڵ نەبـوو، بـەڵام بێدەنـگ دەبـوو، چونکـە ئـەوە هەندێـک کەلێنـی بـۆ پـڕ دەکـردەوە کە دایـک و باوکـی دروسـتییان کردبـوو.

لـە تەمەنـی شـەش سـاڵیدا، قوتابخانەکـەی تێبینییـان هەبـوو لەسـەر ئاسـتی صـادق، دایـک و باوکـی بردیانـە سـەنتەرێکی پسـپۆڕ

بۆ هەڵسەنگاندنی و دیاری کردنی گرفتەکەی، کەسێکی زەنگین و بەئەزموون خاوەنداریەتی دەکرد... تێبینی کرد سەمیر لە کاتی دانیشتنی دەستنیشانکردنەکە لە جیاتی ئەوەی تەماشای ئاستی کوڕەکەی بکات، کەچی هەر بە موبایلەوە سەرقاڵە، بۆیە لە دڵی خۆیدا وتی: «باوکەکە پێش کوڕەکە پێویستی بە چارەسەرە!»...

سەمیری بردە لایەک و پێی وت: کە صادق دەناڵێنێت بە دەست سەختی فێر بوون و نەمانی سەرنجەوە، هۆکاری سەرەکی نەمانی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی چالاکە لەگەڵ دایک و باوکیدا، هەروەها بەرکەوتن لەگەڵ ئامێرە ئەلکترۆنییەکاندا هۆکارێکی ترە. پێویستی بە دانیشتنی چارەسەری پیشەیی هەیە، سێ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا... بەڕێوەبەرەکە بێدەنگ بوو، چاوی خستە سەر سەمیر و بە زمانێکی بەزەی پێداهاتنەوە وتی:

- پێویستە زیاتر پەیوەندیتان هەبێت لەگەڵ کوڕەکەتاندا.

سەمیر شۆکبوو...

- کوڕەکەم بە سەختی فێر دەبێت؟

لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ڤێلاکە، لۆمەکردن لەنێوان حەنان و سەمیر دروست بوو، هەریەکە و لەم کێشەیەدا بەرپرسیارییەتییەکەی دەخستە سەر شانی ئەوی تر...

سەمیر دەستی صادقی گرت، بەدەم سەرکەوتن بەسەر قادرمەکانی ڤێلاکە، بە بەزەییەوە سەیری دەکرد و بڕیاریدا زیاتر گرنگی پێ بدات...

بەڵام وەک هەموو جار، ئەم بڕیارە هەڵچوونێکی حەماسی کاتی بوو... لەگەڵ دەرچوونی کوڕەکەی لە بازنە سەرنجەکانی، سەمیر بەهەرەی پەیوەندی بەستنی لەگەڵیان لە دەست دابوو، هیچ خۆشییەکی نەدەبینی لە قسەکردن لەگەڵیان و یاری کردن لەگەڵیان.

گەورەبوون، هەوڵدان، کەوتن، سەرکەوتن، هەڵەکردنیان لە هەندێک وشەدا... هەموو ئەوانە تێ دەپەڕین و سەمیر مێشکی سەرقاڵ بوو، تەنانەت زۆری لەخۆی دەکرد بۆ ئەوەی لەگەڵیان دابنیشێت و یارییان بۆ بکات، چونکە زۆر بەسادەیی ئەوان بەشێک نەبوون لەو پرۆژە سەرکەوتنەی کە مێشکی داگیر کردبوو...

پشووەکان وەکو هەناسەدانێک وابوو بۆ سەمیر و خێزانەکەی تێیدا کۆ دەبوونەوە بۆ ئەوەی کاتێکی کەمێک خۆش بەسەر ببەن... بەڵام خاڵی نەبوو لە شڵەژان و لۆمەکردن و پەیوەندیی پەیوەست بە کارەکەیەوە، هەر زوو کاریگەرییە جوانەکەی نەدەما کاتێک سەمیر دەگەڕایەوە سەر کارەکەی.

لەدوای ئەوەی سەمیر تەواوی تەرکیزی خستە سەر پێشانگا، هەر بە ڕاستی پێشانگاکە بوژایەوە و هەژماری بانکییەکەی زیادی کرد، بەڵام ئەوەی سەیر بوو هەژمارە دەروونییەکەی هەر کەم دەبووەوە!

سەمیر نەیتوانی لە هۆکارەکەی تێ بگات، هەموو شتێکی ماددی جوان لە ژیانی سەمیردا هەبوو: ڤێلایەکی جوان، ئۆتۆمبێلی جوان، ئۆفیسی جوان، پێشانگای جوان و دوو منداڵی جوان، گەشت بۆ شوێنە گەشتیارییە جوانەکان و بەم دواییانەش: هەژماری بانکی جوان... بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ژیانی جوان نەبوو! سەرەڕای ئەوەی لە منداڵییەوە وانەکانی پشتگوێ خستبوو، بەڵام کێشەی نەبوو لە بنەماکانی بیرکاریدا، بەتایبەت گەر لە کارەکەیدا پێویستی پێی بوایە، بەڵام لەم هاوکێشەیە تێ نەدەگەیشت:

چۆن دەکرێت کۆی ئەو شتە جوانانە ژیانێکی جوان نەبێت؟

لەو ژیانە ماددییەی سەمیر خۆی تێدا نوقم کردبوو، وشەی بەرەکەت هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات و نەدەهاتە بیری کە لەگەڵ هاوکێشەکانی لێکی بداتەوە!

ئەو ڕۆژەی لە خوێندنەوەی ئیمامەکە ئاگاداربوویەوە -ئەو بەیانییەی دایکی وەفاتی کرد- کاتێک ئیمامەکە ئەم ئایەتی خوێندەوە: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا﴾ واتە: ئەو بێ باوەڕانە حەزیان لە ژیانی دونیای تەمەن کۆتاییە، کە زۆر بە خێرایی تێدەپەڕێت، ڕۆژێکی زۆر سەخت و سەنگین پشتگوێ دەخەن و هیچ کارێکی بۆ ناکەن و بڕوایان پێی نییە.

درکی بەوە کرد لە خودا بێ ئاگا بووە، پاشان خۆی سڕکرد بەوەی کە پێویستە لە دونیادا سەرکەوتن بەدەست بێنێت، پاشان ڕووبکاتە خودا، ئەوێ ڕۆژێ موڕاعاتی ئەوەی نەکرد کە ساتەکانی بە ئاگاهاتن شتێک نییە هەر کاتێک بمانەوێت بە دوگمەیەک ئامادە ببێتەوە! بەڵکو خودا پێت دەبەخشێت، گەر نەیقۆزینەوە لەبیری دەکەین، لەگەڵیدا خۆشمان لەبیر دەکەین.

هەستی بێ ئومێدی و لاوازبوونی پاڵنەرەکانی زیاتربوون... چونکە پەرۆشی و تێکۆشانی لە کارەکەیدا پاڵنەری هەبوو: «نامەوێت لە خوشک و براکانم کەمتربم، نامەوێت بە شکست خواردوو وەسف بکرێم، دەمەوێ پێگە و پارەم هەبێت، دەمەوێ ژیانێکی خۆش بژیم...»

ئەوەی دەیویست بەدەستی هێنابوو و لە هەمان کاتدا بەدەستی نەهێنابوو! ئەو ئارەزووانەی بەدی هێنا، کە وایدەزانی گەرەنتی بەختەوەری بۆ دەکات، بەڵام موفاجەئەکە ئەوەبوو کە بەختەوەری نەکرد!

وا هەستی دەکرد وەک کەسێکە بە تینوێتی و ماندوێتی لە بیاباندا دەڕوات، ئینجا مێرگێک دەبینێت، پێی دەگات، دەبینێت سەراب نییە، هەر بەڕاستی ئاوە... بەڵام سەیرەکە لەوەدایە هەر دەخواتەوە و دەخواتەوە و تینوێتی ناشکێت!

ڕق لێبوونەوە لە زاهیر و هەوڵدان بۆ سەلماندنی خۆی وەکو پاڵنەرێک بەس نەبوو بۆ ئەوەی چیدی بەردەوام بێت لە تێکۆشانی چەند هێندە. بۆیە هیمەتی لاواز بوویەوە دیسانەوە نیشانەی ئارامنەگرتنی لێ بەدەر کەوتەوە. چارەسەرکردنی بۆ کێشەکان، ئەو کێشانەی ئەبو عەزام خستبوویە ئەستۆی، هەندێک جار چارەسەرێکی ڕووکەشی بوو، نزیک بوو لەو چاککردنەوە ڕووکەشییەی کە بەهۆیەوە برەوی دا بە فرۆشتنی یەکەم ئۆتۆمبێلی بە عەلی داماو، چارەسەرەکانی چارەسەری ڕیشەیی نەبوون لەسەر بنەمای بیرکردنەوەیەکی لەسەرخۆ و خەیاڵکردنێکی ئارامگرانەبێت.

پەککەوتەکانی ئەم چاککردنەوە ڕووکەشییانە لەلای ئەبو عەزام دەستی بە دەرکەوتن کرد، ئەوەش وایکرد بێزاری بکات و پەیوەندیی لەگەڵ سەمیردا بەرەو خراپتر بچێت...

بە کورتی ژیانی سەمیر وەکو دەستبەندێک وایە پچڕا بێت و مووروەکانی پەرش و بڵاو بووبنەوە، ﴿ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴾ کارەکانی لەسنوور دەرچووە...

دوای یانزە ساڵ لە هاوسەرگیرییەکەی سەمیر، دوای ئەم وشک و وێڵ بوونە لە ژیانیدا کە وای کرد بچێتە وەرزێکی پاییزی دوور و درێژەوە، لەژێر سێبەری خانەوادەیەکی پەرت و بڵاو و پەیوەندییەکی هاوسەرێتی کە چاک و خراپ دەبوو، نەمامێک لە بیابانی ژیانیدا ڕووا... ئەو دەمەی هاوسەرەکەی کچێکی بوو.

ئەم جارەیان سەمیر چاوەڕێی هەڵقورتانی مامۆستای نەکرد لە ناونانی منداڵەکانی، بەڵکو لەو ڕۆژەوەی زانی دایکی پێی دووگیانە و کچیشە... ناوی نا: (ئیناس) ئەم ناونانە دەربڕینێک بوو لەوەی کە لەم ژیانە لێی بێبەشە و ئەو بارودۆخە بێ سۆزەی تێیدا دەژییا.

ئەم ئیناسە دەبێتە خاڵی جیاکەرەوە لە ژیانی سەمیردا،
ئاخۆ دەبێ بۆچی وابێت؟
چۆن دڵی باوکی ڕاکێشا و ژیانی سەر لەنوێ بووژاندەوە؟

با بەردەوام بین...

***



# ١٣

## ئەو گوڵەی لە بیاباندا ڕووا

سـەمیر دڵی پەیوەست بوو بە ئیناسـەوە، خۆشەویستییەکی بۆی هەبوو کە بەرامبەر دوو کوڕەکەی تر هەستی پێ نەکردبوو، بگرە بەرانبەر هیچ مرۆڤێک هەستی پێ نەکردبوو... لەدایکبوونی ئیناس شتێک لـە سـۆز و بەزەیـی گەڕانـدەوە نێـوان ئـەو دوو هاوسـەرە، سـەمیر وای لێهاتبـوو زوو دەگەڕایـەوە ماڵـەوە بـۆ ئـەوەی ئینـاس ببینێت.

ئەو بەتەنیا وا نەبوو، بەڵکوو هەمـوان ئیناسییان خۆشدەویست: ئەبو عەزام و سۆزانی هاوسـەری، ئەشرەف و صادق، و خزمەتکاری ڤێلاکـە... تەنانـەت سـەمیر ئەوەندە پێی خۆشـحاڵ بوو، بۆ یەکەمجار دوای چەندیـن سـاڵ خوشـک و براکانـی بانگێشـت کـرد بـۆ ماڵەکـەی بۆ ئـەوەی لـە خۆشـحاڵییەکەیدا بەشـداربن! ئەوانیش وەڵامدانەوەیان هەبـوو بـۆ بانگهێشـت کردنەکـەی و بـۆ یەکـەم جـار هەسـتیان کـرد کەسێک لەلایەنی سـەمیرەوە بەشێکیشـە لـەوان!

ئـەو بچکۆلانەیـە دەسـتی بـە گـەورەبـوون کـرد و خۆشـەویسـتی سـەمیر بەرامبـەری ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ گـەورەتـر دەبـوو بـۆی، ئینـاس وەکـو چڵێکـی سـەوز وابـوو کـە لـە دارێکـی وشـکبووەوە ڕواوە، هـەر کەسێک سـەیر ئـەو دارەی بکردایـە وای دەزانـی مردووە... بۆ سـەمیر ئـاوا بـوو، لـە ژیانـی سـەمیریشـدا ئـاوا بـوو.

سپی پێست، قژ و چاوەکانی قاوەیی، وەک بڵێی پاکی هەموو منداڵەکان لە پێکەنینەکەی و ڕوخساریدا کۆبۆتەوە... گەر لێی بپرسن ناوت چییە؟ بە شەرمەوە سەری دادەنوێنێت و دەچێتە پشت باوکی و بە دەنگێکی نزمەوە دەڵێت: (ئیناس).

لەتەمەنی چوارساڵیدا، باوکی هەر کاتێک هەستی بکردایە ناتوانێت لێی دابڕێت، لەگەڵ خۆی دەیبردە سەر کارەکەی! هەر کەسێک دەیبینی خۆشی دەویست، بەبێ مۆڵەت وەرگرتن هەموو دڵەکانی دەبڕی، تەنانەت زاهیریش! دوژمنە سەرسەختەکەی سەمیر، بێ ئەوەی هەست بکات بۆی پێ دەکەنی، ئیناسیش بۆی پێ دەکەنی، لەو ساتانەشی باوکی سەرقاڵ دەبوو، لەگەڵی دەدوا یان پارچە شیرنییەکی پێ دەدا...

دکتۆر ئەمجەدی مامیشی خودا کچێکی پێ بەخشی(فاتیمە)، ئەویش ئێستا لەتەمەنی ئیناسدایە، چوار ساڵ، بۆ هەر یەکێکیشیان بووکەڵەیەکی کڕیوە بەقەد خۆیان دەبێت، بەهەمان شێوە سپی و چاو قاوەیی.

ئیناس دڵی سەمیری بەدەست هێنا... ژیانی گەڕاندەوە بۆ ماڵە وشکەکەی... بەیانیان لەدوای ئەوەی لەخەو هەڵدەستێت بەدەم لە باوەشکردنی بوکەڵەکەیەوە دێت و باوکە سەرقاڵەکەی بە لاپتۆپ ڕا دەچڵەکێنێ، لەبەردەمیدا ڕا دەوەستێت، چاوەڕێی پێشوازی و ئەحواڵپرسینی لێ دەکات، وەک چۆن هەموو جار وا ڕاهاتووە، بەو خەندە سەرنج ڕاکێشەی و ئەو ڕوخسارە گەش و ڕووناکەی کە تیشکی خۆر لە پەنجەرەکەوە لێی دەدا، گرتنی بووکەڵەکەی بەم شێوەیە، وای لێ دەکرد هەست بە بەزەیی و پێویستی بۆ سۆز و گرنگی پێدان بکات، باوەشی پیا دەکرد و ماچی دەکرد و دەستی بەسەر قژی دادەهێنا بۆ چەن خولەکێک، وزەی تەواوی ئەو ڕۆژەی دەدا بەسەمیر.

سەمیر لەسەر نانی بەیانی هەڵدەستێت بەرەو ژووری ئۆفیسەکەی لە ڤێلاکە، بۆ ئەوەی هەندێک لە کارەکانی جێبەجێ بکات پێش چوونە پێشانگا، ئەوسا ئیناسیش لەپێش دەرگای ئۆفیسەکە دەوەستێت و دەستەکانی و قاچەکانی دەکاتەوە بۆ ئەوەی ڕێی چوونە ژوورەوەی لێ بگرێت:

قەدەغەیە... وەرە یاریم لەگەڵ بکە.

سەمیر خەندە دەکات و ئاوات دەخوازێت بیتوانیایە دڵی شەق بکات و ئیناسی لەناو دابنێت!

- خۆشەویستەکەم کارم هەیە...

- کار کار کار! بەسە... دەبێت یاری لەگەڵ من بکەیت.

گەر لە ماڵەوە ئامادەنەبوونی درێژەی بکێشایە،

خۆی دەچوو بۆ لای ئۆفێسەکەی:

- بابە، وەرە چیرۆکم بۆ بخوێنەوە...

- باشە بابە، پێنج خولەکی تر...

- پێنج کولەخی ترت بۆ دەژمێرم و پاشان دێم، باشە؟

- هههە پێی دەڵێن خولەک خولەک، نەک کولەخ.

ئیناسیس هەوڵ دەدات:

- کولەخخ کوولەخخ، دوای پێنج کولەخ دێم، ئاوا؟

- پشت بەخودا ئەزیزم.

ئیناس دەڕوات:

صادق کاتێک پێنج کولەخ تێ دەپەڕێت پێم بڵێ.

صادق پێ دەکەنێت...

زوو زوو ئیناس لە صادق دەپرسێتەوە:

- پێنج کولەخەکە تێپەڕی؟

- هێشتا نا.

- (ئۆۆۆۆف) ئینـاس دەسـتەکانی بـە بێزارییـەوە دەکاتـەوە لەدەسـت ئـەو مـاوە درێـژەی باوکـی دوای خسـتووە...
- ئیناس، ئەوە پێنج کولەخەکە تێپەڕی..

ئیناس بەخێرایی چوو بۆ لای سەمیر:
- هەستە، چیرۆکم بۆ بخوێنەوە...
- کەمێک بوەستە ئازیزەکەم!
- نەخێر، نابێت... وەرە... داوای مافی خۆی نەدەکرد لەباوکی وەک چۆن پێشـتر ئەشـرەف دەیکـرد، بەڵکوو خـۆی دەسـەپاند بەسـەر سـەمیردا... بە زۆر سـەمیری هەڵدەسـاند، ئەویش ئیناسـی هەڵدەگرت و ماچـی دەکـرد، ئیناسـیش بـەم سـەرکەوتنە پێدەکەنـی و زۆر دڵـی خۆشبوو...

ئەشرەف، کە کوڕێکی چواردەساڵانە، لەژێر کۆنترۆڵ دەرچووبوو، داوای لەدایک و باوکی نەدەکرد گرنـگی پێ بدەن، بەڵکوو زۆر بـە کەمی گوێڕایەڵی دەکردن ئەگەر پێیان بوتایە وەرە لەگەڵمان دانیشـە یان لەگەڵمـان وەرە دەرەوە، زۆربـەی کاتەکانی لەگـەڵ موبایلەکـەی و هاوڕێکانیدا بەسـەر دەبرد.

صادقیش کوڕێکی یانزە سـاڵە، ئێسـتا بـە ئاسـانی تێدەگات و فێر دەبێت و ڕزگاری بـووە لـەوەی بـە قورسـی فێر ببێت، لەگـەڵ دایک و باوکی و ئێناسـدا دەچێت بۆ هەندێک لـە دەرچوون و گەشـتەکان... ئـەو دەمـەی سـەمیر هەسـت دەکات صـادق تەماشـای دەکات کە یـاری بۆ ئیناس دەکات، زۆر لەخۆی دەکات و هەندێ گرنگی بەویش دەدات و یاری بۆ دەکات...

سـاڵێک تێپـەڕی بەسـەر تەمەنـی ئـەم گوڵـەدا و جوانیەکانـی زیاتـر دەبـوون... پارچـەی یـاری پەزڵەکـەی لـە ژوورەکـەی خۆیـدا بڵاودەکردەوە و پاشـان دەچوو صـادق و حەنان و سـەمیری دەهێنا

و دەستی ڕادەکێشان، بۆ ئەوەی هەموویان دابنیشن و پێکەوە پارچەکانی ڕێک بخەنەوە...

وەک ئەوەی ئەم پەروەردەی دایک و باوکی دەکات و لەو سەرقاڵبوونە بە ژیان دەریان دەکات بۆ ئەوەی بەجوانی مامەڵە بکەن بەرانبەری!

شەوانە دێت بۆ لای باوکی کە لە حساباتدا ڕۆچووە، لەسەر نووکی پەنجەکانی دەڕوات بۆ ئەوەی هەستی پێ نەکات، هەتا لەبەردەمیدا دەوەستێت... چاوەکانی لەسەر لاپتۆپەکە لا دەدات، تەماشا دەکات سینیەکی پێیە پڕیەتی لە سێو و پرتەقاڵ و هەرمێ... لەهەموو ئەوانە بەچێژتر زەردەخەنەکەیەتی کە گوزراشتە لە خۆشەویستی و هەستکردن بە سەرکەوتن...

ئیناس چووە دایەنگا... بە باشی لەگەڵ هاوڕێکانی و مامۆستاکانیدا کرایەوە، هەمووان خۆشیاندەویست، بەڵام لەکۆتاییەکانی وەرزی دووەمدا بەڕێوەبەرەکە بە سەمیری ڕاگەیاند، کە تێبینی ئەوەیان کردووە هەندێ جار و بۆ چەند چرکەیەک داڵغەی دەڕوات و چاوەکانی بەخێرایی دەتروکێنێت، وەک ئەوەی لە هۆشی خۆیدا نییە. سەمیر زۆر ترسا و بیری کردەوە لەوەی بیبات بۆ لای دکتۆرێکی گونجاوی مێشک و دەمار: «ئەمجەدی برام، دکتۆرێکی بەناوبانگی مێشک و دەمارە، گرنگی دەدات بە ئیناس»...

ئەمجەد لە مێشک و دەماردا پسپۆڕی وەرگرتبوو، جومانی خێزانی سێ منداڵی بووبوو، زەینەبی یانزە ساڵان، فاتیمەی شەش ساڵان کە هاوتەمەنی ئیناسبوو، عومەری دوو ساڵانیش. خێزانێکی گونجاو و بەختەوەربوون. ئەمجەد تەنها لە پسپۆڕییەکەی خۆیدا سەرکەوتوونەبوو، بەڵکوو خاوەنی دەروونێکی پاکبوو، خاوەنی ئیمانێکی قووڵ و دڵێکی میهرەبانبوو، نەخۆشەکان سوودیان وەردەگرت لە زەردەخەنەکەی و

قسەکانی بۆ جەستە و ڕووحیان، وەک چۆن سوودیان وەردەگرت لە دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکەیان و ئەو دەرمانەی بۆی دادەنان، لە پەنای کارکردن لە کلینکەکەی چەندین خولی دەکردەوە بۆ پەروەردەکردنی گەنجان لەسەر ڕێگەی زانستی و ئیمانی، دەیپاراستن لەو بیروبۆچوون و گومانانەی گەنجەکان لەناو دەبات... خوێندکارەکانی وەک پێشەنگێک تەماشایان دەکرد و ئاواتەخوازبوون لە دین و دونیادا وەک ئەو بن. بەدرێژایی ئەم ساڵانە هەموو ئەمانەی دەگەڕاندەوە بۆ بەرەکەتی ئەو دوعایانەی دایکی بۆی کردووە.

چەندێکە ئەمجەد ئیناسی نەبینیووە... لەو ڕۆژەی سەردانی کردن و بووکەڵەکەی پێدا...

تەنانەت لە جەژنەکاندا زۆربەی جار سەمیر گەشتی دەکرد و براکانی نەدەبینی، سەمیر و ئیناس لە ژووری چاوەڕوانییەوە چوونە ژوورەکەی ئەمجەد...

- بەخێربێیت، بەخێربێیت ئەنوس گیان...

ئەمجەد هەڵیگرت و ماچی کرد و لەسەر قەرەویڵەکە داینا...

چەند ساتێک تەماشای کرد...

- کچە جوانەکە، زۆر لەدایکم دەچیت!

ئیناس زەردەخەنەیەکی کرد، زەردەخەنەکەی زۆر سەرنج ڕاکێشبوو...

- ماشەڵڵات لێ بێت، خودا بت پارێزێت...

ئاوڕی دایەوە بۆ لای سەمیر:

- سەمیر، خێرە هاتوون بۆ ئێرە؟

سەمیر قسەی بەڕێوەبەرەکەی بۆ باسکرد و چی بەسەرهاتووە... ئەمجەد ناردی بۆ ئەوەی هێلکاری مێشکی بۆ بکەن. دوای تەماشاکردنی ئەنجامەکان بە سەمیری وت:

- «کارەبایی مێشکی زۆرە، ترسی نییە، بە ویستی خودا لەداهاتوودا نامێنێت، هەتا ئەو دەمە ئەم دەرمانەی پێ بدەن»...

سەمیر زۆر خەمی بوو، پرسیاری زۆری کرد لەبارەی نەخۆشی منداڵەکەیەوە. ئەمجەدیش ئەمەی بە دەرفەتێکی باش زانی و پێی وت:

- « مەترسە، بەڵام پێویستە لە قوتابخانە بەردەوام کەسێکی نزیکی لەگەڵ بێت، پێت چۆنە ساڵی داهاتوو بیگوازینەوە بۆ قوتابخانەکەی فاتیمە؟ بۆ ئەوەی شتەکانی لە فاتیمە بپرسم... دەتوانم هەندێ جاریش لە قوتابخانەوە بیان هێنمەوە، ئەمەیش دەرفەتێکی باشە بۆ ئەوەی ئاگام لە دۆخی بێت... بۆچوونت چییە؟»...

ئەمجەد دەیویست ئەم نوورە بخاتە ژینگەیەکی باش و گونجاوەوە، سووربوو لەسەر ئەوەی لەنێوان ئەو و فاتیمەدا پەیوەندییەکی پتەو هەبێت.

سەمیر هیچ دوودڵیەکی نەبوو چونکە ئەمە لە بەرژەوەندی ئیناسدایە... ساتی تۆمارکردن هات و سۆزانی دایکی حەنان تەداخولی کرد و ڕەتیکردەوە نەوەکەی لەو قوتابخانەیە تۆماربکرێت:

- « ئەوە قوتابخانەیەکی ئاساییە، پێویستە ئیناس بچێتە قوتابخانەیەکی نموونەیی» سەمیر سووربوو لەسەر قسەکەی خۆی و ناوی ئیناسی تۆمارکرد، هیچ شتێک ناگات بە تەندروستی کچەکەی.

لەگەڵ ئەشرەفدا چی ڕوودەدا؟

چۆن کاریگەری دەبێت لەسەر ژیانی خێزانەکەی؟

با بەردەوام بین...

***

ته‌نیاحاجی

**Tanya Haji | ته‌نیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چه‌ناڵێک تایبه‌ت به کتێب و  بابه‌تی جیاواز🤍

**ئه‌م کتێبه له‌لایه‌ن ( ئامینه سیامه‌ند ) کراوه
به PDF و پێشکه‌ش به خوێنه‌ر کراوه**

چه‌ناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مه‌ینێره↓
@tanyahaji22

ئه‌کاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link





# ١٤

## ئەشرەف لە کوێیە؟!

ئەشـرەف، براگـەورەی ئینـاس، ئێسـتا تەمەنـی شـانزە سـاڵە، بەتـەواوی لەکۆنترۆڵـی دایک و باوکـی دەرچـووە... زۆربـەی جار بـە ڕەفتـارە خراپەکانـی دەبـووە مایـەی شـەرمەزاریان... دایک و باوکەکە بەرهەمـی فەرامۆشـکردنی ئەشـرەفیان دەچنیـەوە. لـەلای ئـەوان گرنگـی پێـدان و چاودێـری و سـۆزی دەسـت نەکـەوت، ئـەم شـتانەی لـەلای هـاوڕێ خراپەکانـی و ناسیاوەکانی خاڵۆ بچووکەکـەی دەسـت دەکـەوت.

هـەردوو هاوسـەرەکە ویسـتیان فریـای صـادق بکـەون و وەک ئەوی لـێ نەیـەت، کە تەمەنـی سیانزە سـاڵە، بـەڵام ئارامیـان نەگرت و گرنگـی تەواویـان پێـی نـەدا لـە مامەڵەکـردن لەگەڵیـدا:

- « وانە بە کوڕەکەت بڵێ»
- « تۆ پێی بڵێ، من زۆر سەرقاڵم»...
- « منیش سەرقاڵم و ماندووم»...
- « سەرقاڵی چیت؟ خزمەتکارت هەیە،

من هەر فریای ئیشەکانی باوکت دەکەوم»...

لەسەر وشەی (باوکت) دەست دەکەن بە موناقەشە!

لە کاتی پشووی هاویندا:

- « لەگەڵ خۆتدا صادق ببە بۆ سەر کار، لەماڵەوە بێزار دەبێت»

- « هیچ کارێک نییە لەوێ بیکات، بێزار دەبێت. بیبە و لە یانەی کاراتی ناوی تۆمار بکە».

هەردووکیان پەیان بەوە بردبوو کە پێویستە گرنگی زیاتر بدەن بە صادق، بەڵام ناکۆکبوون لەوەی کامیان ئەو کارە ئەنجام دەدەن.
نەگبەتیەکە لەوەدابوو ئەم موناقەشەیە بەبەرچاوی صادقەوە ڕوویدەدا،
پەیامێکی خەماوی پێدەگەیشت:
- دایک و باوکم گرنگی بە ئیناس دەدەن و لەگەڵیدا کاتێکی خۆش بەسەردەبەن، چونکە خۆشیان دەوێت، بەڵام دەیانەوێت گرنگی بە من بدەن، چونکە پێویستە گرنگیم پێ بدەن، ئەمەیش دەخەنە ئەستۆی یەکتر و لێی ڕادەکەن.
ئەم گرنگی پێدانە هیچ سوودێکی نەبوو، گەرچی لەکۆتاییدا یەکێکیان ئەو ئەرکە قورسە لە ئەستۆ بگرێت، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار صادق زیاتر لێیان دوورکەوتەوە.
ئیناسی نازداریش هەستی بەوە دەکرد دایک و باوکی جیاوازی دەکەن لەمامەڵەکردن لەگەڵ ئەو و صادقدا، ڕازی نەبوو ئەمە بەرانبەر براکەی بکرێت، چونکە براکەی خۆشدەویست... لەسەر سفرەی نانخواردن، باوکی پارویەکی دەخستە دەمیەوە: ئیناس ئازیزی دڵم...
ئەمیش دەیوت:
- صادقیش، وایە باوکە؟
- ئمممم، بێگومان، صادقیش، بەڵام پێویستە بەقسەمان بکات!
جارێک باوکی پێی وت:
- ئیناس گیان،

ئەگەر نمرەی بەرز بەدەست بهێنیت، جوانترین دیاریت بۆ دەهێنم...

به زەردەخەنەیەکەوە وتی:

- بۆ صادقیش، وایە باوکە؟

- ئممم، صادق نمرەکانی باش نییە،

ئەگەر گرنگی بدایە بە وانەکانی باشترین دیاریم بۆی دەهێنا...

ئیناس وتی:

- وانەکانی دەخوێنێت و نمرەی بەرز بەدەست دەهێنێت و دیاری وەردەگرێت... وایە صادق؟ صادقیش بە خەمبارییەوە بێدەنگ بوو.

سەمیر بیری کەوتەوە کە تالەی خوشکی خولی پەروەردەی دەکاتەوە، پەیوەندی پێوەکرد بۆ ئەوەی یارمەتی بدات و ئامۆژگاری بکات سەبارەت بە پەروەردەی صادق و گەڕاندنەوەی ئەشرەف... تالە هات بۆ سەردانیان و ماوەی دوو کاتژمێر لەگەڵ سەمیر و حەنان دانیشت و ئامۆژگاری پێشکەش کردن، ئەوەی بۆ ڕوونکردنەوە کە گۆڕانکاری پێویستی بە کاتە...

دەستیان کرد بەجێبەجێ کردنی ئامۆژگارییەکانی... کاردانەوە و وەڵامدانەوەی صادق لاوازبوو... چەند ڕۆژێک تێپەڕی و بێزاربوون و گەڕانەوە بۆ ڕێگا هەڵەکەی خۆیان لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا.

هەر یەکەیان شکستەکەی دەخستە ئەستۆی ئەوی تر...

هەندێ جار دەستیان دەکردە موناقەشە و ئیناسیش لەنێوانیاندا بوو، لەو دەمەدا دڵەبچووکەکەی بەخێرایی لێی دەدا، زەردەخەنەکەی دیارنەدەما و دوودڵی و ترسی پێوە دەردەکەوت... موناقەشەکە کۆتایی دەهات و بە توورەییەوە بێدەنگ دەبوون... ئیناس تاوێک تەماشای باوکی دەکرد، تاوێکیش تەماشای دایکی دەکرد، پاشان بە دەستە بچکۆلانەکانی دەستی هەردووکیانی دەگرت و دەیخستە

ناو یەک... چاوەکانی زیاتریان دەوت لەوەی بە زاری گوزارشتی لێی دەکرد: تکاتان لێ دەکەم، ئاشتت ببنەوە، وام لێ مەکەن ئارامی لەدەست بدەم، ئێوەم خۆشدەوێت و حەز دەکەم یەکتریتان خۆش بوێت... سۆز و میهری نێوانتان ئەو سەرینەیە کە لەسەری دەنووم...

هەردووکیان تێبینی ئەمەیان دەکرد، توندی هەڵوێستەکانیان کەم دەکردەوە و بەڕوویەکی گرژ و بە وشەی کورت موناقەشەکەیان کۆتایی پێ دەهێنا...

لەگەڵ زۆر دووبارەبوونەوەی ئەم هەڵوێستە، هیچ شتێک لەوانە ڕووحە ئاسوودەکەی ئیناس و دەروونە پاکەکەی نەدەشێواند... بەڵام ژینگەی ڤێلاکە بێزاکەر و ناخۆشبوو بەلایەوە...

ئیناس فێری خوێندنەوەبوو، لەگەڵ ئەمەیشدا داوای لەباوکی دەکرد لەگەڵی بێت بۆ لای کتێبخانەکە و چیرۆکی بۆ بخوێنێتەوە... ئەگەر بەهۆی سەرقاڵیەوە بیری بچوایە، بەدەستەکانی دەیگرت و لەئامێزی دەگرت...

هەندێ جار ئەمجەد پەیوەندی دەکرد بە (سەمیر)ەوە:

- ئیناس و فاتیمەم لە قوتابخانەوە هەڵگرتووە، دەیان بەمەوە بۆ ماڵی خۆمان بۆ ئەوەی پێکەوە یاری بکەن، شەو کەی ڕۆشتیتەوە وەرە بەشوێنیدا... باشە؟

- باشە!

سەمیر هیچ ڕێگرییەکی نەدەکرد چونکە ئیناس هۆگری فاتیمە بووبوو، دەیزانی ئەمە دەروازەیەکە بۆ ئەوەی وشکی و ناخۆشی ڕۆژەکانی ماڵەوەی پێ بشکێنێت... حەنان هەندێ جار ڕێگری دەکرد و هەندێ جاریش بێدەنگ دەبوو بۆ ئەوەی ئیناس جەوێک بگۆڕێت، چونکە هەندێ جاریش زەینەبی کچە گەورەی ئەمجەد، وانەکانی بە ئیناس دەوتەوە و ئەرکەکەی لەکۆڵ حەنان دەکردەوە...

ئەوەی سەردانیکارانی کلینکەکەی ئەمجەد دەبینێت، وادەزانێت ئەم دکتۆرە لە کۆشکێکی گەورە دەژی، بەڵام وانییە، ئەمجەد دکتۆرێکی میهرەبانە، دڵخۆشی ئەو لەوەدایە زەردەخەنە بخاتە سەر لێوی نەخۆشەکان و ئازارەکەیان کەم بکاتەوە... هەست بە دڵخۆشی و ئاسوودەییەکی زۆر دەکات لەو دەمەی پارەی بینین و دەرمان لەنەخۆشە هەژارەکان وەرناگرێت و ئەوانیش دوعای خێری بۆ دەکەن... ماڵەکەی هەندێ فراوانە، نەخش و نیگاری کەمە، کەلوپەلی ناوماڵەکەی باشە و ئیسرافی تێدا نەکراوە، باخچەیەکی مامناوەندی تێدایە، لەلای ئیناس ئەم ماڵە زۆر فراوانتر و خۆشتربوو لەو ڤێلایەی تێدا دەژیا لەگەڵ خێزانە هەڵوەشاوەکەیدا...

لەماڵی ئەمجەد کە بانگ دەدرێت هەموویان هەڵدەسن و بە نۆرە دەستنوێژ دەگرن و نوێژی جەماعەت دەکەن... ئیناس لەسەر ئەمە ڕاهاتبوو لەگەڵیان نوێژی دەکرد لەدوای ئەوەی فاتیمە پۆشاکی نوێژی پێدابوو.

ئیناس لەگەڵ باوکی دەڕواتەوە بۆ ڤێلاکە... گوێی لە بانگ دەبێت... باوکە، دایکە، هەستن، پێکەوە نوێژەکەمان بکەین... سەمیر و حەنان بەشێوەیەکی تەواو نوێژیان فەرامۆش کردبوو، تەنها نوێژی هەینی نەبێت سەمیر وازی لێ نەهێنابوو، سەمیر و حەنان دڵخۆشبوون بەوەی کچەکەیان نوێژ دەکات، دەیانویست لەڕووی دینداریییەوە لە خۆیان باشتربێت.

بە ڤێلاکە و هەموو شتە ڕازاوەکانی ناوی، هێندەی دیمەنی ئیناس جوان نەبوو لەو دەمەی کورسیەکەی دادەنا بۆ ئەوەی بتوانێت دەستنوێژ بگرێت، دواتر قۆڵی هەڵدەماڵی و دەستنوێژی دەگرت، دواتر پۆشاکی نوێژەکەی لەبەر دەکرد کە فاتیمە پێی دابوو.

دیمەنە جوانەکەی کاریگەری هەبوو لەسەریان، هەندێ جار پێکەوە نوێژی جەماعەتیان دەکرد... دوای ماوەیەک خۆیان دوادەخست و ڕایاندەکرد لێی...

- باوکە، ماوەیەکە نوێژ ناکەیت؟

- ئازیزەکەم نوێژ دەکەم، با ئەم شتانەی بەردەستم تەواو بکەم نوێژ دەکەم... دواتر سەمیر نوێژەکەی نەدەکرد...

چەندین جار ئیناس بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستا، چونکە فاتیمە ئاگاکارێکی پێ بەخشیبوو، دەچوو بۆ ژووری دایک و باوکی:

- دایکە، باوکە... هەستن، وەرن پێکەوە نوێژ بکەین!

سەمیر سەری بەرزدەکردەوە و دەیوت:

باشە ئازیزەکەم، کەمێکی تر هەڵدەستم!

دواتر خەوی لێ دەکەوتەوە، حەنانیش هەر خەبەری نەدەبوویەوە!

صادقی برای هەندێ جار چاوی لێی کرد، دواتر تەمەڵی کرد و وازی هێنا...

نزیکبوو ئیناسیش تەمەڵی بکات تێیدا، بەڵام سەردانیکردنی بۆ ماڵی مامە ئەمجەدی کاریگەری قوڵی هەبوو لەسەری و هیمەتی بەرزدەکردەوە!

بازاڕی ئۆتۆمبێلی دەستی دوو بەرەو لاوازی دەڕۆیشت، لەگەڵیدا قازانجی پێشانگاکە کەمی کرد... ئەبو عەزام تەداخولی کرد و کەسێکی شارەزای هێنا دەسکاری کیلۆمەتری ئۆتۆمبێلەکان بکات، بۆ ئەوەی بفرۆشرێت بە حسابی ئەوەی کەم بەکارهێنراوە و نرخیشی هەرزانە! سەمیر تەداخولی نەکرد، ڕاهاتبوو لەسەر فێڵ کردن، لەگەڵ ئەمەشدا بەرانبەر ئەبو عەزام لاوازبوو، سەرکەوتوونەبوو لەوەی چارەسەری گرفتی وەبەرهێنانەکانی بکات، هەروەها لە پێشبرکێی

لەگەڵ زاهیردا شتەکان لەسوودی ئەودابوون، نەیدەویست شکستی زیاتری تووش ببێت، هەموو ئەوانە بووە هۆی ئەوەی لە ئاست ئەو فێڵە ئاشکرایە بێدەنگ ببێت.

ئێستا ئیناس تەمەنی هەشت ساڵە، دوو ساڵ تێدەپەڕێت بەسەر وەرگرتنی چارەسەرەکەیدا، دەرمانەکانی سوودی زۆر باشیان هەبوو لەسەری، وردە وردە دکتۆر ئەمجەد دەرمانەکانی بۆ کەم دەکردەوە، بۆی دەرکەوت بەبێ دەرمانیش باری تەندروستی جێگیرە...

سەمیر بەم هەواڵە زۆر دڵخۆشبوو(چاکبوونەوەی ئیناس)، بەڵام ئەم خۆشییە چەند ڕۆژێکی خایاند، پەیوەندییەکی بۆ هات تووشی شۆکی کرد:

ئەشرەفی کوڕە گەورەی، کە لەتەمەنی هەژدە ساڵیدایە، بە تۆمەتی فرۆشتنی ماددەی هۆشبەر دەستگیرکراوە!

سەمیر بەخێرایی بەرەو بەندینخانە ڕۆیشت... ئەشرەف وتی:

وەڵڵاهی باوکە نەمفرۆشتووە... بەکارم هێناوە، بەڵام نەمفرۆشتووە، هاوڕێکانم ئەم تۆمەتەیان بۆ هەڵبەستبووم و درۆیان بەدەمی منەوە کردووە، بۆ ئەوەی فرۆشیاری سەرەکی ڕزگاری ببێت...

- قوڕبەسەرت! فرۆشتن و بەکارهێنان، یەک لەیەک خراپتر... بۆچی ئاوات کرد؟! بۆچی ئاوا ئابڕووت بردین؟!

سەمیر لەلای ئەشرەف ڕۆیشت و پەیوەندی کرد بە پارێزەرێکەوە، ئەویش پێی ڕاگەیاند ئەم تۆمەتە سزاکەی سێ ساڵ زیندانی کردنە...

هەواڵەکە هەمووانی شۆک کرد، گەرچی هیچ سەیر نییە بۆ گەنجێک کە فەراغێکی گەورەی ڕووحی هەیە... کە ئیناس تێگەیشت چی بەسەر برایەکدا هاتووە و چەند ساڵێک نایەتەوە زۆر گریا بۆی.

پارێزەرەکە بە سەمیری وت هەوڵدەدەم بێ تاوانی ئەشرەف بسەلمێنم و هیچ حوکمێکی بەسەردا نەسەپێنن، بۆ ئەمەیش داوای یەک دەفتەر زیاتری کرد، سەمیریش ڕازیبوو بەمە...

جەوی ماڵەکە تێکچوو، سەمیر و حەنان خەتاکەیان دەخستە ئەستۆی یەکتری، لەگەڵ ئەمەیشدا، لەسەریان پێویستبوو هەواڵەکە لەخەڵکی بشارنەوە و بەشێوەیەکی ئاسایی مامەڵە بکەن... ئەبو عەزام هەفتەی داهاتوو یادی لەدایکبوونیەتی و تەمەنی دەبێت بە شەست و هەشت ساڵ، ناسراوەکانی بانگهێشت کردووە و نایەوێت ئەو هەواڵە جەوی ئاهەنگەکەی تێک بدات!

سەمیر و حەنان و صادق و ئیناس چوون بۆ ئاهەنگی لەدایکبوونی ئەبو عەزام،

ئاهەنگەکە هاوبەشەکانی و کڕیارە مەزنەکان و کارمەندەکانی ئەبو عەزامی کۆکردبویەوە.

زیادی کوڕی زاهیری سکرتێر، دەیزانی ئەشرەف چی بەسەرهاتووە، ویستی لە سەرەتای ئاهەنگەکەدا دوژمنەکەی باوکی شەرمەزار بکات و بدات لە برینەکەی، بەو گەنجانەی وت کە ئەشرەف دەناسن:

- سەیرە؟ کوا ئەشرەف؟ لەباوکی بپرسن بزانن لەکوێیە...

دوو کەس هاتن بۆ لای مێزی خێزانی سەمیر:

- مامەگیان کوا ئەشرەف؟ ئەشرەف لەکوێیە؟ بۆچی نەهاتووە؟

ساتێکی زۆر شەرمەزاری هێنەربوو، وەک ئەوەی وشەی ئەشرەف شمشێرێک بێت و لەگەڵ ناوهێنانیدا لێی بدرێت!

- کێشەیەکی بچووک هەیە...

- چییە؟!

- زۆر گرنگ نییە... دواتر سەمیر خۆی سەرقاڵ کرد بە موبایلەکەیەوە بۆ ئەوەی دوو گەنجەکە بڕۆن، سەمیر زیاتر بیری لەم سەرشۆڕییە دەکردەوە هەتا لەدەستدانی کوڕەکەی: (دۆخی ئەشرەف دەدات لەناو و ناوبانگی من)، (کەسە نزیکەکانم لەسەر خۆم و پەروەردەکەم چی دەڵێن؟)، (ئەمە کاریگەری نابێت لەسەر بازرگانیەکەم؟)

بڕگەکانی ئاهەنگەکە دەستی پێ کرد: یەکترناسین، خواردن، گۆرانی، پێشبڕکێ، نوکتە و قسەی خۆش... سەمیر و حەنانیش بەزۆر پێدەکەنین!

لەدوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە و لەڕێگەی گەڕانەوە بۆ ڤێلاکە، سەمیر دەستیکرد بە ئامۆژگاری کردنی صادق: «ڕۆڵەگیان، سەیرکە ئەشرەف چۆن سەرشۆڕی کردوین... هاوڕێیەتی گەنجی خراپ نەکەیت... ئاوا نەکەیت و ئاوا نەکەیت!»

صادق لەهەموو ئەمانەدا بێدەنگبوو، صادق زانی باوکی بۆیە ئەو قسانە دەکات خەمی خۆیەتی، خەمی وێنەی خۆیەتی لەلای خەڵکی: «باوکم دەترسێ منیش وەک ئەشرەفی لێ بکەم، خەمی منی نییە... گەنجێکی پانزەساڵانم و هیچ گرنگیەک بە پێویستیەکانم نادات، ئەو دەروونی منی بەلاوە گرنگ نییە وێنەی خۆی لەلا گرنگە!»

لەدوای ئەمە صادق بە وشکی مامەڵەی لەگەڵ باوکی دەکرد، خۆی بەدوور دەگرت لە دانیشتن لەگەڵیدا و ئامۆژگاریەکانی، زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ هاوڕێکانیدا بوو...

سەمیر لەسەر تووڕەییەکەی خۆی مابوو، دەترسا صادقیش ئابڕووی ببات، لەگەڵ ئەوەیشدا هەستی دەکرد صادق خۆی بەدوور دەگرێت لێی...

حەنـان و سـەمیر مـاوە سـەردانی ئەشرەفیـان دەکرد، ئەشـرەف سـووربوو لەسـەر ئـەوەی دایـک و باوکـی ببینێـت، دەیوسـت هەواڵێکـی خۆشـیان لـێ ببیسـتێت و هیوایەکـی پـێ بـدەن، لـە سـەردانیەکانی سـەرەتادا سـەرکۆنەی ئەشـرەفیان دەکرد لەسـەر ئـەو کارەی ئەنجامیـداوە... دواتـر کۆتـا قسـەی پارێزەکەیـان بـۆ دەگواستەوە سـەبارەت بـە دۆسیەکەی، ئومێدی ئەوەیان پێ دەدا کە چەنـد هەفتەیەکـی تـر یـان لـە مانگەکانـی داهاتـوودا ئـازاد دەکرێت...

ئایا پارێزەرەکە دەتوانێت بێ تاوانی ئەشرەف بسەلمێنێت؟
چ شتێک وا لە حەنان دەکات،
ڕێگری لە ئیناس بکات بچێت بۆ ماڵی مامە ئەمجەدی؟
سەمیر چی هەڵەیەکی گەورە دەکات بەرانبەر ئەبو عەزام؟
ئەبو عەزام چی بە سەمیر دەڵێت،
کە یادگاری بیست ساڵ پێشتری هەڵدەداتەوە؟

با بەردەوام بین...

***



# ١٥

## سزادان بە نیعمەت!

دوای شەش مانگ لە کێشەکەی سەمیر، لەدوای ئەوەی ئەمجەد فاتیمە و ئیناسی گەیاندە ماڵەوە و بەرەو کلینکەکەی بە ڕێکەوت، ئیناس بە زەینەبی وت:

- موبایلەکەتم پێ بدە...
- بۆ چیتە؟!
- گوێ لەگۆرانیەکی خۆش دەگرم، ناوی ئاوازی نەمرییە گروپێکی کۆری دەیڵێن، دایکم زۆر گوێی لێ دەگرێت و منیش حەزم لێیەتی...

جومانی خێزانی ئەمجەدیش گوێی لە ئەم موناقەشەیەبوو، لەبارەی ئەم گۆرانیە و زیانەکانیەوە چەند ڕاپۆرتێکی خوێندبووەوە، بە ئیناسی وت:

- ئازیزەکەم، خودا و پێغەمبەرەکەیت خۆشدەوێت؟
- بێگومان ئامۆژن...
- خودا پێی ڕاگەیاندوین ئیمانداران دەچنە دۆزەخەوە، ئەهلی باتڵیش دەچنە دۆزەخەوە، بەڵام ئەوانە ڕاستیەکانیان پێچەوانە کردۆتەوە چونکە بڕوایان بە خودا و پێغەمبەرەکەی نییە!

ئیناس بەتەواوی لە قسەکان تێنەگەیشت، بەڵام وتی:

- واتە حەرامە گوێی لێ بگرم؟

- بەڵێ حەرامە، ئەو سەمایەی بە بەرچاوی یەکتریەوە دەیکەن، گومانت وایە خودا پێی ڕازی بێت؟
- نەخێر...
- لەبەرئەوە گوێی لێ مەگرە ئازیزەکەم!

ئیناس ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە و چوو بۆ لای دایکی:

- دایکە، ئامۆژنم پێی وتم حەرامە گوێ لە گۆرانی ئاوازی نەمری بگریت!

(حەرام) لەم ڤیلایەدا ئەو وشەیە بەکار نەدەهێنرا، ئەمەیش حەنانی تووڕەکرد!

هیچی نەوت و بێدەنگبوو... دواتر چوو بۆ ژوورەکەی سەمیر:

- حەزناکەم ئیناس زۆر بچێت بۆ ماڵی مامەی!
- لەوێ سوودی باش وەردەگرێت و لەگەڵ فاتیمەدا یاری دەکات.
- ئەوان لەئێمە جیاوازن، زۆر کاریگەریان هەیە لەسەر ئیناس، پێم ناخۆش نییە نوێژ بکات، پێم ناخۆش نییە داوامان لێ بکات نوێژ بکەین، من دژی دین نیم، بەڵام ئیناس تەداخولی شتەکانی ژیانی من دەکات...

لەدوای ئەم موناقەشەیە، حەنان سووربوو لەسەر ئەوەی ڕێگری لە ئیناس بکات بچێت بۆ ماڵی مامەی، خۆی دەچوو بە شوێنیدا و لە قوتابخانە دەیهێنایەوە بۆ ئەوەی نەچێت بۆ ماڵی مامەی...

- دایکە، مۆڵەتم بدە بچم بۆ ماڵی مامەم!
- دایەگیان دەبێت وانەکانت بخوێنیت...
- لەگەڵ فاتیمە دەیخوێنم.
- پێویست ناکات، ئاوا بارگرانی دەبێت بۆ ماڵی مامەت!
- بەپێچەوانەوە، حەزدەکەن لەماڵیان بم...
- ئەوە ماڵی تۆ نییە، تۆ ماڵ و خێزانی خۆتت هەیە.

ئیناس پەنای بۆ باوکی برد، بەڵام لەسەر تووڕەیی بوو، وتی:
- باوەگیـان، نامەوێت لەسـەر ئـەو بابەتـە موناقەشـە لەگـەڵ دایکت بکەم... ئێستا بیر لـە دانیشتەکەی سبەینێ دەکەمـەوە، کـە بڕیاری کۆتایی لەسـەر ئەشرەفی برات دەدرێت.

ڕۆژی دواتـر سـەمیر چـوو بـۆ دانیشـتنی دادگا، دۆسیەکەی ئەشرەف یەکێکبوو لـەو دە دۆسیەیەی بڕیاری لەسـەر دەدرا، سـەمیر هەستی بەشـەرمەزاری دەکرد کـە بیسـەری دۆسیەکانی تـر دەبـوو، بـەڵام ئومێدی هەبـوو بـەوەی ئەشـرەف بـێ تـاوان دەربچێت و ئـەم دۆسیە کۆتایی پێ بێت... بەتایبەت کە پارێزەرەکە دڵنیای کردبوو لـەوەی هەمـوو هەوڵێکی بـۆ دەدات...
لەکۆتاییدا نـۆرەی ئەشـرەف هـات، سـەمیر لەکاتی بڕیارەکـەدا هەناسـەبڕکێی بـوو!
بڕیاردرا سێ ساڵ زیندانی بکرێت! سەمیر شۆکبوو،
- ئەی بەڵێنەکانی پارێزەرەکە چی لێهات؟ ئەی ئەو بڕە پارەی کە پێم دا؟!
پارێزەرەکە عوزری بۆ هێنایەوە کە هەمـوو هەوڵی خۆی داوە و بڕیاری دادگا ئەمیشی شۆک کردووە!
سـەمیر لـە دادگا هاتـە دەرەوە، حەنانیش بـەردەوام پەیوەنـدی پێوەدەکـرد، بـەڵام وەڵامـی نەدەدایـەوە!
گەیشتە ماڵ و حوکمەکەی ئەشرەف لە ڕووخساریدا دیاربوو!
حەنان زۆر ترسا...
- حوکم درا؟
- سێ ساڵ زیندانی...
حەنان شۆکبوو، بۆچی؟!

بەجۆرێک تەماشای کرد کە پڕبوو لە تووڕەیی و لۆمەکردن... دووبارە لۆمەی یەکتریان کرد و بەرپرسیاریەکەیان خستە ئەستۆی یەکتری... ئەم دوودڵیە هێور نەبوویەوە هەتا ئیناس و صادق لە قوتابخانە گەڕانەوە...

ئەشرەف پێویستی بە پاڵپشتی دەروونی و ئیمانی بوو... چاوەڕێی سەردانی دایک و باوکی بوو... بەڵام ئەوەی پێویستی بوو لەلای ئەوان دەستی نەدەکەوت، شتێک کە نەیانبێت چی ببەخشن! چاوەڕێ ناکرێت سەمیر کوڕەکەی فێری ئارامگرتن بکات، لەدەمێکدا خۆی ئارامگرتنی نییە، چاوەڕێ ناکرێت فێری ئەوەی بکات کە پێویستە بەخۆیدا بچێتەوە و لەگەڵ خودادا پەیوەندی باش بکات، چونکە سەمیر لەهەموو کەس زیاتر خۆی پێویستی بەو شتانەیە!

سەردانیەکانی دایک و باوکی بە کۆمەڵێ پرسیاری ڕۆتینی دووربارە تێدەپەڕی، لەوەی ئەشرەف چی پێویستە، لە پارە و پۆشاک، ئەی چی دەخۆن و چی دەکەن و تەندروستی چۆنە... هەتا ئەشرەف هەستی کرد لەو کێڵگە پەلەوەریەدایە کە باوکی سەرپەرشتی دەکات!

ئەشرەف بێزاربوو لەمە، نەدەهاتە دەرەوە بۆ ئەوەی چاوی پێیان بکەوێت، مەگەر پێیان بوتایە کچێکی نۆ ساڵانیشیان لەگەڵە... ئەویش ئیناسە! ئەشرەف حەزی دەکرد بیبینێت چونکە ڕاستترین شتی ژیانی بوو، ئەگەر بیزانیایە هاتووە بەخێرایی خۆی ئامادە دەکرد... تاوێکی باش بەبێدەنگی تەماشای یەکتریان دەکرد، لە چاوی هەردووکیاندا فرمێسک قەتیس بووبوو، دواتر ئیناس بە چەند قسەیەک بێدەنگیەکەی دەشکاند، دەیوت: (لە نوێژەکانمدا دوعات بۆ دەکەم).

ئـەم قسـانە بـۆ ئەشـرەف زۆر زۆربـوو، بەهۆیـەوە هەسـتی بـە ئارامـی دەکـرد.

ئەمجـەد و خێزانەکـەی بیری ئیناسیان دەکرد، بـەڵام دواتـر ئەمجەد گەشـتی کـرد، لـە ڕێکخراوێکـی پزیشـکی نیودەوڵەتـی بەشـێوەیەکی خۆبەخـش کاری دەکـرد، دەچـوون بـۆ ئـەو وڵاتـە موسـڵمانانەی کـە تووشـی بـەڵا و ناڕەحەتـی بوونـە و نەخۆشـەکانیان چارەسـەر دەکرد، لەشـوێنی خـۆی پزیشـکێکی دادەنـا... کاری بـە پرەنسیپی یـەک ئوممـەت دەکرد و هـەوڵـی دەدا بەپێـی توانا یارمەتـی پێشـکەش بـکات.

سـەمیر بەرهەمـی ئـەو ئۆتۆمبێلانـەی دەچنیـەوە کـە دەسـکاری کیلۆمەترەکانـی کرابـوو... کڕیـارەکان سـکاڵایەکی زۆریـان دەکـرد، ماقـوڵ نییـە ئۆتۆمبێلێـک ئەوەنـدە کـەم ڕۆیشـت بێـت و کێشـەی گـەورەی ئـاوای تـێ بکەوێت! سـەمیر و کڕیارێک بـوو بەدەمەقاڵێیان، کابرایەکـی شـەڕانی بـوو، شـەو لەگـەڵ کەسـێکدا هێرشـیان کـردە سـەر پێشـانگاکە، زیانێکـی زۆریـان گەیاند بـە ئۆتۆمبێلـەکان! سـەمیریش هیـچ بەڵگەیەکـی لەسـەر بکەرەکـەی نەبـوو... زیانێکـی زۆریـان بەرکـەوت، سـەمیریش داوای لـە ئەبو عـەزام کـرد بڕێک پـارەی بۆ تەرخـان بکات بۆ ئـەوەی ئۆتۆمبێلـی تـر بهێنن و قەرەبووی زیانـەکان بکەنـەوە، بەڵام ئەبـو عـەزام بـە پاسـاوی بەرژەوەنـدی بازرگانیەکانـی تـری داواکـەی ڕەتکـردەوە.

هەربۆیـە سـەمیر ناچاربـوو ٢٠دەفتـەر لـە هەژمـاری خـۆی ڕابکێشـێت، کـە زۆربـەی سـامانەکەی بـوو...

« بـەڵام... ئـەم ئۆتۆمبێلانـە خاوەندارێەکـەی بـۆ کـێ دەبێت؟ چەندین سـاڵە مـن بـە سـەرمایەی ئەبـو عـەزام کارم کـردووە، ئۆتۆمبێلەکانیش

بەناوی پێشانگاکەوە تۆمار دەکەم، لەگەڵ ئەبو عەزامدا قازانجەکەی بەش دەکەم. ئێستا بە پارەی خۆم ئۆتۆمبێل بۆ پێشانگا دەکڕم، ئەمانە تەنها پارەی منی پێ دراوە. ئەمە باشترین دەرفەتە بۆ ئەوەی بە ئەبو عەزام بڵێم وەک هاوبەشێکی خۆی ناوم تۆماربکات، ئەوا چەندین ساڵە سەرقاڵی کارەکانی ئەوم، ئەمە حەقیقەتە کە ژیانم بۆ پێشانگا و بەرژەوەندییەکانی ئەبو عەزام سەرف کردووە و چەندین کێشەم بۆی چارەسەر کردووە و چەندین قازانجم بەدەستهێناوە بۆی»

سەمیر چوو بۆ ئۆفیسەکەی مامۆستا و ئاماژەی بە بابەتی هاوبەشی کرد لە پێشانگاکەدا. ئەبو عەزام تاوێک تەماشای کرد کە کەمێک بەسووک سەیرکردنی تێدابوو، پێی وت:

- ئەو ئۆتۆمبێلانەی بە پارەی خۆت هاوردەی دەکەیت بەناوی پێشانگاوە تۆمار دەکرێت و قازانجی ٧٠٪ بۆ تۆ، لە کۆتاییدا مافی تۆ پارێزراوە، بەڵام ئەو شێواوی و تێکەڵاویەم ناوێت...

(بەناوی پێشانگاوە) واتە بەناوی (ئەبو عەزام)، (مافی تۆ پارێزراوە) سەمیر نەیزانی چۆن مافی پارێزراوە؟! کەی پارەی ئۆتۆمبێلەکان وەردەگرێتەوە؟ هیچ شتێک لەسەر کاغەز تۆمار نەکراوە... تەنها بەشێک لەپشکەکەی زیادکردووە بۆ ئەوەی بێدەنگی بکات! سەمیر بەرانبەر مامۆستا هەستی بەلاوازی کرد چونکە لەنێو شتەکانیدا غەرقبووە، ڕێگەکەی لێ داخرا و هیچی نەوت! ساتی تۆمارکردنی ئۆتۆمبێلەکان بەسەر سەمیردا تێپەڕی وەک ئالوودەیەکی دەستەمۆ، کە لەداهاتوودا بیر لەم ساتە و هەڵوێستەکەی دەکاتەوە!

لەترسی ئەوەی جارێکی تر هێرش نەکرێتەوە سەر پێشانگاکەی، سەمیر پاسەوانێکی بۆ پێشانگاکە دانا، لەگەڵ ئەمەیشدا هەر لە ترس و دوودڵیدا دەژیا، هەتا وای لێهاتبوو شەوانە خەوی ناخۆشی

دەبینی و خەوی لەچاوەکانی دەتۆراند! بەڵکوو چەندین جار لەدوای نیوەی شەو دەچوو بۆ پێشانگاکە بۆ ئەوەی دڵنیابێت هێرش نەکراوەتە سەری!

سەردانی دکتۆری دەروونی کرد، هەندێ دەرمانی بۆ نووسی بۆ ئەوەی ترسەکەی کەم بێتەوە و خەوی باش ببێت...

سەمیر هەستی کرد پارە بۆ ئەوە کۆدەکاتەوە بەزایەی بدات! پێشتر بەهۆی ئەوەی صادقیان فەرامۆش کردبوو پارەیەکی باشیان دا بە چارەسەر بۆی، دواتر پارەی دا بە پارێزەرەکەی ئەشرەف، ئێستایش بۆ چارەسەری خۆی و ئەو ئۆتۆمبێلانەی بەناوی (پێشانگا)وە تۆمارکراوە...

سەمیر گەیشتبوو بە قۆناغێک بە نیعمەت سزا دەدرا!

ماڵ و منداڵەکانی بووبوونە سەرچاوەی عەزاب بۆی!

لەم مانگانەی کۆتاییدا بەهۆی زۆری کێشەکانەوە سۆز و میهرەبانی نێوان حەنان و سەمیر زۆر لاوازبووبوو، شەو و ڕۆژ سەمیر لەسەر عەساب بوو...

حەنان بەرگەی ئەم دۆخەی نەدەگرت... پەنای بۆ باوکی برد بۆ ئەوەی فشار بخاتە سەر سەمیر هەتا جیاببنەوە... ئەبو عەزام بانگی کرد بۆ کۆشکەکەی، موناقەشەیەکی توند ڕوویدا لەنێوان سەمیر و حەنان و دایکی و باوکی.

مامۆستا بەرگری لە کچەکەی کرد و هەموو بەرپرسیاریەکەی خستە ئەستۆی سەمیر. سەمیر بە خەزوری وت:

- ئاوا بەرگری لە کچەکەت دەکەیت، لەبری ئەوەی هانی بدەیت لە دۆخە سەختەکاندا لەپەنای مێردەکەیدا بوەستێت؟! ئەی وەفا لەکوێیە؟!

مامۆستا بە لوتبەرزی و توورەییەوە پێکەنی، لە یادگەیدا هەڵوێستێکی بیست ساڵ پێش ئێستای دەرهێنا کە ئەوێ ڕۆژێ هیچ گوێی پێ نەدابوو، وتی:

- مایەی پێکەنینە وەفا لە کەسێکەوە ببیستین، کە لەگەڵ ئێمە گۆشتی برژاوی دەخوارد و نوکتەی دەگێڕایەوە، لەو دەمەیشدا دایکی لەسەرە مەرگدابوو!

سەمیر شۆکبوو وەک ئەوەی زللەیەکی بەهێزی لێ درابێت، بەتوورەییەوە کۆشکی مامۆستای بەجێهێشت و هەستی بە سووکایەتیەکی زۆر دەکرد...

لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی ڕوویدا، دواتر سەمیر و حەنان بڕیاریاندا لە ژێر یەک سەقف و خانوودا بمێننەوە لە پێناوی ئیناسدا، کەسیان بەرگەی ئەوە ناگرن چەندین ڕۆژ لێی دووربن، هەروەها بۆ ئەوەی پارێزگاری لە دیکۆری کەسایەتیان بکەن لەلای ناسراوەکانیان.

سزایەکی قورسبوو بۆ سەمیر کە حەنانی ژنی ببینێت لەدەمێکدا لەدڵیدا هیچ سۆزێکی بەرانبەری نەمابوو، ناچاربوو لەگەڵیدا بچێت بۆ ئاهەنگ و بۆنەکان، لەبەرچاویان پەیوەندییەکی ئاسایی پیشان بدەن... تەنانەت جاری واهەبوو هەر یەکێکیان بە ئۆتۆمبێلی خۆیان دەچوون بۆ شوێنەکە، بە نامەی واتس ئەپ کاتێکیان دادەنا کە بگەن بەیەکتری لەو شوێنە، بۆ ئەوەی لەڕێگا پێکەوە نەبن! ئیناسی داماویش دەبوو هەر جارە و هاوڕێیەتی یەکێکیان هەڵبژێرێت!

ئیناس چەند جارێک هەوڵی دا لەیەکتریان نزیک بکاتەوە، بەڵام ناکۆکیەکە زۆر قوڵتربوو لەوەی بە ئەو چارەسەر بکرێت...

ئیناس تاکە کەسبوو کە سەمیر بەڕاستگۆیانە خۆشی دەویست، کە لە ئامێزی دەگرت یان لەگەڵی دەچووە دەرەوە هەستی بە ئارامی دەکرد.

بەپێچەوانەی ئەو منداڵانەی لە ساتی ترس و خەمباریدا بەدوای باوکیاندا دەگەڕێن بۆ ئەوەی ئارامیان لەلای دەست بکەوێت، سەمیر لەو ڤێلا گەورەیەدا وەک منداڵێک بەترسەوە بەدوای کچەکەیدا دەگەڕا، بۆ ئەوەی لە ئامێزی بگرێت و کەمێک هەست بە ئارامی بکات!

ماوەی ئەم چەند مانگە، ئیناس نەچوو بۆ ماڵی مامە ئەمجەد، ئەمجەدیش چەندین جار پەیوەندی پێوەکرد بۆ ئەوەی مۆڵەتی بدات ئیناس بێت بۆ ماڵیان، چونکە هەموویان بیری دەکەن، بەڵام سەمیر کە کۆڵێ خەفەتی هەبوو نەیدەویست لەگەڵ حەناندا موناقەشە بکات... بەوە ئارامی بە ئیناس و فاتیمە دەبەخشی کە لە قوتابخانە بەیەک دەگەن.

دوای دابڕانێکی زۆر، سەمیر و براکانی بەیەک گەیشتن لە ژن مارەکردن بۆ عەبدوڕەحمانی کوڕی سەعیدی برایان، سەمیر لەگەڵ ئیناسدا هاتبوو...

کەشێکی خۆش و موبارەک بوو... عەبدوڕەحمان لاوێکی بیست و شەش ساڵانە، ڕووخسارێکی جوانی هەیە و سیمایەکی دیندارانەی هەیە، کە ژنەکەیان پێدا، هەستا دەستی باوکی ماچ کرد و یەکتریان لە ئامێزگرت، باوکی چاوی پڕبوو لە فرمێسکی خۆشی چونکە ئەوا کوڕە باشەکەی پێ دەگات کە بە ماڵی حەڵاڵ گەورەی کردووە.

تەنها عەبدوڕەحمان وانەبوو، بەڵکوو ژینگەی براکانی سەمیر و منداڵەکانیان بەوشێوەیەبوو، سەمیر تەماشای عەبدوڕەحمانی دەکرد و بەراوردی دەکرد بە ئەشرەفی کوڕی...

لەم کاتەدا، غیرەی کرد بەرانبەر براکانی، بەڵام ئەمجارە بەهۆی باری ماددی و ژیانەخۆشەکەیان نەبوو، سەمیر ژیانی زۆر لەئەوان باشتربوو...

ئەمجارە و بۆ یەکەمجار، سەمیر ئیرەییان پێ دەبات لەسەر ئەوەی جەوێکی خۆشیان هەیە و دەروونیان ئارامە و دڵخۆشن، منداڵەکانیان باشە و سۆز و بەزەیی لەنێوانیاندایە... سەمیریش هیچ شتێک لەوانە لەژیانیدا نەبوو.

ئیناس لەلای ئافرەتەکان دەرچوو بۆ ئەوەی لەگەڵ باوکیدا بگەڕێتەوە بۆماڵەوە...

ئیناس لەڕێگای گەڕانەوەدا وتی:

- باوکە، پوورە تاڵەم پێی وتم زۆر لەنەنکت دەچیت خودا لێی خۆشبێت.

(ئیناس لەدایکم دەچێت) سەمیر زۆر بیری کردەوە، پێشتریش ئەمجەد هەمان قسەی کردبوو...

نەیتوانی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، چونکە تا ڕادەیەک شێوەی ڕووخساری دایکی لەیاد کردبوو! کۆتا جارەکان کە لەگەڵ دایکی بوو، ئەو ڕۆژانەبوو کە یارمەتی دەدا سەر ئۆتۆمبێلەکە بکەوێت بۆ ئەوەی ئەمجەد بیبات بۆ چارەخانە، لەو دەمەدا سەمیر پێی دەوت: (دایەگیان، ان شاءالله باش دەبیت) وەڵامی نەدەدایەوە و لێی تووڕەبوو، بەڵام تێبینی ئەوەی نەدەکرد چونکە بیری قاڵبوو بە بازرگانی ئۆتۆمبێلەوە کە ئەو دەمە تازە دەستی پێ کردبوو!

ئیناس لەقسەکردن بەردەوامبوو:

- باوکە، ڕێگەم بدە سەردانی ماڵی مامەکانم بکەم... مامە و ئامۆژن و ئامۆزاکانم خۆشدەوێت، پوورە تاڵەم خۆشدەوێت، فاتیمە و زەینەب و ئامۆژنم پێیان وتم:

ئەوە بۆ دیار نیت؟ بۆچی ماوەیەکە سەردانمان ناکەیت؟

فاتیمە داوای کرد شەوێک لەماڵی ئەوان بخەوم،

ئامۆژنیشم زۆر بەمە دڵخۆشبوو.

- بەرگەی دووری تۆ ناگرم گیانی من.
- تخوا باوکە، با ماوە ماوە بچم!

سەمیر بەزەیی بە کچەکەیدا هاتەوە و زانی لەماڵی مامەکانی ئەوەی دەست کەوتووە کە لە ڤێلاکە و خێزانە هەڵوەشاوەکەیدا لەدەستی داوە... بڕیاریدا گوێ نەدات بەقسەکانی حەنان... بە ئیناسی وت:

- باشە باوەگیان، خوا ئاسانی بکات.
- «سوپاس بۆ خودا»... کچەکەمان لەخۆشیدا خەریکبوو دەفڕی، دەستیکرد بە خەون بینین بەو ڕۆژەی لەلای فاتیمە دەمێنێتەوە.

گەڕانەوە بۆ ڤێلاکە و سەمیر هەر بیری لەو کاتژمێرە دەکردەوە کە لە مارەکردنەکە بەسەریان برد...

ئەو ناخۆشی و نارەحەتیانەی تێیدابوو وای لێ کرد بیرێک لەحاڵی خۆی بکاتەوە.

پێش بیست ساڵ ئەمجەد سەردانی کرد، ئامۆژگاری کرد لەو بێ ئاگاییە دەربچێت، سەمیر تووڕەبوو... ئەمجەد نامەیەکی بۆ نارد، سەمیر ویستی بەجوانی بیخوێنێتەوە و لێی ڕابمێنێت، بەڵام بووکی تازە (حەنان) بانگی کرد و بابەتەکەی لەیاد کرد...

ئێستا: حەنان نییە!

بۆ یەکەمین جار، سەمیر بیر لەخۆی و ئیمانەکەی دەکاتەوە...

سەمیر چی دەکات؟

پەرچەکرداری ئەبو عەزام چیبوو؟

با بەردەوام بین...

***



# ١٦

# جوانترین ڕۆژ!

لەدوای ئەوەی لە ژن مارەبڕینی عەبدوڕەحمان گەڕانەوە، سەمیر لەسەر قەنەفە دانیشت و ڕوویکردە خۆرئاوابوون، کۆتا کاتژمێری ڕۆژی هەینی بوو، بەهۆی سەرقاڵی و بێ ئاگاییەوە نوێژی هەینی نەکردبوو!

تاکە خەمڕەوێنی ئەم دونیایەی لە ئامێزدا بوو(ئیناس)، ئەویش دیارییە کۆنەکەی مامەی پێ بوو، بوکەڵە قژزەردەکە، پۆشاکی نوێژی دەکردە بەری و لێی ڕادەما، دواتر دایدەکەند پاش کەمێکی تر دەیکردەوە بەری و لێی ڕادەما.

سەمیر تەماشای خۆرئاوابوونی دەکرد و بەقوڵی بیری دەکردەوە...
« ژیانم بەسەرچوو... خێزانەکەم هەڵوەشاوە... کوڕەکەم لەزیندانە... لەلای ئەبو عەزام وەک کۆیلە کاردەکەم... چل ساڵم تێپەڕاندووە... بەرەو کوێ دەڕۆم؟ سەرەنجامم چییە؟»... لەگەڵ کۆتا ساتەکانی خۆرئاوابووندا بڕیارێکی گرنگی دا:

«داوای ئامۆژگاری لە ئەمجەد دەکەم»

سەمیر هەستی بە ئیسراحەت کرد کە ئەم بڕیارەی دا و لەنەفسی خۆیدا وتی: «بەسە ماندووبووم!»

ئیناس بێدەنگیەکەی شکاند و بووکەڵەکەی هێنایە پێش چاوی و وتی:



# ١٦



## جوانترین ڕۆژ!



لەدوای ئەوەی لە ژن مارەبڕینی عەبدوڕەحمان گەڕانەوە، سەمیر لەسەر قەنەفە دانیشت و ڕوویکردە خۆرئاوابوون، کۆتا کاتژمێری ڕۆژی هەینی بوو، بەهۆی سەرقاڵی و بێ ئاگاییەوە نوێژی هەینی نەکردبوو!

تاکە خەمڕەوێنی ئەم دونیایەی لە ئامێزدا بوو(ئیناس)، ئەویش دیارییە کۆنەکەی مامەی پێ بوو، بوکەڵە قژزەردەکە، پۆشاکی نوێژی دەکردە بەری و لێی ڕادەما، دواتر دایدەکەند پاش کەمێکی تر دەیکردەوە بەری و لێی ڕادەما.

سەمیر تەماشای خۆرئاوابوونی دەکرد و بەقوڵی بیری دەکردەوە...

« ژیانم بەسەرچوو... خێزانەکەم هەڵوەشاوە... کوڕەکەم لەزیندانە... لەلای ئەبو عەزام وەک کۆیلە کاردەکەم... چل ساڵم تێپەڕاندووە... بەرەو کوێ دەڕۆم؟ سەرەنجامم چییە؟»... لەگەڵ کۆتا ساتەکانی خۆرئاوابووندا بڕیارێکی گرنگی دا:

«داوای ئامۆژگاری لە ئەمجەد دەکەم»

سەمیر هەستی بە ئیسراحەت کرد کە ئەم بڕیارەی دا و لەنەفسی خۆیدا وتی: «بەسە ماندووبووم!»

ئیناس بێدەنگیەکەی شکاند و بووکەڵەکەی هێنایە پێش چاوی و وتی:

- باوکە، بڕیارمداوە ناوی بنێم: هودا.

بە زەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە:

- ناوێکی زۆر جوانە.

ئیناس لەچاوەکانی باوکیدا شتێکی بەدی دەکرد، زانی لە ساتێکی جیاوازدا دەژی، وتی:

- «باوکە» دواتر بێدەنگبوو.

- بەڵێ گیانەکەم.

- وەرە بەیەکەوە نوێژ بکەین.

بۆ یەکەمجار سەمیر دوودڵ نەبوو لە وەڵامدانەوەی کچەکەی:

- باشە، وەرە دەستنوێژ بگرین.

ئیناس بە شەرمەوە وتی:

- دەستنوێژم هەیە.

سەمیر قۆڵی هەڵکرد و وتی:

- باشە، ئێستا دەستنوێژ دەگرم و دێمەوە بۆ لات.

سەمیر بیری زۆر ئاڵۆزبوو، لەو ساتەدا تێبینی ڕووخساری کچەکەی نەکرد...

ئیناس دەگریا و لەناو گریانەکەیدا هەناسەبڕکێی بوو! لەکۆتاییدا، باوکی لەگەڵیدا نوێژ دەکات... لەکۆتاییدا، باوکی قۆڵی هەڵدەکات بۆ ئەوەی دەستنوێژ بگرێت، هەستی بەو کەشە ئیمانییە کرد کە لەماڵی مامیدا هەستی پێ کردبوو، ئەوەی لەماڵی مامەیدا لەگەڵیدا ژیابوو، لەکۆتاییدا لەلای بەڕێزترین کەسی دەیبینێت: باوکی کە خۆشی دەوێت، لەو ڤێلایەی کە ئیناس دە ساڵە زیاتر تێدا دەژی و تەنها ڕووکەشی ماددی تێدابووە...

ئیناس فرمێسکەکانی سڕی بۆ ئەوەی باوکی نەیبینێت، پۆشاکی نوێژەکەی لەبەری بوکەڵەکەی(هودا) داکەند و کردیە بەری خۆی، بەرماڵی ڕاخست و لێوارەکانی چاک دەکرد و چاوەڕێی باوکی دەکرد... سەمیر هات و قامەتی کرد و پێکەوە نوێژیان کرد.

سەمیر چاوەڕێی ڕۆژی دواتری نەکرد، بەڵکوو هەر ئەو شەوە پەیوەندی کرد بە ئەمجەدەوە:

- ئەمجەد، دەمەوێت لەکارێکی گرنگدا ئامۆژگاریم بکەیت.

- خێرە ان شاءالله.

- با بتبینم پێت دەڵێم، سبەینێ گونجاوە؟

- یاخوا بەخێربێیت... کاتژمێر یەکی دوا نیوەڕۆ دەچم بۆ کلینکەکەم، پێش ئەو کاتە وەرە بۆ ماڵمان، ئیناس لەگەڵ خۆت بێنە و بیرت نەچێت.

ڕۆژی دواتر سەمیر و ئیناس چوون بۆ ماڵی ئەمجەد.

سەمیر هەموو شتێکی بۆ براکەی باسکرد، لەو ئۆتۆمبێلەی کە فێڵی تێدا کرد و نامەی کڕیارەکە، دواتر چۆن پەیوەست بووە بە کارەکانی ئەبو عەزامەوە و هاوبەش بووە لە هەموو فرتوفێڵەکانیدا، هەتا گەیشتوە بەم خێزانە هەڵوەشاوەی ئێستا...

ئەمجەد بێدەنگبوو قسەکانی پێ نەدەبڕی... دوای ئەوەی سەمیر لەقسەکانی تەوابوو، شۆک و بێدەنگبوو.

سەمیر پێی وت:

- ئەوە چیتە؟

- سەرم سوڕماوە لە ئارامگرتنی خودا بەرانبەرت!

- چارەسەرێکم دەوێت.

ئەمجەد هەستی کرد بەرانبەر قەلایەکە لە کێشە و گرفت، کە ماوەی بیست ساڵ زیاترە کەڵەکەبووە، بڕیاریدا سەرەتا شتە

لەپێشینەکانی پێ بڵێت بۆ ئەوەی دواتر ئاگای لەبراکەی بێت و دانە بەدانـەی چارەسـەر بکـەن:

- «سـەمیر، ئێرە شوێنی قسـەی جوان نییە، بەڕاشکاوی قسـەت لەگەڵ دەکەم، بەجۆرێک لەجۆرەکان تۆ کەوتویتەتە بەندایەتی کردنی مادده و مرۆڤەکانەوە... بەندایەتییەکی باتڵە و تەنها بەندایەتیکردن بۆ خودا لـەوە ڕزگارت دەکات... نوێژەکەت ناونیشـانی ڕزگاربوونتە لە بەندایەتیکردنی باتڵ، لەبەردەم خودادا دەوەستیت و دەڵێیت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ تەنها تۆ دەپەرستم، بەڕەهایی تەنها گوێڕایەڵی تۆ دەکەم، تەنها بۆ تۆ خۆم زەلیل دەکەم، ئەوەی بۆ خودا خۆی زەلیل بکات سـەربەرز و بەعیززەت دەبێت... ئەم ئازادبوونەیش لەسـەر ئەو نەفسـە قورسـە کە زۆر هۆگری ماددیاتە، هەربۆیە داوای یارمەتی لەخودا دەکەیت و دەڵێیت: ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ یەکەمین شت کە دەیکەیت ئەوەیە پارێزگاری لەنوێژەکانت بکەیت و لە واتای نوێژ و سوورەتی فاتیحە تێ بگەیت»

سـەمیر سەرسـامبوو بـە قسـەکانی براکـەی و هیـچ بێزارییەکی پێـوە دیارنەبـوو، ئەمجـەد لەقسـەکردن بەردەوامبـوو، وتـی:

- لەهەمـان کاتدا پێویستە واز ئەبو عـەزام و ژینگەکـەی و کارکردن لەگەڵیدا بهێنیت.

سەمیر بەخێرایی وەڵامی دایەوە:

- ئەمجـەد ناتوانـم! بـۆم باسـکردیت. کارەکانـم پەیوەسـتن بـەوەوە، لـە پێشـانگاکەیدا کار دەکـەم، لـە ڤێلاکـەی ئـەودا دەژیـم، زۆربـەی کڕیارەکانـم بەهـۆی ئـەوەوەن، هەمـوو سـەرمایەکەم ڕاکێشـاوە و ئۆتۆمبێلـم پێـی کڕیـووە و بەنـاوی پێشـانگاکەوە تۆمارکـراوە...

سـەمیر باسـی ئـەوەی نەکرد حـەز دەکات هـەر لەگـەڵ ئـەو چینـە دەوڵەمەند و بەرزەدا پەیوەندی هەبێت کە ئەبو عەزام پێی ناساندووە،

حـەزی بـەو گەورەدانانەیـە کـە بەڕێوەبەرانـی وەبەرهێنانەکانـی ئەبـو عـەزام بۆی دادەنێن، بـەو گەشـتانەی کـە دەیکات لەپێنـاو بەرژەوەندی بازرگانیەکەیدا...

هەمـوو ئەمانـە بەختـەوەری و ئارامـی بـە سـەمیر نەدەبەخشـی، بـەڵام لەهەمـان کاتدا هەسـتی دەکرد ناتوانێت دەسـتیان لـێ بەربدات و بـێ پێویسـت بێت لێیـان!

ئەمجەد پێی وت:

- تۆ چارەسـەرت دەوێت، تەنها ئـەو چارەسـەرە بـە گونجـاو دەزانـم بـۆ تـۆ...

هەر کۆیلەی ئەو شتانە دەبیت، ڕاستگۆ نابیت لەوەی دەیڵێیت: ﴿إِيَّـاكَ نَعْبُـدُ وَإِيَّـاكَ نَسْـتَعِينُ﴾ بەڵکوو خۆت فریو دەدەیت! ئـەوەی لەژیانتـدا زۆر ئـازاری داویـت کەمـی ئارامگرتنتـە، ئارامگرتـن لەسـەر تاعـەت، ئارامگرتـن لەسـەر ئەنجامنەدانی تـاوان و ئـەو شـتانەی لەخـودا دوورت دەخاتـەوە چونکـە لەپێناویـدا سـەرپێچی خـودا دەکەیـت. پێویسـتە کارەکـەت لەهەمـوو حەرامێـک پـاک بکەیتـەوە...

سەمیر زۆر موناقەشەی کرد...

ئەبـو عـەزام ئـەو هەوایەیـە کـە هەناسـەی پـێ دەدات، گەرچـی ژەهراویـش بـێت!

لەکۆتاییدا ئەمجەد پێی وت:

- بەلایەنـی کەمـەوە، دەچیـت بۆلای ئەبـو عـەزام و پێـی ڕادەگەیەنیت لـە هیـچ کارێکـی حەرامدا بەشداری ناکـەم، نـە ڕیبـا، نـە فێڵکردن، نـە یاریکـردن بـە کیلۆمەتـری ئۆتۆمبێلـەکان، نـە بەرتیـل و وەبەرهێنانـە حەرامـەکان. ئەمـە چارەسـەرێکی ڕیشـەیی نییـە، ترسـم هەیـە لەگـەڵ ئـەو پیـاوە بمێنیتـەوە، هەربۆیـە پێویسـتە وردە وردە لێـی بکشـێیتەوە. بـەڵام بـە ڕەتکردنـەوەی شـتە حەرامـەکان دەسـت پـێ بکـە.

سەمیر قەناعەتی کرد دوای ئەوەی ئەو پەرۆشییەی لە براکەیەوە بینی، بڕیاریدا مەرجە نوێکانی بە ئەبو عەزام بڵێت. سەمیر ویستی بڕوات، هەربۆیە داوای کرد ئیناسی بۆ بانگ بکەن کە لەگەڵ فاتیمە کاتێکی خۆشیان بەڕێ کرد.

ئیناس هات:

- باوکە تکات لێ دەکەم با ئیمشەو لەماڵی مامم بم.
- باوەگیان، سەعیت لەسەرە، سبەینێ دەوامە و کتێبەکانیشت پێ نییە.

فاتیمە وتی:

- مامەگیان تکات لێ دەکەم، لەیەک پۆلداین،

من و ئەو لەیەک کتێبدا سەعیەکەمان دەکەین.

ئەمجەد وتی:

- بەیانی لای ماڵی ئێوەوە دێم و جانتاکەی وەردەگرم و دواتر دەیانبەم بۆ قوتابخانە.
- بەڵام خۆی بۆ ئێرە ئامادە نەکردووە، قاتی خەو و فڵچەی ددان شۆرینەکەی پێ نییە.

فاتیمە وتی:

- مامە من قاتی خەوی دەدەمێ، باوکە تۆ فڵچەی بۆ پەیدا دەکەیت؟
- بەڵێ بەڵێ، باشترین فڵچە.
- تەواو، قسەمان بڕیت مامە.

سەمیر ڕازیبوو ئیناس لەماڵی مامەی بمێنێتەوە، هەردوو کچۆڵە لەخۆشیدا خەریکبوو باڵیان دەگرت.

پێش ئەوەی بڕوات ئەمجەد پێی وت:

- ئەگەر ئەو قسانەت بۆ خەزورت کرد، پێم بڵێرەوە!

سەمیر وتی:

- ئەوە لێ گەڕێ بۆ خۆم.

هێشتا لەنەفسی سەمیردا هەندێک لە خۆبەگەورەزانین هەبوو، پێی قبوڵ نەبوو لەم کارەدا براکەی چاودێر بێت بەسەریەوە، هەرچەندە ڕێکەوتبوون لەسەر ئەوەی چاودێری بکات لەسەر نوێژەکانی. لە ماڵی براکەی دەرچوو بۆ ئەوەی بچێت بۆ ئۆفیسەکەی ئەبو عەزام بۆ ئەوەی بڕیارەکەی پێ بڵێت.

ئیناسی دەساڵان دوای ساڵێک دابڕان چۆن کاتەکانی لەماڵی مامەی بەسەربرد؟ خۆشترین ڕۆژی ژیانی بوو! هەمووان دڵخۆشبوون بە بوونی و گرنگیان پێ دەدا: مامەی کەمێک لەگەڵیدابوو دواتر چوو بۆ کلینکەکەی، هەموویان وا لەگەڵیدا مامەڵەیان دەکرد وەک ئەوەی یەکێکە لەخێزانەکەیان... لەماوەی ئەو ساڵەدا کەسایەتی ئیناس پێگەیشتووتربووبوو... بەشێوەیەکی جوان و ناوازە قسەی دەکرد و مامەڵەی دەکرد، کەسایەتیەکی خۆشەویست و کۆمەڵایەتی هەبوو.

زەینەب دەستی کرد بە وانە وتنەوە بە (دوو خوشکەکەی) ئیناس و فاتیمە، دواتر پێکەوە نانیان خوارد... ئیناس دەوریەکانی کۆدەکردەوە و ڕێکی دەخست و سەر مێزەکەی پاک دەکردەوە وەک ئەوەی یەکێکە لەوان... دوای نانخواردن پێکەوە نوێژی نیوەڕۆیان ئەنجامدا، دواتر هەندێ یاریان دەرکرد هەستیان دەکرد یەکەمجارە دەریدەکەن بەهۆی ئیناسەوە. ئامۆژنیش کێکێکی بۆ دروست کردبوون و بانگی کردن و بەدڵێکی خۆشەوە خواردیان. لەپێشتریشدا ئایپاد و تابلێتەکانی لابردبوو بۆ ئەوەی یارییەک بکەن زیاتر هۆگری یەکتریان بکات و دووربن لە ئامێرە ئەلکترۆنیەکان و شاشەکانی...

ئیناس زۆر بە ئاسایی مامەڵەی دەکرد و خودی خۆی بوو، کۆمەڵێ جوڵەی منداڵانەی دەکرد کە تێیدا کپ کرابوون و لە ڤێلاکەدا هیچ بوارێکی نەبوو گوزارشتی لێوە بکات: کچەکانی ئامادە دەکرد بۆ نوێژ، پۆشاکی نوێژەکەی لە فاتیمە دەبرد و دەیکردە بەری و پاشان پێکەوە پێدەکەنین.

زەینەب کتێبی دەخوێندەوە، ئیناس لە پشتی قەنەفەکەوە هات و بەدەستە بچووکەکانی چاوی زەینەبی گرت، زەینەب وتی: کێیە؟ فاتیمەیە؟... ئیناس پێکەنینێکی پاکی منداڵانەی کرد... ئەها ئەنوسە... عومەر وتی: کێ دەتوانێت لەگەڵمدا تەماشای یەکتری بکەین و پێنەکەنین؟ چەند چریەکەک ڕۆیشت و هەردووکیان پێکەوە دایان لە پرمەی پێکەنین.

ئیناس وەک مەلێک وابوو کە لەقەفەسەکەیەوە دەرچووە بۆ باخچەیەک، لەگەڵ مەلەکاندا لەم چڵ بۆ ئەو چڵ دەچێت. هیچ ڕۆژێک ئاوا و هێندە پێنەکەنیوە، تەنانەت لەلای هاوڕێیانی قوتابخانەیشی، بەهۆی زۆر یاریکردنەوە کولمەکانی سوور هەڵگەڕابوو، ئەمەیش زۆر جوانتری کردبوو.

دکتۆر ئەمجەد لەڕێگا نوێژی مەغریبی کرد و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. هەمووان بەدڵخۆشییەکی زۆرەوە پێشوازیان لێی کرد، فاتیمە باسی ئەوەی بۆ کرد ئیمڕۆ چیان کردووە. لەکاتی بەخێرهاتنەوەیدا ئیناس سۆز و تامەزرۆی بەدی کرد لەنێوان مامە و ئامۆژنیدا، مامەی لە تەماشاکردنەکەی تێگەیشت... ئەو دیمەنەی چەندین ساڵە لە دایک و باوکیدا نەیدیووە.

بێدەنگیەکی پچڕان و وتی:

- لەبەر ئەوەی ئیناس هاتووە کونافەیەکی خۆشم ئامادەکردووە، دەوری و کەوچک بێنن کچەکان. لە کەشێکی زۆر خۆشدا کونافەکەیان خوارد، گفتوگۆیان دەکرد و (ئیناس)یش لەگەڵیان دەدوا، باسی ئەو ساتانەیان دەکرد لەگەڵ ئیناسدا بەسەریان بردووە. ئەمجەد گوێی گرتبوو بۆ قسەکانیان، تەماشای برازاکەی کرد کە لەگەڵ منداڵەکانی مامەیدا قسەی دەکرد، خەیاڵی ڕۆیشت:

«ئەم کچە پاک و بێگەردە، چۆن لەو ژینگەیەدا گەورەبووە کە سەمیر باسی دەکرد؟ دەبێت سەمیر ئەوە بکات کە لەسەری ڕێکەوتین؟ ئایا ژیانی لەسەر بنچینەیەکی ڕاست بونیاد دەنێتەوە و تەقوای خودای دەبێت لەخێزانەکەی و ئەم داماوەدا؟»...

کاتی خەوتن هات... شتێکی قورسبوو لەسەر ئیناس و فاتیمە! هەوڵیان دەدا بخەون، یەکێکیان شتێکی بیر دەکەوتەوە و بەوی تری دەوت، هەڵدەستان و کەمێک قسەیان دەکرد و پاشان دەیانوت: تەواو، پێویستە بخەوین. ڕادەکشان پاشان دەگەڕانەوە و بابەتێکی نوێیان دەکردەوە!

لەکۆتاییدا ئیناس وتی:

- فاتیمە...

- بەڵێ...

- تۆ بڵێی لە بەهەشتیش لەم ڕۆژە خۆشتر هەبێت؟

فاتیمە زۆر خەوی دەهات، پێکەنی و وتی:

- بێگومان.

دواتر خەوی لێکەوت، ئیناس کەمێک بیری کردەوە و خەوی لێکەوت.

پێش بانگی بەیانی، ئیناس بەدەنگێکی خۆش خەبەری بوویەوە... مامە ئەمجەدی شەونوێژی دەکرد... ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿إِنَّ فِي

ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ۝٨ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾

واتە: لە ڕواندنی ئەو هەموو ڕوواوەدا بەڵگەی گەورە هەیە، بەڵام زۆربەیان بڕوادارنین و باوەڕناهێنن. بێگومان پەروەردگارت خاوەن دەسەڵاتی بەزەیی دارە.

ئیناس لەنێوان خەوتن و بەئاگاییدابوو، هەموو جارێک هەر گوێی لەو ئایەتەدەبوو... هەتا بانگی بەیانی دا و هەموویان هەستان بۆ نوێژکردن.

کەشێکی بەچێژ و ئیمانی... ئەمجەد سەرقاڵی ئامادەکردنی ڕاپۆرتێک بوو بۆ ئەوەی بڵاوی بکاتەوە... ئیناس لە مامەی نزیک بوویەوە، لەپەنایدا وەستا و دەستی خستە سەرشانی و تەماشای ڕاپۆرتەکەی دەکرد، بەناونیشانی: (بروتین کینیسین (**kinesin**) یەکێک لە خانە سەرسوڕهێنەرەکانی دەمار)، لەگەڵیدا چەندین وێنەی دانابوو، لەکۆتاییدا ئەم ئایەتەی دانابوو:

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ۝٨ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾

- مامە، ئیمشەو هەر ئەو ئایەتەت دەخوێندەوە.
- لەخەوم کردیت ئازیزەکەم؟ هەوڵمدا دەنگم بەرز نەبێت.
- بەپێچەوانە پێم خۆشبوو کە گوێم لەدەنگت بوو..

زەینەب هاتە ژوورەوە...

- باوکە، مامۆستا داوای لێکردووین دارشتنێک ئامادە بکەم...

چ بابەتێک ئامادە بکەم؟

- پێت چۆنە باسی (ئینتیما بۆ ئوممەتی ئیسلامی) بکەیت لەگەڵ هەست کردن بە هیوا و ئازارەکانی و هەوڵدان بۆ شکۆمەندبوونی؟
- زۆرباشە، ئایەتێک هەیە لە بابەتەکەدا باسی بکەم؟

﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ﴾

واتـە: خەڵکینـە! ئـەم ئاییـنـەی کـە ئـەم پێغەمبەرانـە هێناویانـە ئایینەکـەی ئێوەیـە، کـە یـەک ئایینـە و منیـش پەروەردگارتانـم، تەنها مـن بپەرسـتن...

- با بینووسم... چ سوورەتێکە؟
- ئەنبیاء.
- زۆرسوپاس... زەینەب ڕۆیشت... .

(یـەک ئوممـەت)... (ئینتیمـا بـۆ ئوممـەت) ئینـاس ئـەم جـۆرە دەسـتەواژانەی لـە ڤێلاکـە نەدەبیسـت... ئەمانـە ژیانێکـی نوێـی پـێ دەبەخشـی و واتایەکیـش کـە پێشـتر بیـری لـێ نەکردبویـەوە...

کەشـێکی زۆر جوانبـوو... وای نەکـرد ڕێگـری بـکات لـە ئینـاس لـەوەی بـەراورد بـکات لەنێوان باوکـی و مامەیدا... خەونـی ئەوەبوو هەمـان کـەش و چێـژ لەماڵـی خۆیانـدا ببینێـت.

لەمیانـەی ئـەم ڕۆژە ناوازەیـەی ئینـاس لەماڵـی مامـەی بەسـەری بـرد،

سەمیر چی بەسەرهات لەچاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەبو عەزامدا؟
ئایا بەڕاستی سەرەتایەکی نوێ دەست پێ دەکات؟

با بەردەوام بین...

***

 ١٧ 

# حیسابات

دوای ئـەوەی سـەمیر لـە ماڵـی ئەمجـەد دەرچـوو، گەیشـت بـە ئۆفیسـەکەی مامۆسـتا، پێی سـەیر بـوو بـە بێ هیچ مۆعیدێک هاتـووە بـۆ لای. دوای سـڵاویکی وشـکی نێوانیـان، سـەمیر وتـی:

- مامۆستا، بڕیارمداوە ژیانم چاک بکەم،

ئەمە بۆ خۆم و حەنان و خێزانەکەشمان باشترە...

مامۆستا بێدەنگ بوو، سەمیر بە شەرمێکەوە وتی:

-چەندیـن حەرامکـراو لـە کارەکەمانـدا هەیـە: ڕیبـا، فێـڵ، بەرتیـل، دەسـتکاری کردنـی کیلۆمەتـری ئۆتۆمبێلـەکان... ئامـادە نیـم لەسـەر هەمـو ئەمانـە بـەردەوام بـم.

مامۆستا وەک گاڵتەپێکردنێک پێکەنی و وتی:

- حەرامکراوەکان؟!سـەمیر، دەڵێیت توشـی ڕۆحانیات بویتـە سـەرباری کێشـەکانت لەگەل ئەشـرەف و حەنـان...

سـەمیر هەسـتی بـە دوودڵـی دەکـرد چونکـە بـە شـێوازێک قسـەی دەکـرد لەوەتـی مامۆسـتای ناسـیووە ئـاوا قسـەی لەگـەڵ نەکـردوە، چونکە لەبـارەی شـتێکەوە لەگەڵیدا قسـەی دەکرد مـاوەی بیسـت سـاڵە بەشـدارە تیایـدا، بـەڵام هەمـوو هێـزی خـۆی کۆکـردەوە و وتـی:

- مامۆسـتا، نـاوی ڕۆحانیـات نییـە، ئەمـە دینـی منـە. مـن لـە کۆتاییـدا لـە خـودا دەترسـم، باوەڕم وایـە زۆر لـە خـودا دوور کەوتوینەتـەوە.

ئەوەتا ئێستا ژیانم وێران دەکات.

ئەبو عەزام جگەرەیەکی داگیرساندوو و کەمێک جگەرەی کێشا و دواتر وتی:

- سەرسامم بە ئەوەی ویژدانت زیندوو بۆتەوە.

بەڵام دەپرسم:

- کە سەرەتا سروشتی کارەکەم پێ وتی، ترسان لە خودات لە کوێ بوو؟ سەمیر وتی:

- سەرەتا نموونەت بەو تەختەدارانە هێنایەوە کە شەپۆلەکان دەیهێنن و دەیبەن، پێت وتم بۆ هەر تەختە دارێک بەپێی توانای خۆی شتی پێ هەڵدەگرم لە بەها و ئەخلاقدا. کارەکەی ئێمە کوا بەها و ئەخلاقی تێدایە؟!

ئا لێرەدا ئەبو عەزام بە تورەیەوە قسەی کرد:

- ڕێگا نادەم کەس موحاسەبەی من بکات... سەمیر، ئەگەر کارەکەت بەدڵ نیە وازبهێنە.

سەمیر دانی بەخۆیدا گرت و هەمو هێزی کۆکردەوە و بە توندی وەڵامی دایەوە:

- بەم سادەییە؟ باشە، ئەی چی بەرانبەر هەوڵەکانم لەوەبەرهێنانەکانی تۆدا؟ ئەو پێشانگایەی کە ژیانم بۆی تەرخان کرد هەتا بوو بە گەورەترین و بەناوبانگ ترین پێشانگای ئۆتۆمبێل. ماقوڵ نییە تەنها ٤٠٪ قازانجەکەی بۆ من بێت! وەک چۆن ٢٠دەفتەرم کردە کارەکەوە بۆ ئەوەی قەرەبوی ئەو ئۆتۆمبێلانە بکەینەوە کە لەناو چوون... ئەوێ رۆژێ پێت وتم مافت پارێزراوە ناچارت کردم بە ناوی پێشانگاوە تۆماری بکەم، کوا مافم پارێزراوە...

ئەبو عـەزام وەرەقـە و قەڵەمێکی هێنا، تەماشـای چاوی سـەمیری کرد و وتـی:

- بێگومان مافت پارێزراوە.

دواتـر وەرەقەکـەی کـرد بـە دوو بەشـەوە لەبەشـی سـەرەوەی لای ڕاسـت نووسـی:

(بۆ سەمیر)، پاشان وتی:

- (٢٠دەفتەر ئۆتۆمبێلت پێکڕیوە) ئەمەی لە دێڕی یەکەمدا نووسی.

- کۆششـەکانت لـە پێشـانگادا، حـەق بـە تۆیـە، بـا بـە ١٠دەفتـەر بیخەملێنیـن...

- هەوڵەکانـت لـە زنجیـرە چێشـتخانەکاندا و کێڵگـەی پەلـەوەر و نوسـینگەی خانوبـەرە... ئەڵبەتـە زۆرێـک لـە کێشـەکانیت چارەسـەرکردووە، ستەمت لێناکەم، ستەم لـەو حەرامکراوانەیە کە باسـت کـرد! هەوڵەکانـت بـە ٣دەفتـەر دەخەملێنـم.

وەرە با کۆیبکەینەوە: ٢٠ +١٠ + ٣ = ٣٣دەفتەر دۆلار... ..تەواو

لـەلای چەپـی وەرەقەکـە ئەبـو عـەزام نووسـی(ئەوەی لەسـەر سـەمیرە) دواتـر وتـی:

- وەرە با ئەوە هەژمار بکەین کە لەسەر تۆیە:

- ٢٠ سـاڵە لـە ڤێلاکـەی مندایت، کرێـی سـاڵانەی لـە ١٠ملیۆن دینـار کەمتـر نییـە... (١٠کەڕەتی ٢٠)=٢٠٠ملیـۆن...

- ئـەو تەنەکـە ڕۆن و گۆشـت و میوانـەی دەمنـارد بـۆ خـۆت و خێزانەکـەت، چەنـد هەفتەیـە پێـش ئیسـتا حیسـابم کـرد: نزیکـەی ١٥ملیـۆن دینـاری دەکـرد...

- کە خۆت و منداڵەکانتم دەنارد بۆ شوێنە گەشتیاریەکان... ئەوانەی حەنان هەژمار ناکەم... یەک چرکە...

ئەبـو عـەزام یەکێـک لـە فایلەکانـی کۆمپیتەرەکـەی کـردەوە و بـە خێرایـی هەژمـاری کـرد و وتـی: ١٥ ملیـۆن دینـار...

- تێچـووی لـە دایـک بوونـی ئەشـرەف و صـادق، دوو کوڕەکـەت، هێشـتا لـە بیرمـە: ٢ملیـۆن دینـار بـوو...

- ئەو نـاو و ناوبانگەی مـن بۆم دروسـتکردویت، لەگەڵ ئەو کەسـانەی کە پێم ناسـاندویت کە دەتوانیت ئەمـە بقۆزیتـەوە بۆ ئـەوەی سـەر لـە نوێ دەسـت بکەیتـەوە بـە کارکردن... ئەمـە بـە ١٤ دەفتـەر دۆلار دەخەملێنم...

- ئـای، کەوتـەوە یـادم: ئاهەنگـی هاوسـەرگیریەکە ٥ملیـۆن دینـاری تێچـوو...

ئەبو عەزام کەمێک وەستا و سەری خوراند و دواتر وتی:

- نـا نـا، ئەمـە دیـاری منـە بۆ حەنانـی کچـم... تۆش زاوای منـی دەبێت ئاسـانکاریت لەگەڵدا بکـەم.

ئەبـو عـەزام حاسـیبەکەی هێنایـە بەردەسـتی و ژمارەکانـی کۆدەکـردەوە، لەمـەدا جددیەتـی پێـوە دیـار بـوو، وتـی:

-کۆی گشتی ئەوەی لەسەر تۆیە ٣٠دەفتەر دۆلارە... تەواوە...

-ئـەوەی هـی تۆیـە - ئـەوەی لەسـەرتە =٣ دەفتـەر دۆلارت بـۆ دەمێنێتـەوە...

ئەبوعـەزام چەکێکی بانکـی بـۆ نووسـی بـە بـڕی ٣ دەفتـەر دۆلار بـۆ سـەمیر،

پێی وت:

- فەرمـوو، کلیلـی هەمـوو شـتەکان دابنـێ، ئەڵبەتـە سـەرەتا کلیلی ڤێلاکە دابنێ، کلیلـەکان دابنێ و ئـەو چەکـە بانکیـە وەربگرە مافی خۆتە...

سەمیر کە گوێی لەهەموو ئەمانەبوو واقی ورمابوو! لەشوێنەکەی خۆی هەستا و بەبێدەنگی لە ئۆفیسەکەی ئەبو عەزام دەرچوو، بەبێ ئەوەی چەکی بانکیەکە هەڵبگرێت. بەهۆی شۆکبوونەکەیەوە نەچوو بۆ پێشانگا، ڕوویکردە ڤێلاکە... لەڕێگادا بەتووڕەییەوە جۆرەها قسەی بە ئەبو عەزام وت: خیانەتکار! داگیرکەر! هەموو ژیانم خزمەتم کردووە بەتەمایە لەبەرانبەر ئەوەدا ٣ دەفتەر دۆلارم بداتێ! لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکات لەسەر ئەو ڤێلایەی من و کچەکەی و نەوەکانی تێیدا ژیاوین! لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکات لەسەر تێچووی لەدایکبوونی نەوەکانی کە بازرگانی کرد بە ناوەکانیانەوە: (ئەشرەف بۆ ئەوەی دەست بگرێت بە شەرەفەوە) (صادق بۆ ئەوەی لەم سەردەمەدا ڕاستگۆبێت)... هەی درۆزن... تەنانەت پێم ناخۆشە بە (باوکی ئەشرەف) بانگ بکرێم... تەبعەن ئەگەر بڵێم (نەوەی خۆتن) پێم دەڵێت: «بەڵکوو منداڵی خۆتن کە باش پەروەردەت نەکردون هەتا ئەشرەف سومعەی لەکەدارکردین وەک چۆن پێشتر وای وت»! ئەگەر پێی بڵێم: « کچەکەت فەرامۆشی کردون و سەرقاڵبووم بە کارەکانی تۆوە»، بەرگری لە کچەکەی دەکات و یەکسەری باسی ئەو ڕۆژە دەکات کە دایکم وەفاتی کرد! وەک چۆن ئەو ڕۆژە ئاوای کرد...

لەخێراییدا خەریکبوو خۆی بکێشێت بە ئۆتۆمبێلێکدا، شۆفێرەکەی بەتووڕەییەوە دەستی نا بە هۆرندا، بە ئاگا هاتەوە، دواتر ئۆتۆمبێلەکەی لە قەراغی ڕێگاکەدا وەستان، دەستی خستە سەر ناوچاوانی و بە پەشیمانییەکی زۆرەوە وتی: من شێتم؟! چۆن ڕازی بووم ئۆتۆمبێلەکان بەناوی پێشانگاوە تۆماربکرێت لەکاتێکدا بە پارەی خۆم کڕیومە؟! چۆن ڕازی بووم، لەکاتێکدا دەزانم ئەو پیاوە هیچ شتێک نایگێڕێتەوە نە دین و نەڕەوشت؟! هەرگیز بیرم

نەکردبۆوە منیش یەکێک دەبم لەقوربانیەکانی! هاوبەشی ئەوم لە فێڵ و دەسکاریکردنی شتەکان. پێویستبوو پێشبینی ئەم ڕۆژەم بکردایە و مافەکانی خۆمم لە شتێکدا تۆمار بکردایە. بەڵام مەست و سەرخۆشبووم!

سەمیر لە ڕۆیشتن بەردەوامبوو، گەیشتە ڤێلاکە، چووە ژوورەکەی خۆی بۆ ئەوەی بخەوێت. حەنان هات و بەشێوازێکی ناشرین وتی:

- ئیناس لەکوێیە؟!

- لەماڵی مامەی دەخەوێت...

- ئەمە مافی تۆ نییە، خۆم دەزانم ئەتەکێت فێری کچەکەم بکەم، نامەوێت هەندێ نەریت لە ژینگەیەکەوە فێربێت کە نازانم چۆنە. هێندە بەسە کە گواستوتەتەوە بۆ قوتابخانەیەک کە من و دایکم ڕازی نەبووین لەسەری. بچۆ بیهێنەوە. سەمیر بێدەنگبوو.

- دەڵێم بچۆ بیهێنەوە، دەی...

- دەمەوێت بخەوم، ناچم بەشوێنی کەسدا.

حەنان بەتووڕەییەوە جێی هێشت، دوای چەند خولەکێک بەردەوام سۆزانی خەسووی پەیوەندی دەکرد و سەمیر هەڵینەدەگرت، دواتر موبایلەکەی کوژاندەوە و خەوت.

سەمیر ماوەیەکی زۆر خەوت، دواتر لە درەنگانێکی شەودا لەخەو هەستا و بیری دەکردەوە لەوەی دەبێت دوای غەدرەکەی ئەبو عەزام چی بکات، هەر ئەمدیو دیوی بوو، هەستا و کەمێک ئاوی خواردەوە و هەر بیری دەکردەوە...

- خۆم ڕادەستی ئەبو عەزام بکەم و بگەڕێمەوە بۆ ئەوەی لەسەری بووم؟ نەخێر! ماقوڵ نییە... بەم خێراییە ئاموژگارییەکانی ئەمجەد لەیاد بکەم!

- باشە، ئەو سامانەم کە ئەبو عەزام بردویەتی؟! ٢٠دەفتەر دۆلارەکەی کە خۆم خەرجم کردووە؟ واز لەهەمووی بهێنم و کلیلەکانی پێ بدەمەوە؟ مەحاڵە!
- پێویستە کاربکەم لەسەر گەڕانەوەی سامانەکەی خۆم، گەرچی لە پارەی پێشانگاکە و کارەکانی تری ئەبو عەزام بیبەم!
- بەڵام ئەمە واتە مانەوە لەگەڵ ئەو، گەڕانەوە بۆ سەر هەموو ئەو حەرامکراوانەی ئەنجامم دەدا... .
- من ناچارم وابکەم!
- بەڵام ئەم پاساوەبوو منی گەیاند بەم ڕۆژە!

سەمیر جار جارە موبایلەکەی دەردەکرد و تەماشای نامەکانی واتس ئەپی دەکرد بۆ ئەوەی لەو بیرکردنەوەیە ڕزگاری ببێت، وەڵامی هەندێک لەنامەی کڕیارەکانی دەدایەوە.

ویستی پەیوەندی بکات بە ئەمجەدەوە هەتا هەواڵێکی ئیناس بزانێت، بەڵام کاتەکە درەنگبوو، هەروەها ترسا ئەمجەد پرسیاری ئەوەی لێ بکات چی ڕوویداوە.

چووە باخچەی ڤێلاکە و نزیکەی یەک کاتژمێر دەهات و دەچوو... بیری دەکردەوە... لەکۆتاییدا بڕیاری دا:

- نە شیش بسوتێت نە کەباب! دەچمەوە سەر کارەکەم، بەپێی توانا خۆم لەحەرامکراوەکان دەپارێزم، وردە وردە و بەنهێنی پارەکانم لە ئەبو عەزام دەکشێنمەوە، لەم کاتەدا کارێکی تایبەت بەخۆم دادەنێم و واز لەم دەهێنم...

دەستیکردەوە بەو نوێژانەی فەوتابوو، بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ واز لەنوێژ نەهێنێت دوای ئەوەی ئەمجەد ئامۆژگاری زۆری کرد، دواتر کەمێک نانی خوارد و خەوت.

بەدرێژایی ئەو ڕۆژە و دوای ئەوەی سەمیر نووسینگەکەی ئەبو عەزامی بەجێهێشت، ئەبو عەزامیش بیری دەکردەوە و پلانی دادەنا... زاهیری بانگ کرد:

- زاهیر، سەمیر تووشی ڕۆحانیات بووە! پێی وتم: (حەرامکراو لە کارەکەماندا هەیە)... چی وت!حەرامکراو هههههە...
- بە ئاگا هاتۆتەوە! مامۆستا بۆچی لەم کاتەدا ویژدانی زیندووبۆتەوە؟
- نازانم. لەوەیە دوای ڕووداوەکەی ئەشرەف وای لێ هاتبێت.

زاهیر بە مەکرێکەوە وتی:

- وازی لێ بهێنە. خزمەتی خۆت و حەرامکراوەکانیشت دەکەین... ئمممم... یان قورسە بەلاتەوە چونکە زاواتە!
- گرنگ نییە بەلامەوە کە زاوامە، بیرت نەچێت سەمیر هەموو وردەکارییەکان دەزانێت. نامەوێت بگات بەو قۆناغە...
- زۆرباشە، ئەی چی بکەین قوربان؟
- پلانی دەورگرتن: دووری دەخەینەوە لەو مامەڵانەی کە بە بۆچوونی ئەو حەرامی تێدایە! تۆ دەکەم بە وەکیلی ئەو کارانە هەتا ڕزگاری دەبێت لەو ڕۆحانیەتە!
- بەسەرچاوم قوربان!
- هەروەها: کارەخێرخوازیەکان چڕ دەکەمەوە و بەرپرسیاریەتیەکەی دەدەم بە سەمیر. تۆیش ئەو کارانە بکە کە لەبەرژەوەندی خۆماندایە.
- بەسەرچاوم قوربان!
- گرنگترین شت ئەوەیە زاهیر: بەجوانی ئاگات لە سەمیر بێت! چونکە لەقۆناغی داهاتوودا هەوڵدەدات سەروەتی من ببات چونکە

وادەزانێت ستەمم لێی کردووە، ئەو ناکەسە لەهیچەوە دروستم کرد، گومانی وایە ستەمم لێی کردووە! بەجوانی چاودێری بکە و ئاگات لەهەموو شتێکی بێت!

زاهیر چاوەکانی گەشانەوە:

- بەسەرچاو، بەڵام پێویستم بە یارمەتی تۆیە.

- چیت دەوێت؟

- نوسخەیەک لە کلیلەکانم پێ بدە، بۆ ئەوەی شەوێک بچم و بەرنامەی چاودێری بخەمە سەر کۆمپیتەرەکانی پێشانگا و زنجیرە چێشتخانەکان.

- ئەمە ئاسانە.

- گەنجێک هەیە دەمەوێت وەک کارمەند لەلای سەمیر دایبنێیت... دەمەوێت چەند مانگێک لە پێشانگاکە کار بکات...

ئەبو عەزام لە مەبەستی زاهیر تێگەیشت و ڕازیبوو بە داواکاریەکانی.

یەکسەری زاهیر دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی پلانەکە و هەمان شەو بەرنامەی چاودێری لەسەر کۆمپیتەرەکان دانا، لەو دەمەدا سەمیر لە باخچەی ڤێلاکەدا سووری دەخوارد و بیری لەوە دەکردەوە بەرانبەر ئەبو عەزام چی بکات.

لە ڕۆژی دواتردا ئەو پەیامە چییە لەلایەن ئەبو عەزامەوە دەگات بە سەمیر و تووشی شۆکی دەکات و هیوایەکی بۆ دەگەڕێنێتەوە؟

با بەردەوام بین...

***



# ١٨

# تەوبەکردنی ئەبو عەزام!

ڕۆژی دواتر سەمیر لە خەو هەستا و ماوەیەک زۆر لەجێگاکەیدا مایەوە و بیری دەکردەوە، بەتەنیا نانی بەیانی خوارد... بڕیاریدا قسە لەگەڵ ئەبو عەزام نەکات، وەک نەریتی خۆی چووەوە سەر کارەکەی و نیەتی وابوو بەپێی توانا لەحەرامکراوەکان خۆی بپارێزێت، وردە وردەیش دەست بکاتەوە بە گەڕانەوەی سامانەکەی.

دوای ئەوەی چەند خولەکێک بوو گەیشتبووە پێشانگاکە، نامەیەکی نامۆی لە ئەبو عەزامەوە پێ گەیشت!:

- سەمیر، دوێنێ زۆر بیرم لەقسەکانت کردەوە، بۆم دەرکەوت بەشێک لەحەقت پێیە. یەک دەفتەر دۆلار لەبەشی من دابنێ بۆ کاری خێرخوازی بۆ ئەوەی سامانەکەمان پاک بکەینەوە. هەردووکمان هاوکاری یەکتری دەکەین لەو شتەی خودا ڕازی دەکات. هاوڕێیەکم هەیە داوای لێکردوم ئیش بۆ کوڕەکەی بدۆزمەوە. ئیمڕۆ دەینێرم بۆ ئەوەی لە پێشانگا کاربکات.

سەمیر چەند جارێک تەماشای ناوی کەسەکەی کرد بۆ ئەوەی لێی دڵنیابێت!

- بەڕاستی ئەمە ئەبو عەزامە؟ ماقوڵ نییە! ئایا هاک نەکراوە؟ بەڵام جگە لە ئەبو عەزام کەس بە چاوپێکەوتنەکەی دوێنێ نازانێت و واناڵێت: «بەشێک لەحەقت پێیە و بەجۆرێک کار دەکەین خودا

لێمـان ڕازی بێـت! چـی ڕوودەدات؟! ئایـا ئەبـو عـەزام گـۆڕاوە؟! مەحاڵـە!»

ئەی بۆچی هیدایەتی ئەو بەدوور بزانم؟ لەوەیە کاریگەربووبێت بە هەڵوێستەکەم و وازهێنانم لە حەرام...

سـەمیر ورەی بەخۆیدا بـۆ ئـەوەی پەیوەنـدی بـکات بـە ئەبـو عەزامـەوە:

- مامۆستا، پێش سێ خولەک تۆ نامەت بۆ ناردوم؟

- بەڵێ من ناردومە...

سەمیر تفی قوتدا و وتی:

- مامەگیان نازانیت چەندێ دڵم خۆشبوو بەو نامەیە! سەبارەت بە کارە خێرخوازیەکان من پێم وایە سەرەتا مافی خەڵکی بدەینەوە و... .

ئەبو عەزام بەخێرایی وەڵامی دایەوە:

- سـەمیر، کـەس مافـی لـەلای ئێمـە نییـە مامەگیـان، ئەگـەر هـەر پێشـنیازێکت هەیـە وەرە بـۆ ئۆفیسـەکە بـۆ لام.

سـەمیر لەنەفسـی خۆیدا وتـی: بەڵێ، لەوەیە باش نەبێت لەموبایلدا باسـی ئـەو شـتانە بکەین، وەک فێڵکردن و ساختەکردن چونکـە ئەمـە دەبێتـە بەڵگەیەک بەدەستی ئەبو عەزامـەوە.

کۆتایـی بـە پەیوەندییەکـە هێنـا و ڕوویکـردە ئۆفیسـەکەی ئەبـو عـەزام...

لەڕێـگادا بیـری لـەوە دەکـردەوە چـۆن باسـی بابەتـی مافەکانـی خـۆی بکاتـەوە:

«ئەبـو عـەزام کاریگەربـووە بـە قسـەکانم، بێگومـان پـەی بـەوە بـردووە دوێنـێ سـتەمی لـێ کـردوم... بابەتەکـەی لەگەڵدا بکەمـەوە... یان چاوەڕێ بکەم خۆی بیکاتەوە؟ ئایا ئەبو عـەزام ڕاستەکات یان

لەو نامەیەدا شتێکی تری مەبەستە؟ مەبەستی چیە لەوەی دەڵێت حەق بەتۆیە و دەفتەرێک لەبەشی من دابنێ بۆ کاری خێرخوازی؟ ئەسڵەن پێشتر ئەم کارانەی دەکرد بۆ ئەوەی وەک بانگەشە و ڕیکلامێک بێت بۆ وەبەرهێنانەکانی... ئەمجارەیش هەمان شت دووبارە دەکاتەوە؟ باوەڕناکەم چونکە دەزانێت ئەگەر وابکات من پێی دەزانم... .ئەی باشە ئەبو عەزام چی دەوێت؟!»

دووبارە وتی: بۆچی بەدووری دەزانم هیدایەتی وەرگرتبێت؟ خودا ویستی لەسەر کێ بێت هیدایەتی دەدات... بەڵام ئایا ماقوڵە ئاوا بە ئاسانی بگۆڕێت؟!

لەم بیرکردنەوانەدابوو، گەیشتە ئۆفیسەکەی ئەبوعەزام. ئەبوعەزام هەوڵی دەدا ڕووخسارێکی لێبوردە پێشان بدات لەگەڵ پارێزگاری کردن لە هەیبەتی بۆ ئەوەی نێوانی خۆی و سەمیر بپارێزێت.

- فەرموو زاواکەم.

- مامەگیان، بەڕاستی شۆکبووم کە نامەکەتم بینی!

- پێت سەیر نەبێت... لەکۆتاییدا ئێمەیش موسڵمانین... وا لەحەفتا ساڵی نزیک دەبمەوە... سەبارەت بەوەی وتت(مافی خەڵکی دەگەڕێنینەوە)... من نەموتوە بەیەکجار هەموو سروشتی کارەکەمان دەگۆڕین، بەڵام وردە وردە ڕاستی دەکەینەوە، هەر کەسێک بە هەڵە ستەممان لێی کردبێت هێدی هێدی قەرەبووی بۆ دەکەینەوە... بەڵام یەکسەری واناکەین...

سەمیر هەستی کرد ئەبو عەزام وتەکانی دەگۆڕێت... دەڵێت: ( ئەگەر بەهەڵە ستەممان لێیان کردبێت)؟! دەزانێت چەندێ فێڵ و ستەمی کردووە! یەکێک لەوانە منم... یەکێکم لەقوربانیەکانی! ئەم پیاوە چی دەوێت؟!

ئەبو عەزام بێدەنگیەکەی سەمیری بڕی:

- وەک پێم وتیت... دەفتەرێک دۆلار بەشێوەیەکی گونجاو مامەڵەی پێوە بکە و دواتر پێم بڵێ چیت لێی کردووە تەنها بۆ زانیاریی... دەتوانیت پەیوەندی بکەیت بە ئەبو ئەحمەد کە گۆشت هاوردە دەکات و ڕاوێژی پێ بکەیت پارەکان لەچیدا خەرج بکەیت، پیاوێکی زۆرباشە. پێی بڵێ ئەبو عەزام ڕاوێژت پێ دەکات ئەو بڕە پارەیە بدرێت بە چ پرۆژەیەکی خێرخوازی!

ئەبو ئەحمەد پیاوێکی زەنگین و بەڕێزبوو، لەم کۆتاییانەدا ئەبو عەزام مامەڵەی لەگەڵ دەکرد، ویستی وەهای بۆ دەربخات کە کاری خێرخوازی دەکات بۆ ئەوەی دواتر ئەمە سوود بگەیەنێت بە بەرژەوەندییەکانی.

ئەبو عەزام لەقسەکردن بەردەوامبوو:

- مامەگیان، هەندێ شت هەیە قەناعەتت وایە حەرامە ئەنجامی مەدە و بە منیش بڵێ بۆ ئەوەی بەپێی توانا وازی لێ بهێنین، ئێستا هاوڕێیەکم دێت بۆ چاوپێکەوتنم... هیچت پێویستە؟

سەمیر لە نەفسی خۆیدا وتی: هەندێ شت کە قەناعەتم وایە حەرامە؟! ئێمە غەرق بووین لەحەرامدا بەهەموو جۆرێک! بە ئەبو عەزامی وت:

- بۆ نموونە، ئەو ئۆتۆمبێلانەی دەسکاری کیلۆمەترەکانی کراوە، ٣٠ئۆتۆمبێلی ئاوامان هەیە، چیان لێ بکەین؟

- سەمیر، لەسەر وردەکارییەکان پرسیارم لێ مەکە... بەزیرەکی خۆت لەوانەدا کاربکە. ناتوانین ئەوە چاک بکەینەوە، خۆ ئۆتۆمبێلەکان فڕێ نادەین! بە نرخێکی کەمتر بیفرۆشە... بەلام بانرخەکە جێی گومان نەبێت... نەشیش بسوتێ نە کەباب.

- نەشیش بسوتێ نە کەباب، هەمان دەستەواژە کە دوێنێ شەو وتم! ڕێکەوتێکی سەیرە! لەوەیە خەزوریشم حەقی پێ بێت.

سەمیر بەو کارەی پاساوی بۆ خۆی دەهێنایەوە فێڵی کەمتر بکات لەبری ئەوەی بەیەکجاری وازی لێ بهێنێت. پێویستبوو ئەم ڕێسایە لەسەر هەموو حەرامکراوەکانی تر جێبەجێ بکات.

هاوڕێکەی مامۆستا هات، کە بەقەستی چاوپێکەوتنەکەی خستبووە ئەو کاتە بۆ ئەوەی زۆر لەگەڵ سەمیردا نەمێنێتەوە. سەمیر بەخێرهاتنی کرد و ڕۆیشت.

لە ڕێگای گەڕانەوەی بۆ پێشانگاکە بیری دەکردەوە: «بەم شێوەیە، کەی کاتی من دێت هەتا ئەبو عەزام مافەکانم بۆ بگەڕێنێتەوە؟ وەک خۆی دەڵێت وردە وردە شتەکان ڕاست دەکەینەوە؟! ئەگەر وردە وردە قەرەبووی ئەوانە بکاتەوە کە دەشێ بە هەڵە ستەمی لێ کردبن؟! وادیارە زۆری پێ دەچێت... خۆم حەقەکەم دەگەڕێنمەوە و چاوەڕێ ناکەم هەتا نۆرەم دێت! بەڵام بەلایەنی کەمەوە گەرەنتی ئەوەم لێی وەرگرتووە کە حەرامکراوی نوێ نەیەتە کارەکەمانەوە...»

حامید هات، ئەو کارمەندە نوێیەی کە پێویستە سەمیر لە پێشانگاکە دایمەزرێنێت... گەنجێکی زیرەک لە تەمەنی ٢٥ساڵیدا، ڕووخسارێکی بێگەردی هەیە، باش دەزانێت خۆی بگونجێنێت و شوێنی خۆی بکاتەوە، هەتا سەمیر متمانەی پێی کرد و پشتی پێی بەست.

سێ مانگ تێپەڕی... سەمیر زۆربەی ئەو ئۆتۆمبێلانەی فرۆشت کە دەستکاری کیلۆمەترەکەی کراوە! بە نرخێکی کەم، کە تۆماریشی دەکرد نرخێکی کەمتری دەنووسی.

«ئەبو عەزام قەناعەت دەکات بەو نرخە فرۆشتومە، چونکە دەستکاری کیلۆمەترەکەی کراوە»، جیاوازییەکەی بۆ خۆی

هەڵدەگرت. « ئەگەر ئەبو عەزام ئەو نرخانەی پێ کەمبوو، پێی دەڵێم: «خۆت وتوتە بە نرخی کەمتر بیفرۆشە... لەوەیە بڵێت: بەڵام بەوشێوەیەیش نا! پێم وتی بانرخەکە جێی گومان نەبێت... پێی دەڵێم: وام دانا ئەوە نرخی گونجاو بێت!»

سەمیر نرخێکی تری لەسەر پسوڵەکان تۆمار دەکرد.

حامید هەموو ئەمانەی تۆمار دەکرد بەبێ ئەوەی سەمیر ئاگای لێ بێت، هەندێ زانیاری کڕیارەکانی وەردەگرت، دوای چەند کاتژمێرێک لە جێهێشتنی پێشانگا پەیوەندی پێوە دەکرد: (سڵاو بەڕێزم، لە سیاسەتی کارکردنمان ئەوەیە نوسخەیەکی ئەلکترۆنی نێوان خۆمان و کڕیارەکانمان دەپارێزین، ئەگەر ئەرک نییە وێنەیەکی پسوڵەی کڕینی ئۆتۆمبێلەکە بنێریت بۆ واتس ئەپی ئەم ژمارەیە). سەمیر ئاگای لەمانە نەبوو.

لەو ماوەیەدا، زاهیر لەڕێگای ئەو بەرنامانەی لە کۆمپیتەرەکەدا دایتابوو چەندین فیڵی سەمیری بۆ دەرکەوت، لەلایەن خۆیەوە دوو کڕیاری ناردە لای بۆ ئەوەی بەجوانترین شێوە ساختەکارییەکانی سەمیر تۆماربکات.

لەو ماوەیەدا سەمیر لەسەر حسابی خۆی و ئەبو عەزام کاری خێرخوازی ئەنجام دەدا، قەناعەتی بەخۆی کردبوو کە ئەمە تێوەگلانی لە حەرامکراوەکان کەم دەکاتەوە...

ماوەی ئەم سێ مانگە سەمیر بەرەو باشتربوون دەچوو، هەتا ڕادەیەک پارێزگاری لەنوێژەکانی دەکرد، حەنان نەخۆش کەوت، ئەمەیش دەرفەتێکبوو بۆ ئەوەی سەمیر پەیوەندی نێوانیان باشتر بکات، ئیناس زۆر بەمە دڵخۆشبوو. دوای سەردانیە ناوازەکەی چەند جارێک سەردانی ماڵی مامەی کردەوە...

لەکۆتایی ئەم سێ مانگەدا ئەبو عەزام سەمیر و زاهیری بانگهێشت کرد بۆ کۆبوونەوە. ئەبو عەزام بە قەستی وردبینی لە فایلەکانی سەمیردا نەکرد، بەڵکوو زۆربەی کاتەکان تەماشای دەسکەوتەکانی زاهیری دەکرد.

بە قەستی دەسکەوتەکانی زۆر گەورەکرابوون، پێشتر ئەبو عەزام لەمە ئاگاداربوو. سەمیر هەستی بە غیرە و ئیرەیی کرد بەرانبەر ڕکابەرە خراپەکەی! لە کۆبوونەوەکە هاتە دەرەوە و سووربوو لەسەر ئەوەی لە پێشبڕکێکەدا شکست نەهێنێت.

ئەمە واتای چیبوو بۆ سەمیر؟ کەمێک کشانەوە لە بابەتی حەرامکراوەکان! بەجۆرێک قازانجی زیاتر بەدەست بهێنێت و بەرانبەر زاهیر شکست نەهێنێت!

سەمیر دەکشایەوە، ئەبو عەزام لەهەموو ئەمانەدا هیچ تەداخولێکی نەدەکرد، هیچ شتێکی لەسەر سەمیر پێویست نەدەکرد.

لەسەر ئەم دۆخە دوو مانگی تر تێپەڕی، زاهیر و حامید فێڵی زیاتریان دەکرد و ئەو ساختەکارییانەیان تۆمار دەکرد کە سەمیر ئەنجامی دەدا.

ساتی چاوەڕوانکراو هات! ئەبو عەزام هەر سێکیانی بانگ کرد بۆ کۆشکەکەی: سەمیر و زاهیر و... حامید!

چی لەو کۆبوونەوەدا ڕوویدا؟!

با بەردەوام بین...

***



# ١٩

# ڕاستیەکە بە ئیناس دەڵێم!

سـەمیر پێـی سـەیربوو حامیـد ئامادەبـووە، کارمەندێکـی سـادە، بـۆ کۆبوونـەوە هاتـووە... هـەر چواریـان لـەدەوری مێـزە سـپیەکە دانیشـتبوون... ئەبـو عـەزام فایلـی زۆری پـێ بـوو، لەبـەردەم سـەمیردا داینـا و وتـی:

- سـەمیر، پێـم ڕاگەیانـدیـت ئەگـەر لەکارەکانمانـدا حەرامێـک هەبـوو ئـاگادارم بکـەرەوە بـۆ ئـەوەی هـەوڵ بدەیـن خۆمانـی لـێ بپارێزیـن. تەماشـایەکی ئـەو فایلانـە بکـە و ئەگـەر حەرامکراوێکـی تێدایـە پێـم بڵـێ.

سەمیر فایلەکانی کردەوە:

تەماشـا دەکات هەمـوو جیـاوازی نرخـەکان تۆمارکـراوە، لەنێـوان نرخـی حەقیقـی ئۆتۆمبێلـەکان و ئـەو نرخـەیشـی لـە هەژمـاری پێشـانگادا تۆمارکـراوە، مووچـەی ئـەو کارمەندانـە نووسـراوە کـە دەرکـراون و سـەمیر مووچەکـەی بـۆ خـۆی وەرگرتـووە، ئـەو فایلانـەی تێدابـوو کـە لـە کۆمپیتـەری پێشـانگاکەدا شـاردرابوونەوە، کـە تێیـدا سـەمیر خەرجـی و تێچـووی زنجیـرە چێشـتخانەکان و کێڵگـە پەلەوەرییەکانـی تۆمارکـردووە و چەنـد هێنـدەی خسـتوەتە سـەری، بـە ئەبـو عەزامـی وتـوە بـەم نرخـە کڕیومـە، بۆ ئەوەی جیاوازییەکە بۆ خۆی هەڵبگـرێت... چەندیـن کاروبـاری تریـش!

سـەمیری لەکاتـی خوێندنـەوەی ئەمانـەدا ڕەنـگ و ڕووی پـەڕی، زاهیریـش تەماشـای دەکـرد و بـزەی دەکـرد، حامیدیـش تاوێـک تەماشـای سـەمیری دەکـرد و تاوێکیـش ئەبـو عـەزام، ئەبـو عـەزام کەمێک کورسیەکەی بردبووەوە دواوە و قاچی خستبووە سـەرقاچ و جگەرەیەکـی لـێ داگیرسـانبوو، تەماشـای بنمیچەکـەی دەکـرد... .

سـەمیر فایلەکانی داخست و ڕووی گرژکرد و تەماشـای مێزەکـەی دەکرد و دەمی کردبویـەوە وەک ئـەوەی بیر بکاتـەوە...

ئەبو عەزام وتی:

- هـا چیبـوو... هیـچ حەرامکراوێـک هەبـوو؟ چـۆن مامەڵـەی لەگەڵـدا بکەیـن؟

سەمیر بەدەنگێکی نزمەوە وتی:

- تۆ ناچارت کردم ئاوا بکەم.

- بەدیاریکراوی ناچارم کردیت چی بکەیت؟

سـەمیر هەستی دەکرد ئەبو عـەزام هەمـوو شـتێک تۆمـار دەکات بـۆ ئـەوەی بیکاتـە بەڵگـە بەسـەریەوە، زاهیریـش بـە نهێنـی هەمـوو ڕووداوەکانـی ئـەم دانیشـتنەی تۆمـار دەکـرد، سـەمیر وەڵامـی دایـەوە:

- ناچارت کردوم بۆ ئەوەی کە ببینیت!

- سـەمیر، ببینیـت چـی ڕوودەدا ئـەو دەمـەی هێنـدە دەخەینـە سـەر ئـەو تەختانـەی کـە توانـای هەڵگرتنـی نییـە؟ چـۆن بیناکـە دەڕوخێت تۆیـش لەگەڵیـدا دەڕوخێیـت؟

لێرەدا سـەمیر ئـەو گفتوگۆیـەی کەوتـەوە یـاد کە پێش بیست سـاڵ لەنێوانیانـدا ڕوویـدا. کـە ئەبـو عـەزام سـەمیری فێرکـرد پێش ئـەوەی جیهانـە بۆگەنەکـەی پێشـان بـدات:

«سـەمیر هـەر یەکێـک لەئێمـە ژیـان بەجۆرێـک فێـری دەکات، کـە ناتوانێـت لـە زانکـۆ و کۆنگـرە و خولەکانـدا فێـری ببێـت... یەکێـک

لەو شتانەی فێری دەبیت ئەوەیە نموونەیی بوون و بەها باڵاکان بێگومان گرنگن، گرنگە بۆ ئەوەی بە دەروونێکی سەلامەتەوە بژیت و هەست بکەیت لەخۆت ڕازیت. بەڵام ئەگەر بهێڵیت زۆر تەداخولی ژیانت بکات کۆتت دەکەن، هەمووان پێشی تۆ دەکەون، ئەوەی دوادەکەوێت تەنها ئەوە نییە قازانجێکی کەم بکات، بەڵکوو زریانەکە ڕایدەماڵێت، ئێمە لەجیهانێکداین ڕەحم بە کەس ناکات... ئەو پارچانە وەک پارچە تەختەیەک دابنێ، ئۆفیسەکەیش دەریایەک بێت کە با شەپۆلەکانی دەجولێنێت، پارچەکان دێن و دەچن، نزیک دەکەونەوە و دووردەکەونەوە... دەتوانیت لەسەری بینایەکی بەرز بونیاد بنێیت؟... نموونەیی بوون و بەهاباڵاکان لەجیهانی ئێمەدا بەو شێوەیەن: کۆمەڵگا دەریاکەیە، دۆخەکان و گۆڕانکارییەکان و گرفتەکان با کەیە، پارچە تەختەکەیش دەرفەتی ئێمەیە لەم ژیانەدا... ئەگەر ڕۆژێک لەڕۆژان با کە هێور ببێتەوە و پارچە تەختەکان لەیەکتری نزیک ببنەوە و هەوڵ بدەین لەسەر بنچینەی ئەم پارچانە نموونەی باڵا و بەهاکان بونیاد بنێین، لە یەکەمین شەپۆل و یەکەمین شنەی با کەدا چی ڕوودەدا؟!... دەڕوخێت، تۆیش لەگەڵیدا دەڕوخێت! هەتا باڵاتربێت ڕووخانەکە خێراتر دەبێت. هەربۆیە، بە ئەزموونی ئەوەی ٢٥ساڵ زیاترە لەبازاڕدا کار دەکەم بۆم دەرکەوتووە نموونەیی ئەخلاقی و بەهاباڵاکان شتێکی جوانە، بەڵام من ڕێگەی پێ دەدەم بێتە ژیانمەوە بە ئەندازەی ئەوەی دەگونجێت لەگەڵ واقعدا، واتە پارچە تەختەکە هێندە دەخەمە سەری کە دەتوانێت هەڵیبگرێت، ئەوەی دەتوانم پارێزگاری لێ بکەم با کە هەرچۆنێک بێت و شەپۆلەکان چەندێ بەرزبێت. هەربۆیە خۆم دەگونجێنم لەگەڵ پێویستیە ڕووحیەکانم و ئەو واقعەی تێیدا دەژیم. جگە لەمن سووره لەسەر ئەوەی بینای بەرز بونیاد بنێت، بەڵام

کە دەڕوخێت ئامادەیە دەستبەرداری هەموو بەها و ئەخلاقەکانی ببێت و خۆی دەگرێت بە پارچەکانەوە بۆ ئەوەی غەرق نەبێت! نەخێر ئازیزەکەم، کەمێکی بەردەوام باشترە لەزۆرێکی پچڕاو، نە شیش بسوتێت نە کەباب...»

سەمیر هەستی کرد ئەم کەسەیە» ئەو دەمەی دەڕوخێت ئامادەیە دەستبەرداری هەموو بەها و ئەخلاقەکانی ببێت و خۆی دەگرێت بە پارچەکانەوە بۆ ئەوەی غەرق نەبێت!»
پێویستە سازشی زیاتر بکات لەژێر دروشمی «نە شیش بسوتێت نە کەباب!»

سەمیر لەهەموو ئەمانەدا سەری بەرزنەدەکردەوە و هەر تەماشای مێزەکەی دەکرد، وەک خوێندکارێک کە سزا دراوە... داوای مۆڵەتی ڕۆیشتنی کرد و ئەبو عەزام مۆڵەتی دا... و شوێنەکەی بە جێهێشت.
گەیشتە ماڵەوە، ئەمجارە نوێژی نەکرد، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد و کەمێکیش گلەیی لەقەدەری خۆی هەبوو!
سەمیر پێشبینی دەکرد خودا یارمەتی بدات چونکە بڕیاریداوە خۆی چاک بکات، چاوەڕێی دەکرد خودا زیاتر دەرووی لێ بکاتەوە، گەرچی هێشتا تێکەڵبوو لەگەڵ زۆرێک لەحەرامکراوەکاندا...
سەمیر ڕانەهاتبوو بەرپرسیاریەتی کارەکانی خۆی لە ئەستۆ بگرێت، پاساوی بۆ دەهێنایەوە بەوەی لەکاری تردا باشبووە و کاری خێرخوازی زۆر دەکات، پاساوێ تری ئەوەبوو ئەگەر یەکێک لەشوێنی ئەودا بوایە خراپتر دەبوو، هەموو لۆمەکەی خستە ئەستۆی قەدەر کە بەتێڕوانینی خۆی ئەوەی پێ نەداوە کە شایەنیەتی!

بەڵام ئەوەی لەدڵیدابوو لە بەگەورەزانینی خودا سنوورێکی بۆ دانا...

ڕاستە بەکەم تەماشای مافی خودای دەکرد، ڕاستە گلەیی لەقەدەر هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا لەنەفسی خۆیدا دەیوت:

- خودا دانا و کارسازە، پرسیاری لێ ناکرێت لەسەر ئەوەی دەیکات... گەرچی هەموو شتەکانیشم لەدەست بدەم، نامەوێت ئیمانەکەم لەدەست بدەم...

ئیناس چاوەڕێی باوکی دەکرد بۆ ئەوەی لەگەڵیدا نان بخوات... سەمیریش سووربوو لەسەر ئەوەی نانی لەگەڵ بخوات، ئەگەر ڕۆژێک درەنگ بهاتایەتەوە و ئیناسیش خەوتبووایە، ئەوا نانی بەیانی لەگەڵیدا دەخوارد پێش ئەوەی بچێت بۆ قوتابخانە. بەبێ ئیناس ئۆقرەی نەبوو، تاکە کەسبوو کە بەڕاستگۆیی خۆشیدەویست و خەمڕەوێنی بوو.

ئیناس بەوپەڕی دڵخۆشییەوە پێشوازی لەباوکی کرد، بەڵام بە وشکی وەڵامی دایەوە:

- ئەنوس، ئازیزەکەم، ئیمشەو زۆر ماندووم، خۆت نان بخۆ... چوو بخەوێت.

ئیناس تووشی شۆکبوو چوو نوێژی کرد و بخەوێت، بەبێ ئەوەی نانی ئێوارە بخوات، ماوەیەک لەجێگاکەیدا بیری دەکردەوە: باوکم چیەتی؟ چەند مانگە باشبووە بۆچی ئاوا حاڵی گۆڕاوە؟

ڕۆژی دواتر هەستان و پێکەوە نانی بەیانیان خوارد...

- باوکە، چیتە؟ بۆچی ئاوا خەمباریت؟

- هیچ نییە گیانەکەم، هەندێ کێشەی کارەکەمم هەیە...

ئیناس هەستی کرد کارەکە زۆر لەوە قوڵترە، بە نەرمی لەگەڵ باوکی دوا بۆ ئەوەی هۆکاری خەمبارییەکەی بزانێت...

سەمیر بیری لەوە کردەوە هەندێ لە نهێنیەکان بۆ کچەکەی باس بکات و کەمێک دەردەدڵی بۆ بکات، پێویستی بەوەبوو یەکێک گوێی لێ بگرێت، بێگومان دوای ڕوودانی ئەم شتانەیش ناگەڕێتەوە بۆ لای ئەمجەد! وەڵامی ئەمجەد ڕوون و یەکلای کەرەوە دەبێت: (پێم وتیت: واز لە ئەبو عەزام و جیهانەکەی بهێنە و خۆت ڕزگاربکە لەوەی تێیدایت)...

سەمیر بڕیاریدا هەندێک لەڕووداوەکانی بۆ باس بکات، بەوەی لێی تێی دەگات و پەی پێ دەبات، بەبێ ئەوەی خۆی لەبەرچاوی کچەکەیشی بخات!

- زۆرباشە، دوای نانخواردن پێت دەڵێم... .

پێکەوە چوونە باخچەکە، سەمیر بە ئاگادارییەکی زۆرەوە دەستی کرد بە باسکردنی موعاناتەکانی لەگەڵ ئەبو عەزامدا... تەماشای ڕووخساری دەکرد بۆ ئەوەی ئەندازەی شۆکبوونەکەی بزانێت و ڕاستی تاڵی زیاتری پێ نەڵێت!

لەبەرانبەردا ئیناس هەستی دەکرد باوکی شتێکی لێ دەشارێتەوە و هەست بەشەرمەزاری دەکات لەوەی دەیڵێت، هەربۆیە پارێزگاری لە زەردەخەنەکەی دەکرد گەرچی ئەو شتانە تووشی شۆکی کردبوو!

دوای دە خولەک لە باسکردن و بێدەنگبوونی ئیناس، سەمیر لێی پرسی:

- ئەگەر لەجێگای من بیت چی دەکەیت؟

دوای بێدەنگییەکی زۆر بەخێرایی وەڵامی دایەوە:

- واز لەکارکردن لەگەڵ ئەبو عەزام دەهێنم و بەدوای کارێکی حەڵاڵدا دەگەڕێم.

سەمیر شۆکبوو بە وەڵامەکەی و خێرایەکەی و متمانە بەخۆبوونی! بیری کردەوە کامەیان ڕاستە؟ ( نەشیش بسوتێت نە کەباب)؟ یان فیترەتە پاکەکەی ئیناس، کە ڕێک وەک ئامۆژگارییەکەی ئەمجەد وایە؟

- بەڵام باوەگیان، ئەمە واتە ڤیلاکە و هەموو شتەکانی جێ بهێڵین و ژیانێکی زۆر سادە بژین...
- «گرنگ نییە»... ئیناس زۆر بەخێرایی وەڵامی دایەوە!
- گەشتکردن و شوێنی خۆش و خواردنی بەلەزەت نامێنێت!
- باوکە، تۆ بە بوونی ئەوانە بەختەوەریت؟!

سەمیر سەری سوڕما لە پرسیارەکەی! وەک ئەوەی دەنگێکی قوڵ لەناخیەوە دەرچووە و لە ئیناسدا بەرجەستەبووە! بەختەوەرنەبوو لەگەڵ ئەو شتانەدا، بەڵام هەستی بەوە دەکرد ناتوانێت لێی بێ پێویست بێت!

سەمیر بێدەنگبوو، بەڵام دوای ئەوەی هەستی کرد بەجوانی خۆی ئامادە نەکردووە بۆ وەڵامدانەوەی ئامۆژگارییەکانی... وتی:
- گیانەکەم، وەرە خۆت ئامادە بکە هەتا پاسەکە نەهاتووە...

ئیناس چوو بۆ قوتابخانە و سەمیریش چوو بۆ پێشانگا، دەترسا لەوەی ئەبو عەزام ئەنجامی دەدا: فایلەکان تەسلیمی دادگا دەکات؟ دەبێتە کێشەیەکی گەورە بۆم! نەخێر... واناکات... دەزانێت دەتوانم ئازاری بدەم و بەرانبەری بگرم... لەوەیە تەنها داوای ئەو پارانە بکات کە بەدزییەوە لێم بردووە.

ئەوەی نامۆبوو ڕۆژەکان تێدەپەڕین و ئەبو عەزام داوای هیچی لە سەمیر نەدەکرد، تەنانەت داوای گەڕانەوەی پارەکانیشی نەدەکرد! بەنیسبەت ئەبو عەزامەوە، ئەو وانەی فێری سەمیری کرد، قەناعەت پێکردنی بە حیکمەتی دەریا و تەختە! ئامادەکردنی سەمیر بۆ ئەوەی

فەرمانەکان جێبەجێ بکات بەبێ ئەوەی بابەتی (حەرامکراوەکان) بکاتەوە... ئەمە بەس بوو بۆی و هەموو شتێک بوو بۆی!

بەداخەوە، سەمیر دانە بە دانە دەکشایەوە لە ئامۆژگارییەکانی ئەمجەد. لەگەڵ ئەمەیشدا لەنوێژەکانیدا کەمتەرخەمی دەکرد و لەگەڵ حەناندا نێوانی خراپتر دەبوو « کچەکەی ئەبو عەزام، کە بەرانبەر زاهیر و کارمەندە خیانەتکارە سووکایەتی پێ کردم»

لەمیانەی ئەمەدا، برینێک هەبوو لەناخی ئیناسدا بەردەوام قوڵتر دەبوو! برینێک کە ئەو ڕۆژە بۆی دەرکەوت کە باوکی باسی بەشێک لە حەقیقەتی ژیانی بۆی کرد! بەردەوام لەناخیدا دەنگێک هەبوو: هەموو ئەو خۆشیانەی تێیدا دەژین تێکەڵە بە فێڵ و ستەم و حەرام؟!... هەستی دەکرد دەیەوێت خۆی دووربخاتەوە لەم ژینگە ژەهراوییە، خۆی پاک بکاتەوە لەم ژینگەیە، بەڵام چۆن.

ئیناس پەیوەندی زیاتربوو لەگەڵ صادقدا، صادق لەخوێندندا گەیشتبووە قۆناغی ناوەندی، بەفشاری دایک و باوکی زۆربەی کاتەکانی لەماڵەوە بەسەردەبرد، سەمیر دوو مامۆستای تایبەتی بۆ گرتبوو. لەگەڵ ئەمەیشدا صادق غیرەی هەبوو بەرانبەر ئیناس، بەڵام ئیناس هێندە پاک و خۆشەویست بوو، بواری ئەوەی نەدەدا کەس ڕقی لێی بێت! جار جارە کوپێک قاوەی بۆ دەهێنا و لەسەر مێزەکەی دایدەنا و بەڕوویەکی گەشەوە لێی دەپرسی:

- لەگەڵ وانەکانت چۆنیت؟ چیم بۆ دەکرێت بۆت بکەم؟

- سوپاستەکەم ئیناس گیان.

- زۆرباشە، خودا سەرکەوتوت بکات...

به تێپەڕینی ڕۆژگار سۆزی نێوانیان زیاتردەبوو.

صادق بەشێک لەپاکی و ژیری ئیناسی تێدابوو، بەڵام پێویستی بەیەکێکبوو ڕێنوێنی بکات... لەگەڵ ئەوەی جیاوازی نێوانیان حەوت

سالْبوو بەڵام دڵخۆشدەبوو بە قسەکردن لەگەڵ ئیناسدا، چونکە بەجۆرێک گرنگی پێ دەدا کە هەرگیز لەدایک و باوکیەوە نەیدیبوو کە ڕووحیەن زۆر لێوەی دووربوون.

ئەشرەفیش ئاوابوو، تامەزرۆی بینینی ئیناس بوو. هەموو جارێک فاتیمە بە ئامۆژگاری باوکی کۆمەڵێک ئایەت و فەرموودەی دەدا بە ئیناس کە باسی ئارامگرتن و ڕەحمەتی خودای دەکرد، لەگەڵ هەندێ وتەی زۆر کاریگەردا. ئیناسیش بۆ براکەی باس دەکرد و پێی دەدا، هەتا کەمێک لەئازارەکانی کەم ببێتەوە و دڵنەواییەک بێت بۆی.

لەماوەی ڕابردوودا، حەنانیش بەشی خۆی دەبرد لە ئیناس، لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ سەردانی هاوڕێکانی و هاوڕێکانی سۆزانی دایکی. هەردووکیان هەستیان دەکرد ئیناس خۆی بەدوور دەگرێت... ئیناس هەستی بە نامۆی و غوربەت دەکرد لەو ژینگە و شوێنانەی پڕیەتی لەشتی پووچ و هیچ سوودێکی تێدانییە، هەستی دەکرد شوێنی ئەو نییە.

حەنان زۆربەی ئەو کاتانەی لەماڵەوەبوو تەماشای کەناڵەکانی دەکرد و حەزی دەکرد ئیناس لەپەنایدا بێت، بەڵام ئیناس زۆربەی جار لای دایکی جێدەهێشت ئەگەر شتێکی ببینیایە شیاوی تەماشاکردن نییە، حەنانیش تێبینی ئەمەی کردبوو... هەرچەندە بە دوورکەوتنەوەی ئیناس بێزاردەبوو، چونکە لەتێڕوانینی ئەودا هەندێ شت زۆر ئاسایین و ئیناس زیادەڕەوی دەکات لە دوورکەوتنەوەیدا...

حەنان دووبارە دەستی کردەوە بەوەی ڕێگری لە ئیناس بکات بچێت بۆ ماڵی مامەی... داماوە زۆر تکای لێی کرد بەڵام سوودی

نەبوو، سەمیر هێندە سەرقاڵی کارەکانی بوو تەداخولی نەکرد، خۆ ئەگەر تەداخولی بکردایە وەڵامی حەنان ئامادەبوو:
«ئیناس لەماڵی مامەی کۆمەڵێک ڕەفتار فێردەبێت لە ئێمەی دووردەخاتەوە.»

حەنان هەوڵیدەدا ئیناس بەوە سەرقاڵ بکات لەکۆتایی هەفتەدا لەگەڵ خۆی بیبات بۆ کۆشکەکەی ئەبو عەزامی باپیرەی، کە هۆڵی وەرزشکردن و باخچە و شوێنی یاریکردن و جۆرەها باڵندە و حەوزی گەورەی ماسی تێدابوو، بەڵام هەموو ئەمانە لەلای ئیناس یەک ساتی ماڵە جوانەکەی مامە ئەمجەدی نەدەهێنا!

کچەجوانەکەمان ئێستا لەتەمەنی یانزە ساڵیدایە، ڕۆژی هەینی چووە ژوورەکەی باوکی، لەدوای ئەوەی پێکەوە نانی بەیانیان خواردبوو، صادقیش بەتەنیا نانی خوارد و حەنانیش خەوتبوو... ئیناس کوپێک قاوەی بۆ باوکی ئامادەکردبوو، لەبەردەم باوکیدا وەستا، ڕووخساری وەک مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، بە زەردەخەنەیەکەوە وتی:
- باوکە.
- گیانی باوکە.
- دەمەوێت حیجاب بکەم و ببمە باڵاپۆش.

دەبێت وەڵامی سەمیر چۆن بێت؟

***



# ٢٠

# تاقیکردنەوەیەکی سەخت

- (دەبمە بالاپۆش).

سەمیر خۆی ئامادە نەکردبوو ئەو وشەیە لە ئیناسەوە ببیستێت!

چاوی لەسەر لاپتۆپەکە هەڵگرت و بەنامۆی و سەرسوڕمانەوە تەماشای ئیناسی کرد و وتی:

- باوەگیان هێشتا منداڵیت.

- نا باوکەگیان، فاتیمەیش لەتەمەنی مندایە، بڕیارمانداوە لە سبەینێوە لەچک بکەین و ئاوا بچین بۆ قوتابخانە.

- تۆ لە فاتیمە جیاوازیت. دڵخۆشم فاتیمە حیجاب بکات، شتێکی باشە، بەڵام تۆ جیاوازیت لە ئەو، ئێمە ژینگە و ناسراوی تایبەتی خۆمان هەیە، ئەگەر حیجاب بکەیت جیاواز دەبیت لەوانەی چواردەورت.

- باشە خۆ ئەگەر گەورەیش بم و حیجاب بکەم هەر لەوان جیاواز دەبم، واتە کەی مۆڵەتم دەدەی بیپۆشم؟

سەمیر پەشۆکا و زانی لەقسەکانیدا دژیەکی هەبووە، چاوەڕێی ئەوەی نەکردبوو کچەکەی لەسەر بابەتێکی ئاوا قسەی لەگەڵ بکات، هەربۆیە وەڵامێکی تەواوی پێ نەبوو...

تەواوی ساڵی ڕابردوو، سەمیر بێ ئاگابوو لەنەفسی خۆی، بەڵام تەداخولی کەسی نەدەکرد ئەگەر بەکارێک خۆی لەخودا

نزیک بکردایەتـەوە. سـەمیر کەمتەرخەمبـوو لـە پەروەردەکردنـی منداڵەکانیـدا، لـێ گەڕابـوو بگونجێـن لەگـەڵ ژینگـەی چواردەوریـان، بـەڵام ئەگـەر یەکێکیـان بیویستایە لەخـودا نزیـک ببێتـەوە یـان ڕێگاکـەی ڕاسـت بکاتـەوە بەرهەڵەسـتی نەدەکـرد... هەربۆیـە قسـەکانی ئینـاس تاقیکردنەوەیەکـی نـوێ بـوو بـۆ سـەمیر!

سـەمیر خـۆی دەدزیـەوە لـە بیرکردنـەوە لـەو هەڵوێسـتەی وەریدەگرێـت ئەگـەر ئینـاس باڵاپـۆش بێـت، وتـی:

- باوەگیان جارێ تر قسەی لەسەر دەکەین. تۆ هێشتا بچووکیت.

- دایکیشم هەتا ئێستا منداڵە؟!

- دایکت گوێ لەقسەی من ناگرێت.

- باشە، ئەی ئەو کاتەی گوێی بۆ قسەت دەگرت؟!

سـەمیر هەسـتی بـە ئیحراجبوون کـرد، لەهەمـوو ژیانیدا قسـەیەکی ڕەق و ناخۆشـی بـە ئینـاس نەوتبوو، ئیناسـیش هەرگیـز بـەم شـێوازە لەگـەڵ باوکیدا نەدوابوو، لـەم موناقەشـەیەدا زەردەخەنەکـەی نەمابوو، کەمێـک بـە تووڕەییـەوە قسـەی دەکـرد و بەخێرایـی وەڵامـی باوکـی دەدایـەوە. لەڕاسـتیدا، ئینـاس بەوقسـانەی گوزارشـتی دەکـرد لـەو پرسـیارانەی کـە لەناخیـدا کەڵەکەبووبـوون:

« بۆچـی باوکە؟ بۆچـی وەک مامـە ئەمجـەد نیت؟ بۆچـی وەک مامە و ئامۆژنـم سـۆز و میهرەبانـی لەنێوانتانـدا نییـە؟ بۆچـی ئامـۆژگاری وەرناگریـت لـەوەی بەسـەر ئەشـرەفدا هـات؟ بۆچـی چەنـد ڕۆژێـک نوێژ دەکەیت و دواتر دوای دەخەیت و تەمەڵی تێدا دەکەیت؟ چۆن چەندین سـاڵە لەخۆت قبوڵ کردووە لەگـەڵ ئەبو عەزامـدا بمێنیتـەوە و لەسـەر حـەرام بـەردەوام بن؟ لەبەهـەشت لەگەڵـم دەبیـت؟ کـە لـەم دۆخەدایت خـودا لێت ڕازییـە؟ ئەگەر لەبەهەشت لەگەڵم نەبیت چۆن

بەرگەی دووری تۆ دەگرم؟ باوکەگیان تۆم خۆشدەویت، دەزانم تۆیش منت خۆشدەویت، بەڵام ئایا تۆ خودات خۆشدەویت؟ ئەگەر خۆشت دەویت بۆ گوێڕایەڵی ناکەیت؟»

هەموو ئەو پرسیارانە هاتە مێشکی ئیناسەوە ئەو دەمەی باوکی ڕەتیکردەوە حیجاب بپۆشێت، دڵەپاکەکەی بەخێرایی لێی دەدا و بەقسەکانیەوە تووڕەیی دیاربوو.

لەنەفسی خۆیدا وتی: ئەگەر تۆ ناتەوێت ژیانی خۆت چاک بکەیت، واز لەمن بهێنە و ژیانم مەشێوێنە...

حیجاب بەنیسبەت ئیناسەوە دوورکەوتنەوەبوو لەو جیهانە ژەهراوییەی باوکی و باپیری، جیاکردنەوەیەک بوو لەمان... دوورکەوتنەوەبوو لەو ژینگەیەی حەنان و سۆزانی تێدابوو، کە تەنها گرنگی بە ماددیات دەدات و ئەوەی باس ناکرێت لایەنی ڕووحی و قیامەتە...

سەمیر زۆر بەقورسی جڵەوی نەفسی بۆ گیرا بۆ ئەوەی توونند نەبێت بەرانبەر تاقەگوڵی سارای ژیانی، تەماشای لاپتۆپەکەی کرد و وتی:

- باشە باوەگیان، دواتر لەبارەیەوە قسەدەکەین.

- دواتر کەیە باوکە؟ فاتیمە پۆشاکێکی پێ داوم و ڕێکەوتوین لەسەر ئەوەی بۆ قوتابخانە پێکەوە بیپۆشین.

- سبەینێ باوەگیان... سبەینێ پشووە، ناچیت بۆ قوتابخانە.

ئیناس کەمێک ئارام بویەوە، لەباوکی نزیکبوویەوە و ڕوومەتی ماچ کرد و بەبێ دەنگی جێی هێشت.

سەمیر چەند خولەکێک بە بێتاقەتی مایەوە، نەیدەویست بیر لەو بابەتە بکاتەوە، دواتر ڕۆچوو لە حیساباتی پێشانگادا...

ئیناس دەیزانی هێشتا منداڵە و دەتوانێت حیجاب نەکات، بەڵام بۆ ئەو زۆر شتی دەگەیاند: ئاماژەبوو بۆ شەرم و حەیا فیتریەکەی و نەیدەویست لێی وەربگرن، ئاماژەبوو بۆ ئەوەی خودای لەیادە و پەی بەوە دەبات بۆ ئەوە لێرەیە بە خۆشەویستی و گەورەدانانەوە خودا بپەرستێت، ئاماژەبوو بۆ ڕاستگویی و دڵنیایی و ئاسوودەیی کە لەماڵی مامە ئەمجەدیەوە وەریگرتبوو... پەرژینێک بوو بۆ ئەوەی نەچێتە بازنەی بێ ئاگاییەوە، سەرسام نەبوو بەو ژیانەی تێیدابوو لەڤێلاکە و بەزایەچوونی دایبابی و براکانی... ئیناس ڕقی لە خۆشگوزەرانی و سەرکەوتن لەقوتابخانە و کارکردن نەبوو، هەموو ئەمانە لەماڵی مامەکانیدا هەبوو، بەڵام موسەخەریان کردبوو بۆ ڕازیبوونی خودا. ئیناس ڕقی لەوەبوو دایک و باوکی و ژینگەکەیان ڕۆچوونە لەدونیادا، خودا و قیامەتیان لەیاد کردبوو، حیجاب و باڵاپۆشی بۆ ئیناس ئەوەی دەگەیاند باڵەکانی ناکەن و بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمانی ئیمان و بەختەوەری دونیا و قیامەتی.

ئیناس ڕۆژی پێشتر بەدایکی ڕاگەیاندبوو کە بڕیاری داوە حیجاب بکات، پێشبینی ئەوەی کردبوو دژایەتی بکات... بەڵام ئەوەی بینی تەنها دژایەتی و بەرهەڵەست کردن نەبوو، بەڵکوو لە هستریا دەچوو! بە چاوێکی دوژمنانە تەماشای ئیناسی کرد:

- حیجاب؟! لەم تەمەنەدا؟! وەڵڵا هەر لەمەمان کەمبوو! هاوڕێکانم تۆ ببینن بە حیجابەوە... گەمژەبووم کە ڕێگەمدا بچیت بۆ ماڵی مامەت. جارێکی تر ئەو وشانە نەڵێیتەوە... چەندێ دەتەوێت نوێژ بکە و قورئان بخوێنە... بەڵام باسی حیجاب مەکە، هەمووی گێلی و گەمژەیی خۆمبوو ڕێگەم دایت بچیت بۆ ماڵی مامەت.

ئیناس شۆکبوو دایکی ئاوا بە ناشرینی وەڵامی دایەوە... بە دایکی وت:

- هەتا ئەو ڕادەیە ڕقت لە حیجابە؟!

- من ڕقم لێی نییە... موسڵمانم گەرچی حیجابیش نیم... تۆ جارێ منداڵیت باسی حیجاب مەکە...

هەربۆیە ئیناس پەنای بۆ باوکی برد پشتیوانی بکات... بەڵام وەڵامدانەوەکەی ئەویش بێ هیوای کرد...

ئەو ڕۆژە تێپەڕی... لەڕۆژی دواتردا، یەکەمین شت کە هات بە هزری سەمیردا ئەوەبوو: چی بە ئیناس بڵێم ئەگەر بابەتەکەی کردەوە؟

بیری کردەوە و دواتر وەڵامی خۆیی دایەوە: بڕواناکەم باسی بکات، لەوەیە هەر ویستبێتی لاسایی فاتیمە بکاتەوە... منداڵن و لاسایی یەکتری دەکەنەوە... جارێکی تر ئاوا نارەحەتم ناکات. بەبێدەنگی نانی بەیانیان خوارد،

ئیناس بەزەردەخەنەیەکەوە کە دوودڵی لەپشتەوەبوو وتی:

- باوکە، هەواڵێکی خۆشم پێیە، پیرۆزباییم لێ بکە.

- پیرۆزە، چییە گیانەکەم؟

- ان شاءالله سبەینێ بە حیجابەوە دەچم بۆ قوتابخانە... ئەمەیە... فاتیمە بەدیاری پێیداوم.

سەمیر بزەیەکی بۆ کرد و دواتر دەستیکردەوە نانخواردن بۆ ئەوەی تەماشای چاوەکانی ئیناس نەکات، کەمێک بیریکردەوە و وتی:

- باوەگیان دوای دوو مانگ ئاهەنگێکی گەورەمان هەیە، خۆت دەزانیت ئاهەنگێکی چەندێ ناوازەیە، ئەگەر بە حیجابەوە بچیت لەوانەی چواردەورت جیاواز دەبیت و لەگەڵیان ناکرێیتەوە.

سەمیر حەقیقەتەکەی بۆ کچەکەی باس نەکرد، ئەویش ئەوەبوو ئەگەر ئاوا بچێت لەلای ناسراوەکانی خۆی و ئەبوعەزام ئیحراج دەبێت.

ئیناس بە وەڵامەکەی باوکی تووشی شۆک کرد:

- باوکە ئەسڵەن لەدوای ئیمڕۆوە ناچم بۆ ئەو ئاهەنگانە... چەندین شتی تێدایە خودا پێی ڕازی نییە.

سەمیر کەمێک شڵەژا و وتی:

- ئێمەیش ئەو شتانە ئەنجام نادەین کە هاوڕانین لەگەڵیان، بەڵام ناتوانین لەکۆمەڵگا دابڕێین، دڵخۆشم بەوەی نوێژ دەکەیت و حەزدەکەم لەسەری بەردەوام بیت. بەڵام ئەگەر لەسەرووی توانای خۆمان هەڵبگرین لەژینگەیەکدا کە هاوکاریمان ناکات، تێک دەشکێین.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانبوو، لەم قۆناغەدا سەمیر زۆر ڕقی لە ئەبو عەزامبوو، بەڵام زۆرێک لە تەبیعەتەکانی ئەوی وەرگرتبوو، بە لۆژیکی ئەو قسەی دەکرد(لۆژیکی دەریا و تەختە)... .وەک چۆن ناوی ئەشرەف و صادقی بۆ مەرامی شەخسی خۆی بەکارهێنا، سەمیریش ئیناسی بۆ مەرامی شەخسی خۆی بەکاردەهێنا.

ئەڵبەتە، ئیناس هیچ قەناعەتی بەقسەکانی باوکی نەکرد، نەیویست بەو دووفاقیەیە بژی کە باوکی دەیەوێت، بەم قسانەی پێگەی لەدڵی ئیناسدا کەمتربوو... بەبێدەنگی ڕۆیشت و لەژوورەکەی خۆیدا زۆر گریا.

ئەمجارە بەجێی هێشت بەبێ ئەوەی ماچی ڕوومەتی بکات، بەبێ هیچ موناقەشەیەک و وەڵامدانەوەیەک بەجێی هێشت! سەمیر هەستی بە سوکایەتی کرد، چونکە ئیناس وای لێکرد ڕووبەڕووی نەفسی خۆی ببێتەوە، بەڵکوو قێز لەخۆی بکاتەوە! وەک ئەوەی زللەیەکی بەهێزی لێ دابێت...

بێ ئاگایی لەلای سەمیر ئاسانبوو، بەڵام دژایەتی کردنی چاکە و فیترەتە

پاکەکەی کچەکەی زۆر سەختبوو بەلایەوە!

ئایا ئەم هەستکردنە پاڵنەری دەبێت بۆ ئەوەی سازش بۆ کچەکەی بکات و نەچێت بۆ ئاهەنگەکەیش؟ نەخێر! لەبەرئەوەی ئاهەنگەکە دڵخۆشی دەکات؟ نەخێر، بەڵام ترسی هەیە وازی لێ بهێنێت! سەمیر گەیشتبوو بە قۆناغێک کە ئالوودەبووانی ماددەهۆشبەرەکان پێی دەگەن! چێژی لەهیچ شتێک وەرنەدەگرت، بەڵام لە دەرهاوێشتەکانی وازلێهێنانی دەترسا...

لەبەرانبەردا، ئیناس زۆر شتبوو بۆ سەمیر، لەگەڵ ئەمەیشدا وردە وردە ڕادەهات لەنیعمەتی بوونی ئەو لەژیانیدا... .بەرژەوەندی و بەختەوەری ئەوی پشت گوێ خست لەپێناو ئەوەی لەلای ناسراوەکانی ئیحراج نەبێت.

ڕۆژی دواتر ئیناس بەدڵشکاوییەوە چوو بۆ قوتابخانە... فاتیمە حیجابێکی جوانی پۆشیبوو و هاوڕێکانی پیرۆزباییان لێ دەکرد... بە ئیرەییەوە تەماشای کرد و ئاواتەخوازبوو لەشوێنی ئەو بێت... ئەوەی ڕوویدابوو بۆ فاتیمەی گێڕایەوە، فاتیمە دڵنەوایی کرد و پێی وت: بەهەرحاڵ پشووی وەرزی یەکەم نزیکە، بۆ وەرزی دووەم هەوڵیان لەگەڵ دەدەینەوە...

دوو کچۆڵە نەیاندەزانی وەرزی دووەم چ شتێک چاوەڕێیانە!

حەنان پەیوەندی کرد بە دایکیەوە و باسی ئەوەی کرد کە لەنێوان خۆی و ئیناسدا ڕوویداوە... سۆزانیش هەستی کردبوو کە ئیناس خۆی بەدووردەگرێت و ئاسوودە نییە بە ژینگەی چواردەووری... .بڕیارێکی توندی دا...

چ شتێکە؟
هەڵوێستی سەمیر چۆن دەبێت؟
چۆن کاریگەری دەخاتە سەر ژیانی ئیناس؟

با بەردەوام بین.

***



# ٢١

# بێلایەنیەکی درۆزنانە

سۆزان پەیوەندی بە (سەمیر)ەوە کرد:

- سـەمیر، ئینـاس لەقوتابخانەیەکـی نیودەوڵەتـی تۆمـار دەکـەم، ئـەو قوتابخانەیـە لەگـەڵ ئاسـتی خێزانـی ئێمـەدا دەگونجێت. پێشـتر بۆیـە ڕازیبـووم لـەو قوتابخانەیـە تۆماربکرێت چونکـە نەخۆشـبوو، ئێسـتا نەخۆشـیەکەی نەمـاوە و زۆرباشـە. بیگـوازەرەوە.

- بەرگەی دووری فاتیمەی ئامۆزای ناگرێت.

- ئەسـڵەن مـن و حەنـان ڕازی نین هاوڕێیەتـی ئـەو ئامۆزایـەی بـکات. ئینـاس زیـاد لەپێویسـت بۆتـە ڕۆحانـی، ئەمەیـش لـەلای هاوڕێکانـم و هاوڕێکانـی حەنـان ئیحراجمـان دەکات. لەفەڕەنسـاوە بەدلەیەکـی جوانـم بـۆی هێنـاوە ڕەتیکـردەوە بیپۆشـێت بەپاسـاوی ئـەوەی گونجـاو نییـە! فاتیمـە زۆر کاریگـەری لەسـەری هەیـە و منیـش پێـم خۆش نییـە. با مـاوە مـاوە فاتیمـە بێت بۆ ڤێلاکـە و سـەردانی ئینـاس بکات، بـەڵام نابێـت لـەو قوتابخانەیـە بمێنێتـەوە، بیگـوازەرەوە.

- ئەگەر ئیناس ڕازی بێت، دەیگوازمەوە.

- تۆ دەزانیت ڕازی نابێت... پێم بڵێ؟ دەیگوازیتەوە؟

- جارێکـە زووە و هێشـتا خوێندنـی ئەمسـاڵ کۆتایـی نەهاتـووە. بـۆ خوێندنـی سـاڵی داهاتـوو موناقەشـەی دەکەیـن.

- هەتا کۆتایی ساڵ چاوەڕێ ناکەم، بۆ وەرزی دووەم ناهێڵم لەو قوتابخانەیە بێت. ئەگەر ناتەوێت نەقڵی بکەیت خۆم دەزانم چۆن دەیکەم... بەبێ ماڵئاوایی کردن پەیوەندییەکەی داخستەوە.

لەپشووی وەرزی یەکەمدا ئەبو عەزام ئیناسی گواستەوە بۆ قوتابخانە نیودەوڵەتیەکە، بەبێ ئەوەی پێویست بە واژووی دایک و باوکی بکات.

فاتیمە و ئیناس بەمەیان نەدەزانی... سۆزان و حەنانیش زۆرترین کات ئیناسیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد، زۆرترین دیاریان پێشکەش کرد:

مەیک ئەپ، بازنەی ئاڵتون، عەزیە، ئایپاد... لە وەرشەیەکی موبایل سۆزان بە نەوەکەی وت:

- ئازیزەکەم، موبایلت بۆ بکرم؟ بە پاکی و بێگەردیەوە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، پەیوەندی دەکەم بە فاتیمە و زەینەبەوە.

ئیناس هۆکاری ئەم گرنگی پێدانە زۆرەی نەدەزانی، هەتا دایکی بردی بۆ قوتابخانە نوێکەی بۆ ئەوەی پۆشاک و کتێب وەربگرن. لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزین:

- دەی دابەزە دایەگیان...

- ئەمە چ شوێنێکە؟!

- قوتابخانە نوێکەتە.

- چ قوتابخانەیەک؟! نامەوێت لەقوتابخانەکەی خۆم بڕۆم.

- ئەمە باشترە بۆ تۆ.

- ئەی فاتیمە؟

- کارمان بەو نییە... تۆ لە قوتابخانەیەکیت ئەویش لە **قوتابخانەیەک.**

ئینـاس شـۆکبوو... زۆر تکای کرد بـەڵام بێسوودبـوو... ڕەتیکردەوە پۆشـاک و کتێب وەربگرێت... کە گەڕانـەوە بۆ ماڵـەوە بەخێرایی چوو بۆ لای باوکی، کە خۆی ئامادە دەکرد بۆ چوون بۆ پێشـانگا:

- باوکە، نامەوێت بـچم بۆ ئـەو قوتابخانەیە، دایکم دەیەوێت بە زۆر بمبات،

باوکە نامەوێت بـچم... تخوا بمگەڕێنەوە بۆ قوتابخانەکەی فاتیمـە.

- باوەگیـان مـن تـۆم نەقڵ نەکـردووە... مـن پێـم وتـن واز لەئینـاس بهێنـن!

- وازیان لێ نەهێنام. تخوا بمگەڕێنەوە، تخوا...

ئینـاس بـە تـرس و بێتاقەتیـەوە تەماشـای باوکـی دەکـرد، ئەویـش بەرگـەی نەدەگـرت بەوشـێوەیە بیبینێت.

لەڕاستیدا، سـەمیر ئەگـەر بیویسـتایە دەیتوانـی ئینـاس بگەڕێنێتـەوە، ئەگـەر بابەتەکـە پەیوەنـدی بەتەندروسـتی ئیناسـەوە هەبوایـە دەیگەڕانـدەوە. بـەڵام ئێسـتا دوو لایـەن ناکۆکـن: لەلایەکـەوە نایەوێت دڵـی ئینـاس بشـکێنێت، بەڵکـوو دڵخۆشـە بـەوەی فاتیمـە کاریگـەری هەیـە لەسـەری، حـەزی دەکـرد کچەکـەی لەخـۆی باشتربـێت.

بـەڵام لەلایەکی تـرەوە هەسـتی دەکرد ئینـاس لێـی دووردەکەوێتـەوە بەهۆی ئەوەی ئیناس کاریگەری فاتیمە و خێزانی مامەی لەسەربوو! ئەوەی لەیاد نەچووبوو کە خستیە بەردەم حەقیقەتی نەفسی خۆی... پێشتر بانگی دەکرد و پرسیاری لێ دەکرد و بەپەرۆشیەوە بابەتی لەگەڵدا دەکردەوە... ئێستا ئیناس زۆر بەکەمی قسـەی لەگـەڵ دەکات، بەکەمی دەستپێشـخەر دەبێت و بابەتی لەگەڵدا دەکاتـەوە، بەزۆر خۆی دڵخۆش پیشـان دەدات و لەنەفسیدا شتێک هەیە بەرانبـەری! سـەمیر بەرگەی ئەمە ناگرێت، بەرگەی ئـەوە ناگرێت کچەکەی لێی دووربکەوێتـەوە و جیاوازبێت لـە ئـەو... کەواتە پێویستە یەکێکیان بگۆڕێن بۆ ئـەوەی پێکـەوە بگونجێن.

سـەمیر نایەوێت بگۆڕێت، لـەو کاتـەی لەنوێژی بەیانیدا قورئان خوێندنـی پێشـنوێژەکە ڕایچەڵەکانـد کـە یەکەمجـاری بـوو بـگات بـە ئەبـو عـەزام، سـەمیر کاتێکـی دانابـوو بـۆ ڕۆچوونـی لەژیانـدا: سـەرکەوتن تۆماربکات، پـارە کۆبکاتـەوە، خـۆش بـژی... پاسـاوەکەی ئەوەبـوو: هەتـا نەفسـی ئـارام دەگرێـت و بـە جەوێکـی سـافەوە ڕوو دەکاتـە خـودا.

ئەوەتـا هەمـوو ئەوانـەی بەدەسـتهێناوە و دەروونـی ئـارام نییـە، بەڵکـوو ئـاوی دونیـا تەنهـا تونیەتـی زیـاد کـردووە!

لەگـەڵ ئەمەیشـدا ئـەو پاڵنـەرەی لەدەسـتداوە کـە دەتوانێـت بیگۆڕێـت. کەواتـە پێویسـتە ئینـاس بگۆڕێـت. ئـەو دەیەوێـت پێکـەوە بگـەن بـە ئاسـمانی ژیـان، ئەمیـش دەیەوێـت بلکێـت بـە قـوڕاوی زەوییـەوە. چارەسـەرەکە ئەوەیـە باڵەکانـی بکـات.

سـەمیر پـەی بـەوە بردبوو چەندێ قێزەونـە باڵەکانی کچێکی بێ تـاوان بکەیـت و ببیتـە لەمپەرێکـی گـەورە لەبەردەمیدا، پاسـاوی بـۆ خـۆی هێنایـەوە کـە ئـەم ئـەو ڕۆڵـە نابینێت، بەڵکـوو حەنـان و دایکـی وادەکـەن! قەناعەتـی بەخـۆی کردبـوو ئـەم بێلایەنیـە سـوودی دەبێت و دەیبورێـت. نەیدەویسـت بەرپرسـیاری ئـەم کارە وەربگرێـت، بـەڵام بـە ئەنجامەکانی ڕازیبـوو!

ئینـاس تەماشـای سـەمیری دەکـرد و دەسـتی گرتبـوو بـە کراسـەکەیەوە و تـکای لـێ دەکـرد، لەکۆتاییـدا سـەمیر قسـەی کـرد:

- پەیوەندی بەمنەوە نییە، من نەقڵم نەکردویت...

ئینـاس هەسـتی بـە بێ هیـوای کـرد، نەیتوانـی هیـچ بڵێـت... دەسـتی لەکراسـەکەی باوکـی بـەردا و دووبـارە چـوو بـۆ ژوورەکـەی خـۆی و دەسـتیکردەوە بـە گریـان...

وەرزی دووەم دەستی پێ کرد، فاتیمە بیری ئیناسی دەکرد، ئەمەی بۆ باوکی باسکرد و پەیوەندی کرد بە (سەمیر)ەوە:

- سەمیر، ئیناس باشە؟ دوو ڕۆژە نەهاتووە بۆ قوتابخانە؟!

- زۆرباشە... چووە بۆ قوتابخانەیەکی نیودەوڵەتی...

ئەمجەد شۆکبوو:

- بەڵام ئەگەر ئیناس و فاتیمە پێکەوەبوونایە زۆر سوودیان وەردەگرت، وەک دوو خوشکیان لێ هاتبوو.

- دەزانم، من نەقڵم نەکردووە... دایکی و نەنکی سووربوون لەسەر ئەوە.

- بۆچی؟

- نازانم، لەدایکی بپرسە.

- منیش پەیوەندیم بەدایکیەوە نییە! تۆ باوکی ئەویت و بەرپرسیاریت لێی.

- نەقڵیان کردووە و تەواوبووە. بەهەرحاڵ فاتیمە دەتوانێت بێت بۆ ماڵەوە بۆلای ئیناس، ماڵی مامەی خۆیەتی کەی هات سەر سەر و سەرچاومان.

ئەمجەد تێگەیشت چی دەگوزەرێت و بەتوورەییەوە وتی:

- زانیوتانە فاتیمە کاریگەری هەیە لەسەر ئیناس، لەبری ئەوەی پێتان خۆشبێت دەتانەوێت سنوورێکی بۆ دابنێن و وەک خۆتانی لێ بکەن! فاتیمە نانێرم بۆماڵی ئێوە.

- ئەمجەد، نەقڵەکە بووە و تەواو. کچی خۆمە و ئازادم.

ئەمجەد دەنگی بەرزکردەوە:

- کچی تۆیە... کچی ئاوا شایەنی تۆ نییە!

خوات لەگەڵ... پەیوەندییەکەی داخستەوە.

- شایەنی نیم؟! بۆچی شایەنی نیم؟! ئەگەر شایەنی نەبومایە خودا پێی نەدەبەخشیم. ئەمجەد لای خۆی دیندارە کەچی قسەی ئاوا دەکات!

سەمیر پەی بەوە نەبرد کە تەنها شایەنی ئیناس نییە، بەڵکوو هەموو ئەو نیعمەتانەی تێیدابوو، شایەنی هیچی نەبوو! چونکە شوکرانەی ئەو نیعمەتانەی نەدەکرد. نەیدەزانی لەم دونیایەدا خودا نیعمەت دەبەخشێت بە بەندە چاک و خراپەکان، دواتر لەقیامەتدا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات. ئەگەر شوکرانەی نەکەن لێیان دەسەندرێتەوە یان بەرەکەتەکەی نامێنێت. لەم قۆناغەدا سەمیر چێژی لەهیچ نیعمەتێک نەدەبرد گەرچی ڕووکەشەکەی مابوو: ماڵ، هاوسەر، کاری باش، سەروەت، منداڵ... بەڵکوو بەوانە سزا دەدرا، بەڵام بوونی ئیناس لەژیانیدا سەرچاوەی ئاسوودەیی بوو بۆی، وای لێ دەکرد هەست بکات « خودا خۆشی دەوێم. هەڵەم هەیە، بەڵام خێری زۆریشم هەیە، کاری خێرخوازی دەکەم. ئەگەر کەسێک لەشوێن و ژینگەی مندا بوایە خراپتری دەکرد. ئەگەر شایەنی ئیناس نەبومایە خودا پێی نەدەبەخشیم».

هەربۆیە، سەمیر قسەی براکەی لەیاد کرد و وای دانا لەتووڕەییا وای وتوە... لەدەمێکدا ڕۆژێک لەڕۆژان ئەم قسە دێتەوە یادی!

ئیناس لەگەڵ قوتابخانە نوێکەیدا نەدەگونجا... ژینگەیەک کە خودای نەدەهێنایەوە یادی بەڵکوو دووفاقی باوکی دەهێنایەوە یادی. مامۆستاکانی وەک ئەوانی پێشتر پێشەنگ نەبوون، هاوڕێکانیشی وەک فاتیمە نەبوون...

شتێک هەبوو ئازاری دەدا، ئیناس هاوڕێ تازەکانی زۆر خۆشدەویست، بەزەیی بەواندا دەهاتەوە چونکە هەستی دەکرد

پەڕەکانینان هەڵدەکێشرێت وەک چۆن پەڕی باڵەکانی خۆی هەڵکێشراوە! ئاواتەخوازبوو لەگەڵ خۆیدا بەرزیان بکاتەوە بۆ بەهەشتی دونیا کە لەماڵی مامەیدا بینیبووی. بەڵام ئیناس لەو تەمەنەدا پێویستبوو سەرەتا خۆی بەرزببێتەوە. قورسبوو بەلایەوە دووربێت لەهاوڕێکانی و ڕووی گەش نەبێت لەگەڵیان و قسەی خۆشیان بۆ نەکات، کە لە قوتابخانەکەی فاتیمە ڕاهاتبوو لەسەر ئەمانە... ئاواتەخوازبوو، بەڵام نەیدەتوانی، بۆ یەکەمین جار لەناخەوە شکا!

حەنان دیاری بۆ هێنابوو: سێتی نوێژکردنی بۆ هێنابوو، لە ئاوریشمی گرانبەها دروست کرابوو، لەبەرانبەردا ئەو حیجابەی لێ سەند کە فاتیمە پێی دابوو، سێتەکەی تریشی بۆ هێڵایەوە کە فاتیمە بەدیاری پێی دابوو...

ئیناس ئەوەی دایکی بەکارنەهێنا و هەر بەوەی فاتیمەوە نوێژی دەکرد!

ئیناس زۆربەی کاتەکانی لەژوورەکەیدا بەسەر دەبرد... بیری دەکردەوە، هەندێ جار ئەو کتێبانەی دەخوێندەوە کە زەینەبی ئامۆزای پێی دابوو.

صادق بیری ئیناسی دەکرد، بیری کوپە قاوەکەی و قسە شیرینەکانی دەکرد.

چوو بۆ لای تەماشا دەکات بووکەڵەکەی (هودا)پێیە کە مامە ئەمجەدی بەدیاری بۆی هێنابوو... ئیناس هێندە گەورەبووبوو کە ئیدی ئەو بووکەڵەیە بۆ تەمەنی ئەو نەدەبوو، بەڵام (هودا) جیهانەکەی ماڵ مامەی دەخستەوە یادی، فاتیمە و ڕۆژەخۆشەکانی بیردەخستەوە... صادق بینی پۆشاکی نوێژەکەی کردووەتە بەری (هودا) و تەماشای دەکات...

بێدەنگیەکەی پچڕان:

- ئینساس ئەوە چیتە؟

- دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانەکەی فاتیمە.

صادق ویستی دڵنەوایی بکات، بەڵام ڕانەهاتبوو لەسەر ئەو ڕۆڵە، پێشتر ئیناس هیمەتی ئەمی بەرزدەکردەوە.

دوای ئەم گۆڕانکارییانە ئیناس و باوکی چوون بۆ سەردانی ئەشرەف. ئەشرەف تێبینی ئەوەی کرد ئیناس گۆڕاوە. قسەیەکی بە ئەشرەف وت سەمیریش گوێی لێبوو: ئەشرەف، تەنها تۆ موعاناتت نییە.

ئەشرەف و باوکی وایانزانی مەبەستی ئەوانەیە کە لەگەڵیدان لە زیندان، بەڵام لەڕاستیدا مەبەستی شتێکی تربوو!

حەنان و دایکی هەستیان بە خەمباری ئیناس دەکرد، وێنای ئەوەیان نەکرد کە تاکە هۆکار قوتابخانەکەیەتی، بەتایبەت قوتابخانە نوێکەی جوانتر و خۆشتر و ڕاقی ترە. وایان دانا هۆکارەکەی قۆناغی هەرزەکاری و باڵغبوونە، هەربۆیە بردیان بۆ لای دکتۆرێکی دەروونی... ئیناس ئەمەی زۆر پێ ناخۆشبوو، داوای لێبوردنی لەدکتۆرەکە کرد بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی.

لەکۆتاییدا، کاتی ئاهەنگەکە هات... چەند کاتژمێرێک پێش ئەوەی دەربچن دەنگی حەنان بەرزبوویەوە: ئەم عەزیە دەکەیتە بەرت.

- نایکەم.

- دەیکەیت.

- ناتوانم.

- تیتا لە فەڕەنساوە بەتایبەتی بۆ تۆی هێناوە، بەمەوە دەبیتە جوانترین کچ.

- گونجاو نییە، پۆشتە نییە.

- باشە ئەمە بکە.

- ئەوەش ناکەم، هەر نامەوێت بێم بۆ ئاهەنگەکە...

- شێتی تۆ! دەبێ بێیت، ئەو ئاهەنگەیە دەمێکە چاوەڕێی دەکەین.

حەنان پەی بەوە نەدەبرد ئەوەی دژایەتی دەکات لە ئیناسدا (ئەو ڕەفتارە سەیرانە نییە کە لە فاتیمەوە وەری گرتووە) بەڵکوو شەرمێکی ئافرەتانەیە و لە فیترەتە پاکەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە...

دوای موناقەشەیەکی زۆر، ئیناس - بەخەمبارییەوە- هاتە دەرەوە و عەزیەیەکی پۆشیبوو وەک عەزیەی شازادەکان وابوو، سەر ئۆتۆمبێلەکەی دایکی کەوت، لە بەردەم دەرگای هۆڵی ئاهەنگەکەدا گەیشتن بەسەمیر. هەردوو هاوسەرەکە هاتنە ژوورەوە و ئیناس لەنێوانیاندا بوون.

ئیناس زۆر جوان و شۆخوشەنگ بوو!

بەڵام لەیەک شتی کەمبوو: ئەو زەردەخەنەیەی بەم دوایانە ڕۆیشت و نەیتوانی ئەو ڕۆژە بیخاتەوە سەر لێوەکانی.

سەمیر مکوڕبوو لەسەر ئەوەی ئیناس لەگەڵ خۆی ببات بۆ یەکێک لەمێزەکان، هات بۆ ئەوەی لەحەنانی وەربگرێت، حەنانیش ڕەتیکردەوە چونکە ئەویش بەسەر هاوڕێکانیدا دەیگێڕا بۆ ئەوەی گوێی لێ بێت کە بەشانی جوانیەکەیدا هەڵدەدەن. نزیکبوو لەبەرچاوی ئەو خەڵکەدا ببێت بە دەنگەدەنگیان، بەڵام فریای خۆیان کەوتن و برانیانەوە، حەنان کەمێکی تر گێڕای و ڕادەستی سەمیری کرد.

سەمیر چوو بۆ ئەو مێزەی یەکێک بازرگانە گەورەکانی لێبوو، هەوڵی دەدا پەیوەندییەکی بازرگانی لەگەڵیدا هەبێت و دەست

بکات بەکارێکی نوێ دوور لەڕێکخراوەکانی ئەبو عەزام. سەمیر بەشانازییەوە کچەکەی بە بازرگانەکە ناساند:

- ئیناسی کچمە.
- ماشەڵڵا، چۆنیت مامەگیان؟
- الحمدلله.
- بەڕێز سەمیر ئەم هەموو جوانیە چییە؟ ڕێک دەڵێی شازادەکانە.

سەمیر گەشایەوە، دەیویست گوێی لەو جۆرە قسانە بێت، دەیویست بەو شێوەیە کەسایەتی خۆی بگەیەنێت: کە پیاوێکی گەورە و بەڕێز و خاوەن شکۆیە بەڵگەیش بۆ ئەمانە: ئیناسە!

سەمیر مکوڕبوو لەسەر ئەوەی بەدرێژایی قسەکردن لەگەڵ بابای بازرگاندا ئیناس لەپەنایدا بێت، لەدەمێکدا باسەکە باسی بازرگانیە و هیچ پەیوەندیەکی پێوە نییە، بەڵام سەمیر دەیویست وەک دیکۆرێک بەکاری بهێنێت بۆ ئەوەی (مامۆستای نوێ) هەست بەمەزنی سەمیربکات.

بەدرێژایی ئەو ماوەیە ئیناس هەستی بەسوکایەتی پێکردن دەکرد، هەستی بە خراپی دایک و باوکی دەکرد! ئیناس هیچ چێژێکی وەرنەدەگرت و دڵخۆشیش نەبوو بەو پیاهەڵدانانەی گوێی لێ دەبوو، چونکە بۆچوونی ئەوانی بەلاوە گرنگ نەبوو، ئەو دەمەی بیرکەوتەوە کە ئامۆژنی بە زەینەبی دەوت: «تۆ جوانیت، هەموو کچێکی باش جوانە و قەشەنگە بە پاکی و ئەخلاق و دینەکەیەوە. ئێمە ڕووکەشی دەرەوە ناکەینە پێوەر بۆ بڕیاردانمان لەسەر کەسەکان... ئەو کچانەی ئاوا بیر دەکەنەوە لەکۆتاییدا ڕقیان

لەشێوەی خۆیان دەبێت و ڕێز بۆ خۆیان دانانێن بەهۆی شتێکەوە کە دەستی خۆیانی تێدا نییە». ئیناس یاری لەگەڵ فاتیمە دەکرد و گوێی لەم قسانەبوو، بەڵام لەناخیدا چەسپا و ئیدی بەو پێوەرە تەماشای خەڵکی دەکرد... بەپێوەری ڕووکەش زەینەب کچێکی ئاسایی بوو، فاتیمەیش بەوشێوەیە... بەڵام ئیناس جوانیەکی لە ڕووح و دڵیاندا بینی کە لەهەموو ئامادەبووانی ئاهەنگەکەدا نەیبینی! بەزەیی بەوانەدا دەهاتەوە کە تەنها ستایشی ڕووکەشیان دەکرد، هەستی دەکرد دوورن لەو جیهانە جوانەی کە ئەم دەیزانێت!

ئاهەنگەکە کۆتایی هات، هەرسێکیان گەڕانەوە بۆ ڤێلاکە. سەمیر چووە ژوورەکەی بۆ ئەوەی بخەوێت، حەنانیش چووە ژوورەکەی خۆی، ئیناسیش چووە ژوورەکەی خۆی و نوێژی عیشای کرد، دواتر نەیتوانی بخەوێت لەتاو بیرکردنەوەدا. ئیناس بڕیاری خۆیدا.

دەبێت بڕیارەکەی چی بێت؟

قەدەر بەرەو کوێی دەبات، کە ئیناس و باوکی پێشبینیان نەکردبوو؟

با بەردەوام بین...

***



# ٢٢

# ڕۆژێکی نائاسایی

ڕۆژی دواتر سەمیر لەخەو هەستا... خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بچێت بۆ پێشانگا... دوێنێ ئێوارە لەگەڵ ئیناس نانی نەخواردووە پێویستە نانی بەیانی لەگەڵ بخوات، لەلای دەرگای ژوورەکەیدا وەستا، ئیناس هودای بەدەستەوەبوو تەماشای دەکرد، لەپەنایدا جانتای قوتابخانەکەی دانابوو، خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی بچێت بۆ قوتابخانە نوێکەی...

سەمیر بە زەردەخەنەوە بانگی کرد:

- «ئەنوس گیان، وەرە پێکەوە نان بخۆین ئازیزەکەم». ئیناس چاوی بڕیە چاوی -بەبێ زەردەخەنە- بۆ چەند چرکەیەک... تەماشاکردنێکی نوێ بوو، تووڕەییەکی تێدابوو کە ئەدەب جڵەوی گرتبوو، لەسەر ڕووخسارە جوانەکەی... دواتر وتی:

- برسیم نییە... .هودای لەبەردەم خۆیدا دانا و کتێبەکانی کردە ناو جانتاکەی. سەمیر تێگەیشت بچکۆلەکەی لێی تووڕەیە چونکە وەڵامی داواکارییەکەی نەداوەتەوە و دوێنێیش چوونە بۆ ئەو ئاهەنگە، بیری کردەوە لەپەنایدا دابنیشێت بۆ ئەوەی ڕازی بکات و ئاشتی بکاتەوە، بەڵام سۆزی باوکایەتی کپ کرد و لەنەفسی خۆیدا وتی:»دەبێت ڕابێت، دەمەوێت لەگەڵ خۆم و ژینگەی چواردەورم ڕابێت، نەبەرگەی دووری ئەو دەگرم، نە بەرگەی

ئەوە دەگرم لەمن جیاوازبێت. بابەتەکە لەسەر کات وەستاوە و ڕادێت»

ڕۆیشت و بەتەنیا نانی خوارد و ئیناس نانی نەخوارد.

پاسی قوتابخانە هات و ئیناس ڕۆیشت و دواتر سەمیر چوو بۆ پێشانگا، ڕۆژێکی ئاسایی بوو لە پێشانگا، ڕۆژێکی ئاسایی بوو بۆ حەنان کە درەنگ لەخەو هەستا و بەتەنیا نانی خوارد، هەتا لەقوتابخانەوە پەیوەندییەکی بۆ هات و تووڕەییەکەی بەرانبەر ئیناس زیادی کرد! هەر زوو چووە باخچەکە و بەرانبەر دەرگاکە دانیشت و چاوەڕێی پاسی قوتابخانەکەی دەکرد، جگەرەیەکی داگیرساند - لەم کۆتاییانەدا دەستی کردبووە جگەرەکێشان- لەتووڕەییدا قاچی دەکێشا بەزەویدا.

دوای نیو کاتژمێر لەو پەیوەندییە، ژمارەیەکی نەناسراو پەیوەندی کرد بە (سەمیر)ەوە... سەرقاڵبوو لەگەڵ کڕیارێکدا و پەیوەندییەکەی داخستەوە، چەند جارێک پەیوەندییەکە دووبارەبوویەوە... سەمیر بەتووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ؟!

- بەڕێز سەمیر، باوکی ئیناس؟

- بەڵێ، ئێوە کێن؟

- بەرپرسیاری پەیوەندییەکانم لە قوتابخانە... بەڕێز سەمیر، ئەو پاسەی کە ئیناسی تێدابوو... ئم... مممم.

سەمیر پەشۆکا: چیەتی؟

- تووشی ڕووداوی هاتوچۆبووە، خوێندکارەکان گوازراونەتەوە بۆ چارەخانەی ڕەحمە.

- ئیناسی تێدایە؟

- بەداخەوە بەڵێ.
- چی لێهاتووە.
- نازانم...

سەمیر پەیوەندییەکەی داخستەوە و بە کڕیارەکەی وت:

- کارێکی بەپەلەم بۆ هاتوەتە پێش.

بەخێرایی چوو بۆ چارەخانەی ڕەحمە.

بەشێک لەکەسوکاری خوێندکارەکان لەهۆڵی چاوەڕوانی بوون، برینی کوڕ و کچەکانیان کەم و مامناوەندبوو... پرسیاری ئیناسی کرد:

- لە چاودێری چڕە! بەرەو ئەوێ بەڕێکەوت بەڵام نەیانهێشت بچێتە ژوورەوە، دوای چەند خولەکێک دکتۆرێک هاتە دەرەوە ماندوویی پێوە دیاربوو...
- دکتۆر، تکات لێ دەکەم، ئیناس دۆخی چۆنە؟
- جەنابتان کێن؟
- باوکی ئەوم.

دکتۆرەکە بێدەنگبوو، سەمیر ڕەنگی گۆڕا و قورگی وشکبوو، دڵی هێندە بەخێرایی لێی دەدا خەریکبوو بێتە درەوە!

دکتۆرەکە نەیتوانی تەماشای ڕووخساری بکات، تەماشای سەر زەوی کرد و وتی:

- براجوانەکەم، ئارام بگرە... زۆر بەداخەوە پێت دەڵێم:

ئیناس کۆچی دوایی کردووە...

سەمیر بەرەو ژوورەکە ڕۆیشت... چووە ژوورەوە... دکتۆرەکە بەخەمبارییەوە ڕاپۆرتی مردنەکەی دەنووسی و دوو پەرستارەکەیش دەگریان... ئیناس لەسەر قەرەوێڵەکەبوو، وەک ئەوەی بە ئارامی خەوتووە، خوێنبەربوونی مێشک لەگەڵ چەند برینێکی کەم لەلای

سـەریەوەبوو، کورسـیەکەی پەنـای جانتاکـەی و جلـی نوێژەکـەی لەسـەربوو کـە خەڵتانـی خوێنبووبـوو...

سـەمیر بەرگـەی ئـەم دیمەنـەی نەدەگـرت... هەسـتی دەکـرد تەماشـای ڕووداوی کەسێکی تـر دەکات، نـەک ڕووداوی ژیانـی خـۆی، لـە ئینـاس نزیکبوویـەوە و وتـی:

- ئەنوس، هەستە گیانەکەم...

ئەنوس هەڵنەسا!

بەهێمنـی ڕایوەشـاند، ناوچاوانـی مـاچ کـرد کـە خوێنەکـەی پێـوە وشـکبووبووەوە:

- ئەنوس، هەستە باوەگیان... هەستە.

دکتۆرەکە پێی وت:

- ئارام بگرە براکەم... خوا ڕەحمی لێ بکات.

سـەمیر ئـاوڕی دایەوە و دەسـتی دکتۆرەکـەی لەسـەر شـانی لادا و بەتووڕەییـەوە وتی:

- ئـەو نەمـردووە، تەمەنـی یانـزە سـاڵە، نەمـردووە... پێکەنینێکـی هسـتری کـرد و گەڕایـەوە بـۆ لای ئینـاس، دەسـتەکانی گـرت، هێشـتا دەسـتەکانی گـەرم و نەرمبـوون:

- ئەنوس گیانەکەم، هەستە باوەگیان.

چەنـد خولەکێـک تێپەڕی و سـەمیر وردە وردە تێدەگەیشـت لـەوەی ڕوویـداوە، بـەڵام بەبـێ ئـەوەی بەڕاسـتی بزانێـت، لـەلای ئـەو هێشـتا مابـوو.

سەمیر دەستی کرد بەپەیوەندی کردن بەوانەی نزیکن لێوەی:

- «ئینـاس هیلاکـە... لەچارەخانـەی ڕەحمـەیە»، پەیوەنـدی کـرد بـە حەنانـەوە، کـە چەندیـن جـار پەیوەنـدی کردبـوو بـە قوتابخانـەوە و کـەس وەڵامـی نەدابویـەوە.

ئـەو پەیوەندییـە چیبوو پێش کاتژمێرێک بۆ حەنـان هـات و وای لـێ کرد بەتووڕەییـەوە چاوەڕێی هاتنـەوەی ئینـاس بکات؟ پەیوەندییەک بوو لەلایـەن سـەرپەشتیاری پۆلەکـەی ئیناسـەوە، تێدا وتبووی:

- خاتـوون، ئینـاس ئیمڕۆ زۆر ئـەرێنی بـوو، لەگـەڵ هاوڕێکانیدا زیاتـر گونجابوو، دەروونـی زۆر ئارامبوو، ئێمـە زۆر بەمـە دڵخۆشـبووین، بـەڵام پۆشـاکی نوێژی پۆشـیبوو بـە پاسـاوی ئـەوەی خوێندکاری کوڕ و مامۆسـتای پیـاوی لێیـە! وەک خۆتـان دەزانـن خاتـوون ئەمـە وادەکات جیـاواز بێت لەهاوپۆلەکانی...

ئینـاس ئـەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش و ئـەرێنی بـوو چونکـە بڕیـاری دابـوو فاتیمەیەکـی نـوێ بێت بۆ ئیناسـەکانی قوتابخانەکەی! بڕیاریدابوو هیـچ کەسـێک ڕێگری لـێ نـەکات لـەوەی بـەرەو باڵابـوون سـەربکەوێت، هیـچ کەسـێک فیترەتـە پاکەکـەی تێک نـەدات. ئـەو واتـا و ئامانجانـەی حیجـاب هەڵگریـەتی بەنیسـبەت ئیناسـەوە بـواری دواخسـتنی نەبـوو، نەیدەویسـت ڕابێت لەسـەر ئـەوەی لەبیری بکات و بەبێ ئـەوە بژی. دایکی حیجابەکـەی فاتیمـەی لـێ سـەندبوو، ئەویش بۆ بەرجەسـتەکردنی ئـەو واتایانـە تەنهـا پۆشـاکی نوێژەکـەی دەسـت کەوتبوو، بەوەوە چوو بۆ قوتابخانە گەرچی بچووکیش بـوو، کـە هاوڕێکانـی بـەو شـێوەیە بینیـان پێـی پێکەنیـن و وایانزانی گاڵتەیان لەگەڵ دەکات، بەڵام دواتر قسـەیەکیان لێوە بیسـت کە لەگـەڵ شـتێکی قوڵـی ناخیانـدا دەدوا.

حەنـان هیـچ لـەو واتایانـە تێنەگەیشـت! هەمـوو ئـەوەی بەلایـەوە گرنگبـوو ئەوەبـوو کچەکـەی زۆر جیـاواز دەرکەوتـووە، چ حەیـا چوونێکـە ئەگـەر هاوڕێکانـی بەمـە بزانـن! هەربۆیـە چاوەڕێـی دەکـرد کچەکـەی بـەو دیمەنـە ئابڕووبـەرەوە ببینێـت لـەو دەمـەی لـە پاسـاکە دادەبەزێـت! بـۆ ئـەوەی سـەرکۆنەی بـکات و کارێکـی پـێ بـکات جارێکـی تـر لاسـایی فاتیمـە

نەکاتەوە!

حەنان خان ئیسراحەت بکە! ئیناس مرد و هەرگیز جارێکی تر نایەتەوە!

حەنان هات بۆ چارەخانە، کە زانی کچەکەی مردووە لەتاودا بورایەوە، دواتر ئەبوعەزام و خێزانەکەی و براکانی سەمیر هاتن: ئەمجەد و سەعید و عاسم و تالەی خوشکی و منداڵەکانیان... هەمووان تووشی شۆکبووبوون! ئیناس لەلای هەموویان خۆشەویستبوو گەرچی زۆر کەم لەگەڵ بنەماڵەی ماڵ باوکیدا تێکەڵبووبوو...

سەمیر لەجێی خۆی وشکبووبوو، نەقسەی دەکرد نە دەگریا، جانتا و پۆشاکی نوێژەکەی ئیناسی بەدەستەوە گرتبوو کە خەڵتانی خوێنبووبوو. یەکێک لەبراکانی ڕێکارەکانی بەخاکسپاردنی ئیناسی گرتە ئەستۆ...

لە دیمەنی ماڵئاواییدا، دیمەنی فاتیمە لەهەمووان بەئازارتر بوو: وەک منداڵەکانی تر نەدەترسا، بەڵکوو لەلای سەریەوە دانیشت و ماچی سەری دەکرد، فرمێسک بەکوڵمە سوورەکانیدا دەهاتە خوارەوە، دواتر خۆی دەدایەوە بەسەریدا و دەگریا و لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد.

ئیناس هێندە جوان و گەشاوەبوو دەتوت خەوی لێکەوتوە، سپی بوو وەک ئەو کفنەی کرابووە بەری... بەڵام ژیانی تێدا نەمابوو!

باوکی و صادق و براکانی نوێژیان لەسەر کرد، بەڵام ئەبو عەزام و زاهیر لە دەرەوەی مزگەوتەکەبوون.

ئیناس بەخاک سپێردرا... ئەمجەد و صادقی برای چوونە ناو گۆڕەکەی و وەریانگرت، گۆڕەکەی لەپەنای گۆڕی نەنکیدابوو... صادق زۆر لەسەر گۆڕەکەی گریا هەتا ئەمجەد هەڵیساندەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ سەمیردا بڕواتەوە.

لەو ماوەیەدا هیچ شتێک لەسەمیرەوە دەرنەکەوت کەجێگەی

بەزەیی بێت! واقی وڕمابوو، بە کورتی وەڵامی ئەوانەی دەدایەوە کە سەرەخۆشیان لێی دەکرد!

هەستی بە شتێکی نامۆ دەکرد! ئاواتەخوازبوو خۆری ئەو ڕۆژە ئاوا نەبێت... ئاوابوونی واتە دۆسیەی ئەو ڕۆژە دەپێچرێتەوە، کە تێیدا مردنی ئیناس نووسراوە، دەڕوات و هەرگیز ناگەڕێتەوە! هێشتا سەمیر هیوایەکی مابوو کە گوێی لەدەنگێک بێت و بڵێت:

هەڵەیەک ڕوویداوە، ئەوەی مردووە ئیناس نییە... ئەوە ئیناسمان دۆزیەوە...

خۆری ئەو ڕۆژە ئاوابوو، هێدی هێدی تاریکی باڵی دەکێشا بەسەر هەموو شتێکدا، لەگەڵ ئەوەیشدا تاریکی باڵی دەکێشا بەسەر دڵی سەمیردا و ئاواتەکەی لەناودەبرد کە بیسەری ئەو دەنگە بێت! دڵەڕاوکێ و خەمی زیادی دەکرد...

ئەو ئاواتەی بەتەواوی لەناوبرا کە مامۆستا ڕایگەیاند پرسەکەی لەکۆشکەکە دەبێت... لەگەڵ ئەمەیشدا، سەمیر بەخەمبارییەوە وەستابوو... بە ئۆتۆمبێلەکەی لەگەڵ صادقدا چوون بۆ شوێنی پرسەکە...

پێشوازیان لەخەڵکی کرد، حەنان لەوێ مایەوە، سەمیر و صادق گەڕانەوە بۆ ڤێلاکە، صادق زۆر هیلاکبوو یەکسەری خەوی لێکەوت، تەنها سەمیر مایەوە کە بەخێرایی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی بەسەردا تێپەڕی، لە ئیناسەوە تەنها جانتاکەی و پۆشاکی نوێژەکەی بۆ مابوویەوە.

ئەو شەوە چۆن شەوێکی یەکلای کەرەوەبوو لەژیانی سەمیردا؟

با بەردەوام بین...

***



# ٢٣

## بێ هیوات کردم!

سـەمیر لەبـەردەم دەرگای ژوورەکـەی ئیناسـدا وەسـتا... تەماشـای ئـەو شـوێنەی کـرد کـە بەیانـی تێیـدا بـوو ئـەو دەمـەی چاوی بڕییە چاوی و نەیزانی کۆتـا نیگای دەبێت... بەترسـێکەوە چووە ژوورەکـەی! جانتاکـەی لـەو شـوێنەدا دانـا کـە بەیانـی لێـی دانرابـوو، دواتـر تاکەکانـی ئینـاس دەگـەڕا، سـەمیر ئـەو ڕۆژەی هاتـەوە یـاد کـە دایکی وەسـیەتەکەی لـە دۆلابەکـەدا بەجێهێشـتبوو لـە پەنـای جێگاکەیـدا پێـش مردنـی. بەرگـەی ئـەوەی نەدەگـرت تەماشـاکردنەکەی ئینـاس کۆتـا تەماشـاکردن بێت، بەدوای کاغەزێک یـان پارچـە کاغەزێکـدا دەگـەڕا کـە لەسـەری نوسـرابێت «باوکـە لێت عاجـزم بـەڵام خۆشـم دەوێـی». ئـەو دڵـە بچوکانـەی هاتـەوە یاد کـە بـە منداڵـی دەیکێشـا و لـە ناوەڕاسـتیدا دەینووسـی باوکـە... سـەمیر زۆر گـەڕا و هیچـی دەسـت نەکـەوت، ناچاربـوو ئـەو پەیامـە بخوێنێتـەوە کـە لـە پۆشـاکی نوێژەکەیـدا بـوو، پێشـتریش وێنـای ئـەوەی کردبـوو لـەو دەمـەی تەماشـای ڕووخسـاری کـرد و پێـی وت: برسـیم نییـە...

نامەکـەی خوێنـدەوە: مـن برسـی نانێـک نیـم کـە خزمەتکارەکـە ئامـادەی دەکات، بەڵکـوو برسـی دڵخۆشـی ڕۆحمـم، بـۆ ماڵێـک پڕ بێـت لـە ئیمـان و خۆشـەویسـتی و میهرەبانـی... سەرسـام نیـم بـە

ژیانی ئێوە، ناسیاوەکانتان بەلامەوە گرنگ نییە، ئاوریشمەکەتان زبرە، ڕووناکیەکەتان دڵم تاریک دەکات...

لێم گەڕێن، ئەگەر لەگەڵ من بەرزنابنەوە لێم گەڕێن. ئێوە بەختەوەر نین، بۆچی دەتانەوێت منیش ڕابکێشنە دونیاکەی خۆتانەوە کە پڕە لەقەرەبەختی؟!

من مرۆڤێکم کە خودا ڕێزی لێ ناوم، دیکۆری هیچ کەسێک نیم، بەشێک نیم لە دەرکەوتنی کەسێک، کەس بۆی نییە باڵەکانم بکات لەو دەمەی تامەزرۆم بۆ ئەوەی لە فەلەکی خۆشەویستی ئافرێنەرەکەمدا بفرم. کەس ناتوانێت شتێکم بەسەرمدا بسەپێنێت کە پێچەوانەی فیترەت و حەزەکانی ڕۆحمە.

باوکە، نازانیت لەدوای ئەم ژیانە ژیانێکی تر هەیە؟! ویستم ڕێنوێنیت بکەم بۆی، لەگەڵ تۆدا هاوبەش بم بۆ ئەوەی بەتۆ شادومان بم... «باوکە، وەرە پێکەوە نوێژ بکەین»، «باوکەماڵەوەمان زۆر ناخۆش و تاقەت پڕوکێنە، کەمێک واز لە سەرقاڵیەکانت بهێنە و ئاوڕێک بدەرەوە بۆ ئەوەی بارودۆخی خێزانە هەڵوەشاوەکەت بونیاد بنێیتەوە»، «باوکە، واز لەجیهانەکەی باپیرم بهێنە و وەرە پێکەوە ژیانێکی خۆش دەست پێ بکەین و پڕ بێت لەحەلاڵ»... بەلام تۆ دەتەوێت لە گۆڕی بێ ئاگاییەکەتدا بمێنیتەوە... کەواتە وازم لێ بهێنە و لەگەڵ خۆتدا زیندانیم مەکە!

تکام لێ کردیت: «باوکە، بمگەڕێنەوە بۆ قوتابخانەکەی فاتیمە، بهێڵە پەیوەندیم هەبێت لەگەڵ جیهانی مامە ئەمجەد و خێزانەکەی، کە لەلای ئەوان شتانێکم دەسکەوت تۆ و دایکم نەتانتوانی پێشکەشمی بکەن... تۆ ڕەتی دەکەیتەوە بە ڕۆڵی خۆت هەستیت و بمگەڕێنیتەوە بۆ قوتابخانەکەی فاتیمە، چونکە تۆ دەتەوێت

وەک ئێوە بم، ئەو خێرەی تێمدایە لەناوی ببەن لەدوای ئەوەی زیاتربوو لەوەی ئێوە دەتانویست!»

«باوکە، ئەدەبەکەم زمانی گرتوم، بەڵام ناتوانم چاوەکانم بگرم پێت نەڵێن:

بێ هیوات کردین!»...

سەمیر ئەم پەیامەی خوێندەوە کە بە خوێنی ئیناس واژوو کرابوو، بە مۆری قەدەر مۆرکرابوو لەژێریدا نووسرابوو: لەبەر ئەمانە... تۆ شایستەی نیت!

ئەم دەستەواژەی ئەمجەد بەشێوەیەکی ترسناک ڕایچەڵەکاند... سەمیر وەک نکوڵی کردن سەری ڕاوەشاند: «نا نا» سەمیر نەیدەتوانی پەیامەکە بەڕاست بزانێت، نەیدەتوانی وێنای ئەوە بکات کە ئیناسی لێ وەرگیراوەتەوە چونکە شایستەی نەبووە... نەیدەتوانی ئەوە قبوڵ بکات کە کچەکەی پێش مردنی لێی عاجزبووە وەک چۆن دایکیشی پێش مردنی لێی ڕازی نەبوو، بیست و دوو ساڵە دایکی مردووە و هیچ پەندێکی لێی وەرنەگرتووە و هەر لە بێ ئاگایی خۆیدایە، بەڵکوو ئەوا دای لە کچەکەیشی!

بەرگەی نەدەگرت، پۆشاکی نوێژەکەی هەر لەدەستیدابوو...

حەپێکی ئارامکەرەوەی خوارد بۆ ئەوەی کەمێک بخەوێت، لەڕووی دەروونی و جەستەییەوە زۆر ماندووبوو... چووە سەرجێگای نووستنەکەی و ڕاکشا، پۆشاکی نوێژەکەی ئیناسیش لەپەنایدابوو، ڕووناکیەکانی کوژاندەوە... .تازە چاوی چووبووە خەو گوێی لەدەنگی ئیناس بوو: باوکە، دایکە، هەستن باپێکەوە نوێژی بەیانی بکەین... وەک کەسێک کە فێی لێهاتووە هەستا: ئیناس؟ باوەگیان لەکوێی؟ گڵۆپەکانی داگیرساند: ئەوە ئیناسبوو،

گوێم لەدەنگی بووا!... لەماڵەکەدا بۆ ئیناس دەگەڕا... «بەڵکوو هەموو ئەمانە تەنها کابوسێک بێت»... «ئێستا بەئاگا هاتبێتم بۆ ئەوەی ئیناس ببینمەوە»...

ئیناسی نەبینیەوە... گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی، هەوڵیدا بخەویت بەڵام نەیتوانی، پۆشاکی نوێژەکەی هەڵگرت و چووە ژوورەکەی ئیناس... ئاواتەخوازبوو کە بەیانی بەوشێوەیە تەماشای کرد، لەگەڵیدا دابنیشتایە و ڕازی بکردایە و بەڵێنی پێ بدایە چی دەوێت بۆی بکات بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە کە مرد لێی ڕازی بێت، نەک وەک ئەوەی دایکی مرد.

ئەوەی بیرکەوتەوە کە بە ئەشرەفی وت: «تەنها تۆ نیت موعاناتت هەیە». بۆ یەکەمجار تێگەیشت کە مەبەستی خۆی و ئازارەکانی بووە لەگەڵ ئەم باوکە خراپەیدا.

نامەکەی عەلی بیرکەوتەوە( ئەو کرپارەی فێڵی لێ کرد) کە پێش بیست و دووساڵ بۆی ناردبوو: خودا تۆڵەت لێ بکاتەوە.

تێگەیشت لەوەی بۆچی ئیناس پۆشاکی نوێژەکەی دەکردە بەر بوکەڵەکەی(هودا) لەو دەمەی لە ژن مارەبڕینی عەبدوڕەحمانی برازای هاتنەوە... سەمیر چەمایەوە و (هودا)ی هەڵگرت و پۆشاکی نوێژەکەی کردە بەری وەک چۆن ئیناس وای دەکرد، جوانترین ساتەکانی بەبیرهاتەوە، ئەو دەمەی بەیانیان دەهات بۆ لای و (هودا)ی لەئامێزگرتبوو، لەبەردەمیدا دەوەستا لەو دەمەی زۆر سەرقاڵبوو، چاوەکانی بەرزدەکردەوە بۆ ئەوەی ڕووخسارێک ببینێت کە وەک مانگە لەگەڵ زەردەخەنەیەکی منداڵانەدا، بزەی (هودا) وەک بزەی ئیناس وابوو، بەڵام ژیانی تێدانەبووا کە پۆشاکی نوێژەکەی بینی لەبەر بوکەڵە بێ گیانەکەدا، لەکۆتاییدا

ڕووبەڕووی حەقیقەتە تاڵەکە بوویەوە: تاکە گوڵی سارای ژیانی لەناکاودا دیار نەما، ئیناس لە ژیانیدا نەماوە!

لەم کاتەدا، بورکانەکەی سەمیر تەقیەوە، زۆر زۆر گریا، بە یادگەیدا گەڕایەوە بۆ ڕۆژانی منداڵی، تەماشای (هودا) و پۆشاکە خوێناویەکەی دەکرد... ئەو ڕۆژانەی بیرکەوتەوە کە خۆی و براکانی و دایک وباوکی لەدەوری زۆرپاکە خڕبووبوون و کەستانەیان دەبرژاند، ئەو دەمەی بوکەڵەکەی تالەی دەخستە بەر زۆپاکە و ئەویش هاواری دەکرد، باوکی پێی دەوت: (سەمیر، بەسە سۆعبەت مەکە)، باوکی بیرکەوتەوە کە بازرگانێکی بەتەقوابوو سووربوو لەسەر ئەوەی ڕۆزی حەڵاڵ پەیدا بکات، ئەوەی بیرکەوتەوە کە زۆر پێی دەوتن ڕۆڵە ئاگات لەنوێژەکانت بێت... ئەو ڕۆژەی بیرکەوتەوە کە تالە بۆ یەکەمین جار حیجابی پۆشی و بە زەردەخەنەوە هاتە ژوورەوە باوکیشی لەئامێزی گرت و سەری ماچکرد... ماڵە سادە پاکەکەیانی بیرهاتەوە کە ئاوەدانبوو بەئیمان و قورئانخوێندنە جوانەکەی دایکی...

چۆن ئەو ژینگە پاکە جوانەی لەیاد کرد و چوو بۆ ناو ئەو قوڕاو و گێژاوە؟!

بۆ یەکەمین جار و دوای بیست ساڵ زیاتر سەمیر هەستی کرد، لە گۆڕەپانێکی هەڵەدا پێشبڕکێ دەکات و لەو کاتەوە تا ئێستا ڕادەکات تێیدا، هەتا لەڕێگاکەیدا گەیشت بەشتێک ناوی ئیناس بوو، بەڵام نەوەستا، بەڵکوو بەردەوامبوو لەڕاکردن هەتا شکاندی و خۆیشی لەگەڵیدا تێک شکا.

بیست ساڵ زیاتر، کە سەرەتاکەی مردنی دایکی بوو ئەو دەمە ڕۆچوبوو لەدونیادا و تەماحی ئەوەی هەبوو پشتگیری

ئەبو عەزام بکات، بە مردنی کچەکەی کۆتایی هات، هەتا ئێستا هەر لەدونیادا ڕۆچووە و لە پێشانگاکەیدا کار دەکات، هەردوو حاڵەتەکە پەیوەندییەکە دادەخاتەوە چونکە... سەرقاڵە!

دوو ڕووداوی هاوشێوە، بەڵکوو لەهەمان چارەخانە! دوو ڕووداو وەک ئەوەی لەلێواری گۆڕێک وەستابن... خودی سەمیر لەگۆڕەکەدابێت! ئەو سەردەمە تێپەڕی وەک ئەوەی تێیدا نەژیاوە...

ئیناس وەک گاڵۆکەکەی سولەیمان وابوو بۆ سەمیر کە خۆی دەدا بەسەریدا و بەهۆی ئەوەوە قەناعەتی بەخۆی دەکرد کە هێشتا خێری تێدایە و خودا ڕێزی لێ ناوە و لەکەسانی تریش باشترە.

کە ئیناس مرد، هەموو شتێک هەرەسی هێنا.

نەیتوانی بخەوێت... گوێی لەبانگی بەیانی بوو، چووە حەمام و خۆی شۆرد و دەستنوێژی گرت و بە ئۆتۆمبێلەکەی بەرەو ئەو مزگەوتە بەڕێ کەوت کە ئەمجەد نوێژی لێ دەکرد. دەستی کرد بەنوێژکردن و بەزۆر گریانەکەی گرتبوو... دواتر لەبەردەم مزگەوت چاوەڕێی براکەی بوو... ئەمجەد هاتە دەرەوە و سەمیری بینی... بێتاقەتبوو، چاوەکانی ئاوسابوون و سوورهەڵگەڕابوو، وەک باڵندەیەک وابوو پەڕەکانیت کردبێت، زانی ئەو شەوە زۆر گریاوە... ئەمجەد تووڕەیەکەی نەما بەرانبەری و هەستی کرد سەمیر بەساتێکی ڕووحانی جیاوازدا تێدەپەڕێت.

سەمیر دەستی درێژکرد بۆ تەوقەکردن و وتی:

- دەتوانم کەمێک لەکاتت بگرم؟

ئەمجەد وتی:

- هەموو ژیانم بۆ تۆیە براکەم، لەخزمەتام.

سـەمیر لەناخـەوە هـەژا، وایدەزانـی تەنهـا ئینـاس بەقوڵـی خۆشـیدەوێت و گرنگـی پـێ دەدات، هەرگیـز گومانـی نەدەبـرد دوای مردنـی ئینـاس گوێـی لەقسـەی ئـاوا شـیرین بێـت. پێکـەوە چـوون بـۆ ماڵـی ئەمجـەد... دایکـی عومـەر و منداڵەکانـی نوێژیـان دەکـرد... سـەمیر لـەژووری میوانەکـە دانیشـت و ئەمجەدیـش چـوو دوو کـوپ قـاوە بهێنێـت... سـەمیر تەماشـای ئـەو شـوێنەی دەکـرد کـە پێشـتر تێـدا ئەمجـەد ئامـۆژگاری کردبـوو دوای ئـەوەی لـە ئاهەنگـی شـەکراوخواردنەوەی برازاکەیـان هاتبوونـەوە، ئـەو ڕۆژەی ئینـاس و فاتیمـە تکایـان لێـی کـرد بـۆ ئـەوەی ئینـاس لەماڵـی مامـەی بمێنێتـەوە... ڕووخسـاری ئیناسـی هاتـەوە یـاد لـەو دەمـەی بـە سـۆزێکەوە دەیـوت: دە تخـوا باوکـە بـا لێرەبـم... دەنگـە شـیرینەکەی کەوتـەوە یـاد... هەمـوو ئەمانـە نزیکـەی سـاڵێک پێـش ئێسـتا بـوو...

ئەمجـەد قاوەکـەی هێنـا... پێکـەوە دانیشـتن... چاویـان بڕییە یەک...

سەمیر سەرێکی لەقاند وەک ئەوەی بڵێ(نەخێر)...

ئەمجەد پێی وت:

- براکەم قسە بکە...

سەمیر بە دەنگێکی ماندووە وتی:

- نازانـم لەکوێـوە دەسـت پـێ بکـەم... سـەری هەڵبـڕی و دواتـر ئاخێکـی قوڵـی هەڵکێشـا و هەناسـەیەکی قوڵـی دایـەوە... بـە زۆر خـۆی گرتبـوو بـۆ ئـەوەی لەبەرچـاوی ئەمجـەدا نەگـری، دواتـر وتـی:

- هەستەکەم بەڕۆیشتنی ئیناس ژیانم کۆتایی پێ هاتووە.

- بەڵکوو دەست پێ دەکات.

- چۆن دەست پێ دەکات؟ لەگەڵدا ئەودا مردم.

- بەڵکـوو مردبوویـت، ئیتـر لێرەوە زیندوودەبیتـەوە ان شـاءالله لەوانـە دەبیت کە خودا لەبارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَـٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ﴾
واتە: ئایا ئەو کەسەی کە مردوو بوو (بەهۆی بێ باوەڕیەوە)، ئینجا (بەهۆی ئیمانەوە) زیندوومان کردەوە و نوورو ڕوناکیەکمان بۆ ساز کرد لە ژیانیدا (کە قورئانە) لەناو خەڵکیدا پێی دەڕوات و هەڵس و کەوتی پێدەکات.

- واتایەکی جوانە، بەڵام بڕواناکەم من ئاوابم... هەستەکەم من ناگۆڕێم.
- ئەمە بێئومێدبوونە لە ڕەحمەتی خودا.
- وانییە... دەزانم خودا زۆر میهرەبانە، بەڵام...
- بەڵام ئەوە شەیتانە بەجۆرێکی تر بێئومێدت دەکات، پێت دەڵێت: بێگومان خودا میهرەبانە، بەڵام تۆ شایەنی ئەوە نیت و یارمەتیت نادات خۆت چاک بکەیت.
- ئەمجەد تۆ ئەندازەی کێشەکەی من نازانیت، بیست ساڵ زیاترە وەک کەسێکی مەست و ئالوودەبوومە... وەک کەسێک دراوە بەسەریدا... دەڵێی تەنها دوێنێ شەو بەئاگا هاتومەتەوە! خۆم دەزانم چیم بەخۆم کردووە! نازانم چەندێکە چۆن ئاوا نەفسم فریوداوە و فێڵم لێی کردووە! لەگەڵ ئەمەیشدا... کەسێک ئەم ماوە زۆرە ئاوابووبێت هەرگیز گۆڕانکارییەکەی حەقیقی ناتوانێت بگۆڕێت.

سەمیر ئەم قسانەی دەکرد و ئەوەی لەیادبوو چۆن براکەی جاری پێشتر ئامۆژگاری کرد، دواتر گەڕایەوە بۆ سەر ئەو شتانەی کە لەسەر بوو لەگەڵ ئەبو عەزامدا.

ئەمجەد وەڵامی دایەوە:

- بیست ساڵ؟ هێندەی ئەوانە خراپ نەبوویتە کە نزیکەی بیست ساڵ دژایەتی بانگەوازی پێغەمبەری خودایان کرد، دواتر

لەفەتحی مەککەدا باوەڕیان هێنا، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گۆڕان بەجۆرێک خۆیان و سامانیان کردە قوربانی لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلامدا.

سەمیر بێدەنگبوو... ئەم زانیارییەی دەزانی بەڵام سەیری لەوە دەهات چۆن ئاوا دەبێت! هەربۆیە وتی:

- ئەوانە کەسانێکبوون لەنێوان ئەوان و ئیماندا بەربەستێک هەبوو... دواتر بەربەستەکە نەما، ئیمان چووە دڵیانەوە و ڕووناکی کردەوە، بۆیە ئاوا گۆڕان. بەڵام من پێشتر ئەم حەقیقەتانەم زانیووە، ئیمانبوونم پێی کاریگەری لێم نەکردووە، گەر کاریگەریشی هەبێت کەم دەبێت. هیچ شتێکی نوێ نییە بیزانم بۆ ئەوەی لەناخەوە گۆڕانکاریم تێدا دروست بکات.

- ئەو زانیارییانەی هیچ کاریگەرییەکیان نییە لەسەر دڵت، خودا دەتوانێت ژیانی بکات بەبەردا وەک چۆن ژیان دەبەخشێتەوە بە زەوییەکی مردوو.

- هەموو شتێک پێشەکی و ئاماژەی هەیە، لەناخمدا هیچ ئاماژە و دەسپێشخەرییەک شک نابەم بۆ گۆڕانکارییەکی ڕاستی جێگیر.

- سەمیر، جاران بەسەرسامیەوە تەماشای خۆتت دەکرد، بەهۆی هەندێ کاری چاکەوە بوغرابووبوبیت و عەیبەکانت بە کەم دەزانی، کەچی ئێستا زۆر نەرێنیانە تەماشای خۆت دەکەیت و وەها تەماشای دەکەیت کە هیدایەت وەرناگرێت! تێبینی ئەوە ناکەیت ئەمە لەشەیتانەوەیە، لەنێوان غرور و بێئومێدیدا دەتهێنێت و دەتبات، لەهەردوو حاڵەتەکەیشدا لەخودا دوورت دەخاتەوە؟!

- ئەمجەد، دایکم مرد و لە من ڕازی نەبوو. ئێمشەو بیرم دەکردەوە چۆن لە ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانیدا فەرامۆشم کردبوو... وەسیەتەکەیم هاتەوە یادت کە ناوی منی نەبردبوو... ئەوەی

بۆ دایک و باوکی خراپبووە هەرگیز سەرکەوتو نابێت... گومانم وابوو من بەدەرم لەو ڕێسایە، هەتا لە ئیناس بێ بەشبووم.

شتێک هەیە بۆم باس نەکردوی: ئەو ڕۆژەی ئێوە پەیوەندیتان دەکرد پێمەوە بۆ ئەوەی بێم بۆ چارەخانە و دایکم لە سەرەمەرگدابوو، دەزانیت من چیم دەکرد؟

لەلای مامۆستا بووم، ئومێدم ڕازیبوونی بوو، گوێم لە نوکتەپووچەکانی سکرتێرەکەی گرتبوو، بە گێژی و گەمژەیی خۆم پەیوەندییەکانی ئێوەم دادەخستەوە! دواتر سەمیر وەک گاڵتەکردنێک و تووڕەبوونێک لەخۆی بزەیەکی کرد و وتی:

- لەو دەمەدا ئێوە لەدەوری دایکم بوون و ڕازیبوونیتان بەدەست دەهێنا... ئەمەم بۆ باس نەکردبووی... هەر کەسێک دایکی بمرێت و لەم دۆخەدابێت... بێ بەشە لەهەموو شتێک.

لەم کاتەدا، بێئومێدییەکی زۆر باڵی کێشا بەسەر دڵی سەمیردا و هەستی کرد مردنی ئیناس سەرەتای سزایەکی قورس و لەناوبەرە... ڕووی گرژبوو، هەستەکانی پەرتەوازەبوون و پێویستی بەگریانێکی قوڵ هەبوو، هەستی بەشەرمەزاری دەکرد کە لاوازی خۆی دەرخستووە بەرانبەر براکەی، ویستی هەستێت و بڕواتەوە بۆ ماڵەوە.

ئەمجەد لێی نزیک بوویەوە و دەستی گرت و بە بزەیەکەوە وتی:

- منیش هەواڵێکی دایکمم پێیە، لەڕۆژی وەفاتەکەیەوە پێم نەوتویت، پەیوەندی بەتۆوە هەیە... سەمیر بەگرنگی پێدانەوە ئاوڕی دایەوە:

- لەبارەی منەوە شتێکی وتوە؟

- بەڵێ.

- چی وتوە؟... سەمیر هەستی کرد لەلای ئەمجەد شتێکی دەست دەکەوێت، کە ڕۆژی مردنەکەی چەندێ لەژوورەکەیدا گەڕا نەیبینەوە...

ئەمجەد وتی:

- هێندە بەسبوو پێت بڵێم خودا لەشیرک خۆشدەبێت، چۆن لەئازاردانی دایک و باوک خۆشنابێت. بەڵام سبحان اللە! وەک ئەوەی خودا هۆکارەکانی بۆ ئاسان کردوی بۆ ئەوەی بە ڕەحمی خۆی دەورت بدات و تەوبە بکەیت!

- چی ڕوویداوە؟ پێم بڵێ!...

ئەمجەد چەندین ساڵە چ شتێکی لە سەمیر شاردۆتەوە و ئیمڕۆ پێی دەڵێت؟

با بەردەوام بین.

***



# ٢٤

# نهێنیەکەی ئەمجەد

سەمیر تەماشای ئەمجەدی برای دەکرد:

- چی بووە؟ پێم بڵێ!

- ئەمجەد کەمێک بێدەنگوو، بزە گرتبووی، تەماشای چاوەکانی سەمیری دەکرد بۆ ئەوەی ببینێت ئەگەر کاتی دەرفەتەکە هاتووە ئەوەی پێ بڵێت کە دایکی پێش وەفات کردنی پێی وت...

- قسە بکە... . دایکم چی وت؟

- بەیانی ئەو ڕۆژە، پێش ئەوەی دۆخی دایکم تێک بچێت و خوشک براکانم بێن، قورئانم بەسەردا دەخوێند و دەستم لەسەر ناوچەوانی بوو. دوای ئەوەی لە قورئان خوێندن تەواو بووم، پێی وتم: ئەمجەد ئاگات لەسەمیری برات بێت.

سەمیر چاوی بڕیە چاوی:

- ئەو وای پێ وتی؟!

- بەڵێ. پێم وت: دایە گیان تخوا لە سەمیر توڕە مەبە... هەستا و وتی:

لەکۆتاییدا هەرچی بکات کوڕمە... خودا هیدایەتی بدات و لێی ڕازی بێت.

سەمیر لێوەکانی دەلەرزی، مچورکەیەک بە گیانیدا هات، وەک منداڵێکی بچوک دای لە پرمەی گریان... لەگەڵ ئەوەی لە ماوەی ڕابردوودا زۆر دڵی ڕەق بوو، بەڵام فەرامۆشکردنی دایکی هەتا کاتی مردنی، برینێکی قوڵبوو لە دەروونیدا و ڕایدەکرد لێی و خۆی لێ گێل دەکرد، بەڵام لەدەروونیدا هەر مابوو بەهۆیەوە خراپ تەماشای خۆی دەکرد، گەرچی وایدەردەخست کەمتەرخەرمبوونی بەرانبەر دایکی هەر ڕۆژی دوای خوێندنەوەی وەسیەتیەکە لەیادکردووە، ئەو دەمەی بەیانیەکەی بە پەیوەندی سکرتێرەکە لە خەو هەستا و چوو بۆ ئەوەی ئامادەکاری بکات بۆ کردنەوەی پێشانگا... بەڵام برینەکە هێشتا لەدڵیدا هەر قوڵ و تەڕبوو... .

سەمیر لە ئەم چەند ساڵەدا چەندین دژیەکی کۆکردبۆوە؟ هەستی دەکرد خودا خۆشیدەوێت بە بەڵگەی ئەوەی چەندین نیعمەتی پێبەخشیوە، وەک چۆن شایەنی ئەوەیە چونکە لە کەسانی تر باشترە، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی ئەوەی ئاوا بوو لەگەڵ دایکیدا هەستی دەکرد خودا لەچەندین شت بێبەشیکردوە!

ئێستا، کە گوێی لە «لەکۆتاییدا هەرچی بکات کوڕمە... خودا هیدایەتی بدات و لێی ڕازی بێت.»بوو، هەستی بەخۆشەویستی دایکی کرد و سۆزی بۆی جولاو، وردە وردە کابوسی بێبەشبوون لەناودەچوو.

- سوێندم بۆ بخۆ کە وایوتوە.

- وەڵڵاهی وایوتوە.

ئەمجەد لە سوێندەکەیدا ڕاستگۆ بوو، بەڵام هەموو ڕووداوەکانی ئەو ساتەی بۆ سەمیر باس نەکرد! تەنها بەشێکی چیرۆکەکەی بۆ باسکرد نەک هەموو چیرۆکەکە...

ئەی بەڕاستی چی ڕوویداوە؟

دوای ئەوەی ئەمجەد لە قورئان خوێندن تەواو بوو، دایکی پێی وت:

- براکەت لە کوێیە؟

- کامە برا؟

- ئەوەی لە تۆ گەورەترە...

- سێ برام لە من گەورەترن... ..

دایکی هێندە لە سەمیر تووڕەبوو نەیدەویست ناویشی بهێنێت، ئەمجەدیش دەیویست ناوی بهێنێت!

- ڕۆڵە گیان سەمیر، سەمیر...

- دایە گیان، ئەی خاوەنی پاکترین دڵی سەر زەوی تخوا لە سەمیر تووڕە مەبە...

- بەداخیکی زۆرەوە وتی: زۆر خۆپەرستە، تەنها بیر لەخۆی دەکاتەوە!

- ڕاستە بیری تۆی نییە، لەمەدا هیچ پاساوێکی نییە،

بەڵام وەڵاهی تۆی خۆشدەوێت.

- بڕوا ناکەم.

لێرەدا، ئەمجەد درۆیەکی حەڵاڵی کرد بۆ ئەوەی دایکی کەمێک دڵی بەرامبەر سەمیر باش بێت:

- تۆی خۆشدەوێت دایە گیان... دوێنێ ئەو کاتەی تۆ خەوتبووی، پێی وتم:

زۆر خەفەت لە دایکم دەخۆم، دەشزانم زۆر کەمتەرخەمم بەرانبەری.

- ئەو وایوت؟

- بەڵێ...

دایکی زۆر پێی سەیربوو.

- سەمیر تۆی زۆر خۆشدەوێت، بەڵام ناتوانێت گوزارشتی لێبکات.

- مانگ لە دوای مانگ، ساڵ لەدوای ساڵ، هەر نەیتوانی گوزارشتی لێبکات؟
- دایەگیان تەنانەت لە قوتابخانە لە وانەی داڕشتندا سفری دەهێنا...
ئەمجەد بۆیە وایوت بۆ ئەوەی دایکی پێبکەنێت، بەڵام پێنەکەنی.
- دایەگیان، دوعا بۆ سەمیر بکە.
دایکی کەمێک بێدەنگ بوو...
- دایەگیان تخوا لە سەمیر توڕە مەبە... سەمیر لە هەمووومان زیاتر پێویستی بە ڕازیبونی تۆیە... مەهێڵە بەبێ ڕازیبونی تۆ ئەم ژیانە بەڕێبکات... دەمانەوێت هەموومان لە بەهەشتدا لەگەڵ باوکماندا بین، نامانەوێت لەکەسمان کەم بێت...
لێرەدا، دڵی دایکی نەرم بوو، فرمێسک لە چاوەکانی هاتە خوارەوە لەو دەمەی خەیاڵی ئەو دیمەنەی بەهەشتی کرد، پاشان هەستا و وتی:
- لە کۆتاییدا کوڕی منە... خودا هیدایەتی بدات و لێی ڕازی بێت.
ئەمجەد زۆر دڵخۆش بوو:
-یاڕەبی دایە گیان خودا دڵت خۆش بکات. چەمایەوە بۆ ئەوەی دەستەکانی ماچ بکات.
لەڕاستیدا، دایکی بەقەستی ویستی لەلای ئەمجەد باسی سەمیر بکات... لەدڵەوە زۆر لەسەمیر تووڕەبوو، دەترسا بمرێت و هەر لێی ڕازی نەبێت... هەستی دەکرد لە وەسیەتەکەدا زۆر توندبووە بەرانبەری کە پێش دوو ڕۆژ نووسیبووی. دەیویست هەستەکانی دەرببڕێت و چی لەدڵیدا هەیە بیڵێت بۆ کەسێک، یارمەتی بدات لەوەی وشەیەکی ڕازیبوون بڵێ بەرانبەر سەمیر...
ئەمجەد لەدیمەنەکە تەنها ئەوەی باسکرد کە دڵی سەمیر نەرم دەکات و ئەوەی لێ شاردەوە کە خەمباری دەکات... ئەمجەد دڵی

نەرمبوو بۆ دیمەنی سەمیر کە دەگریا و لەگەڵ کەشی ئەم وشەیەدا دەژیا...

سەمیر ئاوڕی دایەوە و وتی:

- چەندێکە بۆ ئەمەت پێ نەوتوم؟

- بەڕاشکاوی بیڵێم، تۆ وەها ڕۆچووبوویت هیچ شتێک سوودی نەبوو لەگەڵتدا... بەرگەم نەدەگرت ئەو هەڵوێستەت بۆ باس بکەم و تۆیش وەک نەریتی خۆت بەبێزارییەوە سەرێک بلەقێنیت و کەمێک پێی کاریگەربیت، دواتریش وەها ڕەفتار بکەیت وەک ئەوەی نە (با)ت دیووە نە باران! ئەمەم دانابوو وەک کۆتا پەت بۆ ئەو دەمەی بێ ئاگاییەکەت کەم دەبێتەوە... ئەو ڕۆژەت بیرت دێت دوای ژن گواستنەوەکەت هاتم بۆ سەردانیت، باسی ڕۆژی مردنی دایکمم بۆ کردیت؟ ویستم ئەم قسانەت بۆ باس بکەم، بەڵام تۆ توند و داخراوبوویت و دەرفەتی ئەوەت پێ نەدام.

- واتە کات لەدەست نەچووە؟

- بەڵکوو ئێستا کاتیەتی!

سەمیر بێدەنگبوو، بیری دەکردەوە، ئەمجەد وتی:

- ئەی حەزناکەیت جارێکی تر ئیناس و دایک و باوکم ببینیتەوە؟

- زۆر حەزدەکەم.

- دایک و باوکمان لەسەر ئیمان مردون، ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ﴾ واتە: جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و نەوەکانیشیان بەئیمان و باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوانە لەبەهەشتدا بەیەکتری شاد دەکەینەوە...

ئەگەر بچیتە بەهەشتەوە خودا بەرزت دەکاتەوە بۆ پلە و پێگەی ئەوان گەرچی کردەوەیان لەتۆ زیاتریش بێت. ئیناس منداڵێکە و پشتیوان بەخودا لەبەهەشتدایە. قۆڵی لێ هەڵماڵە و کاری خێر زۆر

ئەنجام بدە بۆ ئەوەی بگەیت بەوان. لەوێ دەگەیت بەئازیزانت و هەرگیز لێیان دانابڕێیت.

ئەم وشانە هیوایەکی زۆریان بەخشی بەسەمیر... «دەگەم بە دایک و باوکم، ئیناس؟ لە بەهەشت؟ بەبێ جودایی؟!»... پێشتر وشەی قیامەت و بەهەشت لەلای سەمیر هیچ واتایەکی نەبوو، ئێستا و بۆ یەکەمین جار هەستی کرد دەرگاکانی کراوەتەوە بۆی و تامەزرۆیە بۆی!

ئەمجەد هەموو ئەمانەی لەچاوی سەمیردا دەخوێندەوە، هەربۆیە ویستی بالآتری بکات، پێی وت:

- سەمیر، هەیە شایەنی ئەوەیە زیاتر تامەزرۆی بیت، مکوڕبیت لەسەر دیداری... ئەویش خودایە، کە پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ لای، فەزڵی ئەو زاتە زۆرە بەسەرتەوە، بەردەوام ئەو چاکەی تۆی ویستوە!

- چاکەی منی ویستوە!

- بەڵێ، ئیناس لێ وەرگرتیتەوە بۆ ئەوەی بە ئاگا بێیتەوە، دڵی واڵاکردیت بۆ ئەوەی گوێت لەم قسانە بێت، گەر تۆی بدایەتە دەست خۆت و هەر ئاوابوویتایە، ئەو دەمەی دەگەیشتیتە دیداری لێت ڕازی نەبوو.

- واتا ئەوەی بەسەرم هاتووە ڕەحمەتە نەک سزای خودا، خودا ڕقی لێم نییە؟!

- بێگومان خێر و ڕەحمەتی تێدایە،

﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: بەپەلەو گورج و گۆڵ بن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا.

﴿۞قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار

کردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونکە ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خوا لەهەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت...

﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ واتە: ئەوەی خراپەیەک بکات یان ستەم لە خۆی بکات لەوەودوا (بەخۆیدا بچێتەوە) و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات، خوایەکی لێخۆشبوو و میهرەبانی دەستدەکەوێت.

﴿وَٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾ واتە: داوای لێخۆشبوونیش لە پەروەردگارتان بکەن و واز بهێنن لە تاوان و خراپەکاری و پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، پەروەردگارم زۆر بەبەزەیی و میهرەبانە، زۆر بەسۆز و دلۆڤانە.

لەهەموو ئەمانەدا ڕەحمەت نابینیت؟! ڕۆڵی تۆ ئەوەیە ئەم کارەساتە بگۆڕێت بۆ ژیانێکی نوێ بۆ ئەوەی ببێتە خێر و بەرەکەت بۆت.

پێشتر سەمیر ئەم گوتارانەی بەسینەفراوانییەوە وەرنەدەگرت، بەڵکوو زۆر بەلایەوە قورسبوو، جاران بە دەرس پێ وتنەوە هەژماری دەکرد وەک چۆن دوای هاوسەرگیریکردنەکەی هەمان شتی بە ئەمجەد وت... بەڵام دوای مردنی ئیناس، ئەو کەسەی جاران نەما کە بەرگری لە نەفسی خۆی بکات، بەرگی لەو ژیانە پووچەی نەدەکرد کە تاکە شت تێیدا ئەوەیە دەژی... بۆچوونی کەسی و پێشنیازەکانی قبوڵ نەدەکرد... بەڵکوو شتێکی دەویست پەیوەستی بکات بە حەقیقەتە مەزنەکەوە و کرۆک و واتا ببەخشێت بە ژیانی، ڕووی بکاتە ئاڕاستەیەک هەست بە ئارامییەکی زۆر بکات. تەنها وەحی سوودی هەبوو لەگەڵیدا. سەمیر هەستی بەوەکرد لەهەموو لایەکەوە میهری خودا دەوری داوە، بە ئارامی تەسلیمی

قسەکان بوو... ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئەمجەد و پێی وت:
- یەکەمین هەنگاو چییە؟
- بەتەواوی واز لە ئەبو عەزام بهێنە!
ئەمجارە سەمیر بەتوندی ڕێگری لێ نەکرد، قسە کۆنەکەی نە وت: «هەموو شتێک لەدەست دەدەم»، بەڵکوو بەشکاوییەوە وتی:
- واز بهێنم پێش ئەوەی مافی خۆم وەربگرمەوە لەو ئۆتۆمبێلانەی بە پارەی خۆم کڕیومە؟
- دەزانم ئەمە زۆر بەئازارە. ناڵێم سازش لە مافی خۆت بکە، بەڵام هیچ ڕێگایەکی سەلامەت نییە بۆ وەرگرتنەوەی مافی خۆت، ئەگەر لەم دونیایەدا مافی خۆتی لێ وەرنەگریتەوە، ئەوا لەلای خودا لێی وەردەگیرێتەوە کە لەلای ئەو ستەم لە کەس ناکرێت. گرنگ ئەوەیە ئێستا لە گێژاوی ئەبو عەزام ڕزگارت ببێت.
سەمیر سەری لەقاند و وتی:
- ئەسڵەن ڕقم لەو بازاڕ و بازرگانییەیە...
ئەمجەد دەستی گرت:
- نەخێر سەمیر گیان! چاککردنەوەی خۆت واتای ئەوە نییە ڕقت لەکارکردن بێت، تۆ لەبازاڕدا ناو و ناوبانگت هەیە، ئەمە بقۆزەوە و پێشانگایەکی تایبەت بە خۆت دابنێ.
- پێشانگا؟! چ پێشانگایەک دەگات بەوەی ئێستا هەمە؟
- براکەم بەراوردی مەکە! ئەوەی ئێستا شوێنی ڕاستی تۆ نییە، خۆت بەراورد مەکە بەوە. بە سەرەتایەکی سادە دەست پێ بکە، هەوڵبدە پارەکەت حەڵاڵ بێت دڵنیابە خودا بەرەکەتی تێ دەکات بۆت. سەمیر، بیرت بێت: لەمنداڵییەوە گرفتی تۆ ئەوەیە ئارامگریت نییە، وای لێ کردوی بازی گەورە بدەیت و بەگەشەی ئاسایی ڕازی نەبیت، ئەمەش ئەنجامەکەیەتی کە دەیبینیت...

ئەمجەد هەستا و چوو بۆ ئەوسەری ژوورەکەی بۆ ئەوەی شتێک بهێنێت:
- گوێ بگرە براکەم... نزیکەی سێ دەفتەر دۆلارم هەیە لەپێویستیەکانی خۆم زیادە. وەریبگرە و بۆ بازرگانیە تازەکەت سوودی لێ وەربگرە.
- نا نا... سوپاست دەکەم.
- دەبێت وەریبگریت، من پێویستم نییە، کەی ویستت لێت وەردەگرمەوە.
سەمیر زۆر بەتوندی ڕەتی کردەوە... درا لە دەرگا... .زەینەب و فاتیمە و عومەر و دایکیان هاتنە ژوورەوە و سەرخۆشیان لە سەمیر کرد. سەمیر سڵاوی لە منداڵەکانی کرد... کە کاتی فاتیمە هات، تەماشای کرد... لێوەکانی بەتوندی گرت بۆ ئەوەی نەگری... سەمیر لەسەر ئەژنۆی دانیشت و دەستی خستە سەر شانی فاتیمە و پێی وت:
- فاتیمە، مامەت دەگۆڕێت... پشتیوان بەخودا جارێکی تر دەگەینەوە بە ئیناس...
فاتیمە سەرێکی لەقاند و بەهێمنی فرمێسک بە کوڵمەکانیدا هاتە خوارەوە.
سەمیر لەماڵی براکەی دەرچوو، سووربوو لەسەر ئەوەی ئەمجارە بەڕاستی خۆی چاک بکات، جا باجەکەی هەر چیەک بێت...
گەڕایەوە بۆ ڤێلاکە... خەوی لێکەوت و چووە خەوێکی قوڵەوە... پێش نوێژی عەسر لە خەو هەستا، نوێژی نیوەڕۆی کرد و چوو بۆ ژوورەکەی صادق:
- صادق باوەگیان، دێیت بچین بۆ مزگەوت؟... صادق هەستی دەکرد ڕووخساری باوکی گۆڕاوە... خۆی دوانەخست... بەبێدەنگی ڕۆیشت. دوای نوێژ، بەلای چێشتخانەیەکدا تێپەڕی، دوو لەفەی

کڕی بۆ خۆی و کوڕەکەی، دواتر بە ئۆتۆمبێلەکەیان چوونە شوێنێکی بەرز و دەیڕوانیە سەر شارەکە. بەبێدەنگی دانیشتن... صادق خوشکەکەی کەوتەوە یاد و فرمێسک لەچاوەکانی هاتە خوارەوە، سەمیر دەستی خستە سەرشانی و دڵنەوایی کرد... بیری لەوە کردەوە کوڕەکەیشی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی، بەڵام هەتا ئێستا نێوانیان هەر ساردبوو، سەمیریش ڕانەهاتبوو لەسەر ئەوەی بە سۆزەوە مامەڵەی لەگەڵ بکات. خۆرئاوابوون نزیکبوو، سەمیر وتی:

- بابڕۆین خۆمان ئامادە بکەین بۆ پرسەکە... خۆیان ئامادەکرد و چوون بۆ پرسەکە.

سەمیر و ئەبو عەزام هیچ قسەیەکیان نەکرد، هەتا پرسەکە کۆتایی هات و سەمیر ویستی لەگەڵ صادقدا بڕوات، مامۆستا وتی:

- حەنان زۆر بێتاقەتە. ڕۆژی پێنج شەممە لەگەڵ سۆزاندا دەیانبەم بۆ ئەورووپا بۆ ئەوەی جەوێک بگۆڕن... صادق، حەز دەکەیت لەگەڵ ئێمە بێیت؟

- نەخێر، سوپاست دەکەم، تاقیکردنەوەکانم قورسە...

مامۆستا قسەکانی ڕووکردە سەمیر بەبێ ئەوەی تەماشای بکات:

- سبەینێ دەچم بۆ ئۆفیسەکەم بۆ ئەوەی پێش گەشتەکەم هەندێ لە کارەکانم ڕێک بخەم...

ڕۆژی دواتر لەنێوان سەمیر و ئەبوعەزام چی ڕوویدا؟
دووبارە شەیتان چ شتێکی خستە دڵی سەمیرەوە؟
ئەمجەد چۆن بەرەنگاری بوویەوە؟ لەکۆتاییدا کێ سەرکەوت؟

با بەردەوام بین...

***

 ٢٥ 

# کۆتەکان

لـەڕۆژی دواتـردا، سـەمیر بـەرەو ئۆفیسـەکەی ئەبـو عـەزام بەڕێکـەوت... .

دای لە دەرگا...

- فەرموو...

سـەمیر بەبـێ سـڵاو کـردن هاتـە ژوورەوە، بـەرەو ئەبـو عـەزام هـات و لەبەردەمیـدا وەسـتا، ئەویـش بەسـەر سـوڕمانەوە تەماشـای دەکـرد... تەماشـای چاوەکانـی سـەمیری دەکـرد... تەماشـاکردنەکەی سـەمیر متمانـە و لوتبـەرزی تێـدا بـوو، ئەمـەش ترسـی خسـتە دڵـی ئەبـو عەزامـەوە...

لەنـاکاودا سـەمیر کۆمەڵێـک کلیلـی فڕێدایـە بـەردەم ئەبوعـەزام... تەماشـای کـرد:

کلیلـی پێشـانگای ئۆتۆمبێـل، کلیلـی زنجیـرە خواردنگـەکان، کلیلـی کێڵگـەی پەلـەوەر، کلیلـی ڤێلاکەیـە، بەڵکـو کلیلـی ئۆتۆمبێلەکـەی سەمیریشـی تێـدا بـوو. ئەبـو عـەزام تەماشـای چاوەکانـی سـەمیری کـرد و چاوەڕێـی ئـەوە بـوو قسـە بـکات...

بەڵام سەمیر پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت...

ئەبو عەزام شۆک ببوو:

- سەمیر!...

سەمیر وەستا ئاوڕی دایەوە، وەک کەسێکی سەرکەوتوو زەردەخەنەیەکی کرد... وەڵامی نەدایەوە بەڵکو لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو، لە ئۆفیسەکە دەرچوو. لەدوای خۆی ئەبو عەزام و هەموو شتەکانی بەجێهێشت، تەنانەت ئەو ئۆتۆمبێلەی پێی هاتبوو لەبەردەم ئۆفیسەکەدا بەجێیهێشت...

هەر هێندەی گەیشتە سەر شەقامەکە هەستی کرد ئاسودەیی سەرتاپای داگرتووە! بەیانی ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی بچێت بۆ لای ئەبوعەزام کەمێک ڕاڕابوو... سەمیر گومانی وابوو یەکەمین هەنگاو زۆر قورسە لەسەری لەسەرووی ئیناسەوە ئەمیش دەبێتە خەمێکی تر... بەڵام بە پێچەوانەوە ئەو دەمەی کلیلەکانی فڕێدا هەستی دەکرد کۆتی گەردن و دەستەکانی دەکاتەوە کە خۆی ڕێگای دابوو ئەبوعەزام کۆتی بکات پێی، ئێستا دەیکاتەوە و فڕێی دەداتە بەردەم ئەم گەورەیەی پێی دەڵێت: نە تۆ گەورەی منی نە منیش بەندەی تۆم!

سەمیر خۆی ویستی کەمێک بەسەر شەقامەکەدا ڕێ بکات پێش ئەوەی دەست لە تەکسی ڕابگرێت بۆ ئەوەی هەست بە ئازاد بوونەکەی بکات! لە نەفسی خۆیدا وتی: زۆر دڵخۆشم زۆر ئاسوودەم... دەمەوێت ئەم دڵخۆشیەم بە کەسێک بڵێم... بەکێی بڵێم؟ ئیناس...

سەمیر بۆ ساتێک لەبیری کرد ئیناس مردوە... پاشان بیری کەوتەوە...

لە ڕۆیشتن وەستا، فرمێسکەکانی چاوی سڕی... دواتر وتی: ئەوەی ئێستا کردومە پەی بردنمە بەوەی بەرانبەر تۆ زۆر هەڵەبومە ئیناس گیان. دواتر پەیوەندی کرد بە ئەمجەدەوە، زۆر دڵخۆش بوو بەمە دەست خۆشیەکی زۆری لەسەمیر کرد لەسەر ئەم هەنگاوە یەکلاکەرەوەی ژیانی.

سەمیر زانی دەبێت ڤێلاکەی ئەبوعەزام جێبهێڵێت، هەربۆیە چوو شوقەیەکی بەکرێ گرت بۆئەوەی کەلوپەلەکانی بۆ بگوازێتەوە. دانیشت بۆ ئەوەی کەمێک پشوو بدات... لەناکاودا هەستی کرد گەڕاوەتەوە بۆ ئەوەی بیست و دوو ساڵ پێش ئێستا تێیدابوو، ئەو ڕۆژەی لەدوای وەفاتی دایکی ماڵی باوکیان فرۆشت ئەویش شوقەیەکی بەکرێ گرت، ئەوێ ڕۆژێ سەڵت بوو.

زۆر بێتاقەتبوو لەو دەمەی هەستی کرد ژیانی ڕابردووی بوە بە تۆزی بەربا و پێویستە لە سفرەو دەست پێبکات.

دوو دڵ بو لەئەوەی پەیوەندی بکات بە ئەمجەدەوە دەترسا بێزاری بکات مۆبایلەکە لەبەر دەستیدا بوو، دواتر پەیوەندی پێوەکرد:

- ئەمجەد داوای لێبوردن دەکەم بێزارت دەکەم.
- هەرگیز. پێم وتی: بەردەوام لەخزمەتت دام. کەی و چی کات پێویستت بە من بوو پێم بڵێ.
- ئەمجەد، من ئێستا چل و پێنج ساڵم... لە دین و دنیادا گەڕاومەتەوە خاڵی سەرەتا! هەر لە منداڵیەوە تۆ و براکانم لەسەر ڕێگای ڕاست دەڕۆن، بەڵام من بەڕێگایەکی هەڵەدا دەڕۆیشتم. هەم لە دونیادا سەرکەوتوبون هەم بۆ قیامەتیش توێشوتان هەیە... ئێستاش ئەو دیمەنەم لەیادە کە ڕۆژی جەژنی قوربان دەوری دایکمتان دابوو بە هەدیکانتان، منیش تەماشام دەکردن و وەک ئێوەم نەدەکرد... ئێوە چەندین قۆناغتان بڕیوە و منیش لە سفرەوە دەست پێدەکەم؟!
- سەمیر گیان تۆ لە سفرەوە دەست پێناکەیت، ئەی وتەکەی خودات لەیادچوە: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ واتە: مەگەر ئەو کەسەی تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت و کار

وکردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کار و کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، چونکە هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (بەرامبەر خەڵکی بە گشتی و ئەو جۆرە کەسانە بە تایبەتی).

بڕوانە کەرەم و بەخشندەیی خودا چ شتێکی مەزن دەبەخشێت بەهاوشێوەکانی تۆ بۆ ئەوەی نەبیتە ئەسیری پەشیمانی، بەڵکوو بە سینەفراوانی و هیمەتێکی بەرزەوە دەست پێ بکەیت.

- جا شتی وا چۆن دەبێت؟ خراپەکانم دەگۆڕێت بۆ چاکە؟!

- بەڵێ، پشتیوان بەخودا.

سەمیر پێویستی بە پاڵپشتی هەبوو، گەرچی بە دووبارەکردنەوەی ئەو زانیاریانە بێت کە دەیزانێت، بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییە دەروونییە پڕبکاتەوە کە هەستی پێ دەکات. ئەمجەد کەمێک لەگەڵی دوا بۆ ئەوەی دڵنەوایی بکات، دواتر کۆتاییان بە پەیوەندیەکە هێنا. کەمێک دەروونی جێگیر و ڕاوەستاوبوو، دواتر چوو بۆ ڤێلاکە بۆ ئەوەی کەلوپەلەکانی بگوازێتەوە... بیری کردەوە: «چی لەڤێلاکە ببەم؟ حەنان لای باوکیەتی و ناگەڕێتەوە بۆ لای من، بێگومان صادقیش کۆشکەکەی باپیرەی هەڵدەبژێرێت، بەرانبەر من وشک و ساردە، هیچ شتێک نییە هاندەری بێت لەگەڵ مندا بژی، ئەشرەف لەزیندانە، ئیناسیش لەگۆڕدایە! هەندێ شتی کەمی پێویست هەڵدەگرم و هەندێ لەیادگارییەکانی ئیناسیش... هەموو ئەوانەی ئەمجەد دەیڵێت ڕاستە، بەڵام... ژیانم جوان نییە!...

دووبارە سەمیر هەستی بە تاریکیی ژیانی کرد. دەستی هەڵگرت لە دەرگای شوقەکە، لەسەر قەنەفەکە ڕاکشا و ویستی لەهەموو ئەوانە ڕابکات و بخەوێت، هەندێ جار زاڵدەبوو بەسەر نەفسی

خۆیدا بۆ ئەوەی بچێت بۆ ڤێلاکە، هەندێ جاریش یادگارییەکانی ڕابردوو دەهاتەوە یادی.

لەم کاتەدا ئەمجەد خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی بچێت بۆ کلینکەکەی، کە چەند ڕۆژێکبوو بەهۆی مردنی ئیناسەوە نەیکردبووەوە... ئەمجەد بیری کردەوە:

«دەبێت کارەکانی سەمیر باش بەڕێوەبچێت؟ پێی وتم کلیلی ڤێلاکەی تەسلیم کردۆتەوە... ئەی ئێستا لەکوێیە؟ لەگەڵ ژنەکەی و صادق چی کردووە؟

هەربۆیە پەیوەندی کرد بە (سەمیر)ەوە:

- دڵنیام بکە سەمیر، هەموو شتێک باشە؟

سەمیر بەدەنگێکی خەماوی و ماندوەوە وتی:

- «ڕاستی بڵێم... نەخێر»... ئەمجەد پەی بەوە برد براکەی پێویستی بەهاوکاریی هەیە و پەیوەندی تەلەفۆنی بەس نییە.

- سەمیر ئێستا لەکوێی؟

- لە شوقەیەکم بەکرێ گرتومە.

- ناونیشانەکەم پێ بدە.

- خۆت ماندوومەکە، تۆ دەبێت بچیت بۆ کلینکەکە و نەخۆشەکان چاوەڕێتن.

- دەڵێم ناونیشانەکەم پێ بدە.

سەمیر ناونیشانەکەی پێ دا...

ئەمجەد سەرکۆنەی خۆی کرد:

«لەم دۆخەسەختەدا چۆن براکەمم بەجێهێشت؟ ئەو پێویستی بە منە.»

ئەمجەد پەیوەندی کرد بەو کەسانەی کە ئەو ڕۆژە سەردانیان دەکرد، بەشێوازێکی زۆر جوان داوای لێبوردنی لێ کردن، داوای

لەسکرتێرەکەی کرد لەنزکترین کاتدا شوێنیان بۆ بکاتەوە، بەرەو لای براکەی بە ڕێکەوت.

لەم میانەدا ئەبو عەزام لەوپەڕی شڵەژاویدا بوو، پەیوەندی کرد بە خێزانیەوە:

- سۆزان، بەخێرایی لەگەڵ حەناندا بچۆ بۆ ڤێلاکە. سەمیر مامەڵەی زۆر سەیرە... هەوڵبدەن تێبگەن بزانن بەتەمای چ شتێکە.

ئەمجەد زۆر بەزەیی بە سەمیردا دەهاتەوە، بەدرێژایی ڕێگاکە دوعای دەکرد و دەپاڕایەوە خەمی لەسەر لابچێت و سینەی فراوان بێت... گەیشتە شوقەکە، سەمیر پێشوازی لێ کرد و پێکەوە دانیشتن...

- نەمهێشت بچیت بۆ کلینکەکەت، زۆر سەرقاڵم کردوی بەخۆمەوە.

ئەمجەد وەک هاوڕێیەک وەڵامی دایەوە: بێدەنگ بە بێدەنگ بە! پێم بڵێ:

چ شتێک نارەحەتی کردوی؟

- لێم توورەدەبیت.

- توورەنابم... بیڵێ.

- «ئەمجەد، ئەمە ڕەخنە گرتن نییە لە دانایی خودا، زۆر کەس هەیە لەمن زۆر خراپترن و منداڵیشیان لەدەست نەداوە... پێم دەڵێیت: دونیا شوێنی پاداشت نییە... دەزانم... بەڵام ناتوانم ڕێ لەدەروونم بگرم بەراورد نەکات...

ئەمجەد، دەزانم کۆمەڵی پرسیار دەکەم دەبێت خۆم وەڵامەکەی ببینمەوە، دەزانم ئەوە لەناو دەبەم کە لەمندا بونیادی دەنێیت و دەگەڕێمەوە خاڵی سەرەتا... بەڵام تۆ نازانیت ئیناس چەندێ گرنگ بوو بۆ من، من ناڵێم تاکە کەسم منداڵەکەم لەدەست داوە لەناو ئەوانەی لەمن باشتر نین و منداڵیشیان لەدەست نەداوە، أستغفرالله، بەڵام...»

لێوەکانی سەمیر لەرزین و دای لە پرمەی گریان و نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات...

ئەمجەد هیچ بێزارنەبوو لەم گۆڕانکاریانەی ئیمڕۆی سەمیر، زانی بەرانبەری مرۆڤێکە کە دەناڵێنێت بە دەست کشانەوەی لەو ژیانەی ئالوودەی بووە هەروەها ئیناسیشی لەدەستداوە، وەک چۆن هەندێک لەنەخۆشەکانی دەناڵێن بەدەست هەندێ شتەوە لەو دەمەی واز لەدەرمانێک دەهێنن کە ماوەیەکی زۆر بەکاری دەهێنن. ئەمجەد شەڕی بوو لەدژی شەیتان کە گۆڕەپانەکەی دڵی سەمیربوو! دوای ئەوەی چەندین ساڵە شەیتان زاڵە بەسەر سەمیردا ئێستا ناتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا، هەربۆیە لەچەندین دەلاقەوە دەچووە دڵی سەمیرەوە، ئەمجەدیش لە دانە بەدانەیدا ڕاوی دەنا و بەهۆی نووری قورئانەوە دەریدەکرد.

بە سەمیری وت:

- مەبەستت چییە لەوەی تۆ لەدەستت داوە بەڵام ئەوان لەدەستیان نەداوە؟

- ئیناس مرد و منداڵەکانی ئەوان ماوە.

- ئەمە لەدەستدانی حەقیقی منداڵ نییە.

سەمیر قسەکەی پێ سەیربوو... ئەمجەد لەقسەکردن بەردەوامبوو:

- خودا فیترەتێکی پاکی لەمنداڵدا داناوە، ئەگەر خراپ پەروەردەیان بکەین ئەوا دانە دانە ئەو فیترەتە پاکە لەناو دەبەین... تاوان دەکەین بەرانبەریان و دوارۆژیان لەناو دەبەین، گەرچی ساغ و سەلامەت دەرکەون لەگەڵماندا. سەمیر، بیر لەوەبکەرەوە ئەشرەفی کوڕت لەو وێڵ و سەرگەردانییەیدا بمردایە! ئەوە خەسارەتمەندی حەقیقیە، شایەنی ئەوەیە داخێکی زۆری بۆ بخۆیت:

﴿ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾

واتە: خەسارەتمەندان ئەو کەسانەن خۆیان و خاو و خێزانیان لە دەستچووە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەر ئەوەیە خەسارەتمەندی ئاشکراو زیانی دیارو ڕوون.

ڕاستە لەم دونیایەدا ئیناست لەدەستداوە، بەڵام بە ڕەحمەتی خودا بە فیترەتێکی پاکەوە گەڕاوەتەوە، هەوڵبدە تۆیش پێی بگەیت، بۆ ئەوەی ئەشرەف و صادق و ژنەکەیشت لەدەست نەدەی.

ئەم قسانە تیڕوانینێکی نوێ بەخشی بە سەمیر، بەڵکوو وای لێ کرد بترسێت لە مردنی ئەشرەف و صادق لەم دۆخەیاندا و تووشی خەسارەتمەندییەکی گەورە بێت... .هەستی بە بەرپرسیاریەتی کرد بەرانبەریان و بڕیاریدا بەخێرایی فریایان بکەوێت. بەڵام هەستی دەکرد ئەم کارە زۆر قورسە چونکە لەڕووی ڕووحیەوە دوو کوڕەکەی زۆر لێوەی دووربوون.

ئەمجەد بێدەنگیەکی شکاند:

- کەی دەچیت ژنەکەت و صادق بهێنیت؟

سەمیر بزەیەکی کرد:

- ژنەکەم! حەنان دایک و باوکی و کۆشکەکەیان هەڵدەبژێرێت. هیچ شتێک نییە لەنێوانماندا هەتا ئەو بهێڵێتەوە...

- هەوڵبدە.

- سوودی نییە... ئەسڵەن حەنان بەبەشێک لە جیهانی ئەبوعەزام دەزانم و نامەوێت بیرم بکەوێتەوە.

- ئەمە مافی تۆ نییە.

سەمیر پێی سەیربوو کە ئەم قسانە لەبراکەیەوە دەبیستێت، کە هانی دەدا هەرچی پەیوەندی بە ئەبو عەزامەوە هەیە وازی لێ بهێنێت!

ئەمجەد لەقسەکردن بەردەوامبوو:

- سەمیر، جیاوازی بکە لەنێوان حەنان و باوکیدا... ئایا حەنان کەسێکی خراپی فێڵبازی قۆڵبڕە؟

سەمیر بێدەنگبوو، بیری لە وەڵامەکە دەکردەوە، دواتر وتی:

- نەخێر.
- بەڕاستگۆیانە تۆی خۆشنەدەویست؟
- بەڵێ، دوای هاوسەرگیریکردنمان وابوو، دواتر بێزاربوو لەوە!
- بۆچی؟
- «ڕاستی بڵێم، بەشی خۆی گرنگیم پێ نەدەدا و کاتم بۆی تەرخان نەدەکرد، کێشەکانم لەگەڵ باوکیدا کاریگەری هەبوو لەسەر پەیوەندییەکەمان»... کەمێک بێدەنگبوو، سەرێکی لەقاند و وتی: « سەرەتا بەسۆزەوە گلەیی لێم دەکرد، تکای لێدەکردم گرنگی پێ بدەم و دووری بخەمەوە لە گرفتەکانی باوکی... نەمتوانی، ئیتر ئەویش بەتووڕەییەوە مامەڵەی دەکرد و منیش بەتووڕەییەوە وەڵامیم دەدایەوە هەتا سۆز و خۆشەویستی لەنێوانماندا ئاوا لاوازبوو».
- ئەوەتا خۆت وتت! مافیت نەداوە. لێت دەپرسم: حەنان هیچ خێرێکی تێدابوو؟
- تێیدابوو، ئێستا کەفیلی چەندین منداڵی بێباوکی کردووە... لە سەرەتای هاوسەرگیریەکەمانەوە بەجوانی نوێژەکانی دەکرد، زۆر دڵخۆشبوو بەمەیش چونکە پێشتر لەماڵێکدابوو هەرگیز نوێژی تێدا نەکراوە! دواتر هێدی هێدی لەنوێژکردن ساردبوومەوە و ئەویش وەک منی لێ هات...

سەمیر کەمێک بێدەنگبوو وەک ئەوەی شتێکی کەوتبێتەوە یاد، بزەیەکەی کرد و دواتر وتی:

- ئەو دەمەی ئیناس دەستی کرد بە نوێژکردن، من و حەنان نوێژمان کرد بۆ ئەوەی خۆمان بپارێزین لەپرسیاری ئیناس: بۆچی نوێژ ناکەن.

بەڵام دواتر هێدی هێدی کشامەوە و حەنانیش لەگەڵمدا کشایەوە...

بەڵام ئەمجەد گیان هەموو ئەمانە کۆنن. حەنانەکەی ئێستا حەنانەکەی جاران نییە. ئەو ئافرەتە سادەیە نەماوە کە بە ئاسانی بگۆڕێت یان لاسایی ڕەفتارەکانم بکاتەوە... ئەو ئێستا ئافرەتێکی چل و دوو ساڵانە و کەسایەتی بەهێزبووە و جیهانی تایبەت بەخۆی هەیە لەگەڵ دایکی و هاوڕێکانیدا، هیچ سۆزێک لەنێوانماندا نییە هەتا کاریگەری بخەمە سەری. پاشان هەموو مافەکان لەسەر من نییە. ئەو هەر لە سەرەتاوە گرنگی بەشتی پووچ دەدا، پەروەردەکردنی منداڵەکانی فەرامۆش کرد هەتا ئەشرەف ئاوای لێ هات و...

ئەمجەد قسەکانی پێ بڕی:

- سەمیر، دەزانم حەنان دەقی گرتووە بە کۆمەڵێک سیفاتی نەرێنیەوە، بەڵام تۆیش هەندێ بەرپرسیاریەتی ئەوەت لەئەستۆیە. ئەو دەمەی لەماڵی باوکیەوە هێنات وەک باوکی نەبوو... سادە و ساکاربوو وەک خۆت وتت، تۆی خۆشدەویست، لەکاری خێردا لاسایی دەکردیتەوە... دەرفەتێکی پێ داویت بۆ ئەوەی یارمەتی بدەیت، بەڵام پەروەردەکردنەکەیت فەرامۆش کرد وەک چۆن هی دەروونی خۆتت فەرامۆش کرد، هەربۆیە حەنان چووە ژینگەیەکی ترەوە... سەمیر، ئەم قسانە بۆ ئەوە ناکەم بۆ ئەوەی پەشیمان بیت، بەڵکوو بۆ ئەوە دەیکەم هەست بە بەرپرسیاریەتی بکەیت بەرانبەر حەنان. تۆ لەماڵی خۆتدایت پیاو و سەرپەرشتیاری ئەو ماڵەیت، بەرپرسیاریەکە لەسەر تۆیە. دوو جار ستەم لە حەنان مەکە، پێشتر ستەمت لێی کرد بەوەی مافی خۆیت پێ نەدا لە

سـۆز و خۆشەویسـتی و گرنگـی پێـدان، ئێسـتا دەتەوێـت دووبـارە ستەمی لـێ بکەیـت بـەوەی لـە جیهانـی ئەبـو عەزامـدا جێـی بهێڵیت! باشکردنی خـۆت واتـای ئەوەنییە بەچاوی دوژمنایەتیـەوە تەماشـای هەمـوو وردەکارییەکانـی ڕابـردوو بکەیـت، بەڵکـوو بەپێـی توانـا چاکسـازی تێدا بکـە ﴿ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ﴾ واتـە: چاکـە لەگـەڵ بەندەکانـی خـوادا بکـە هـەروەک خـوا چاکـەی هێناوەتـە ڕێت.

سەمیر دڵی بۆ حەنان نەرمبوو، هەستی بە بەرپرسیاریەتی کرد بەرانبەری و ئەوەی بۆ بکات کە پێشتر لەدەستی چووە. هەربۆیە وتی:
- بـەڵام ئەمجـەد، مەحاڵـە حەنـان بـەم دۆخـە نوێیـەی مـن ڕازی ببێـت، ئـەو ئێسـتا منـی خۆشـناوێت هەتـا قوربانـی بـدات لەپێنـاوی منـدا... دواتـر تـۆ پێـت وتـم: ژیانـە نوێکـەت لەسـەر تەقـوای خـودا و ڕازیبوونـی بونیادبنـێ. ئەمەیـش ئـەوە دەگەیەنێـت دەبێـت حەنـان زۆرتریـن ڕەفتارەکانـی و تێڕوانینـی بـۆ شـتەکان بگۆڕێـت. ئەمـە قبـوڵ نـاکات، ئامادەیـی تێدا نییـە بـۆ ئەمـە، مەودایەکـی زۆر هەیـە لەنێـوان ئـەو و ژیانێکـی ئیمانیـدا.
- دەزانـم کارێکـی ئاسـان نییـە، کاتێکـی باشـی دەوێـت هەتـا دەگەڕێتەوە بـۆ لات، بـەڵام ئێـوە منـداڵ و چەندیـن یادگاری جوانتـان لەنێوانداییە. ئـەوە کۆتـان دەکاتـەوە، ناچـار دەبـن چەندیـن جـار بگـەن بەیـەک و مامەڵـە لەگـەڵ یەکتـری بکـەن. هەوڵبـدە هیـچ هەڵەیـەک لەتـۆوە دەرنەکەوێـت ئـەو هـەر چۆنێـک ڕەفتـاری کـرد، بزانـە بەمـە کەمێـک قەرەبـووی کەمتەرخەمیەکانـی ڕابـردووت دەکەیتـەوە... دواتـر بێئومێـد مەبـە لـەوەی چـاک نابێـت. مردنـی ئینـاس وەک تـۆ وجوددی ئەویشـی هەژانـدووە. تـۆ ئێسـتا هـەوڵ لەگـەڵ دەروونـی خۆتـدا دەدەیـت و چارەسـەری گۆڕانکارییەکانـی دەکەیـت و بەرگـەی

کشانەوەکانی دەگریت و بەرەو چاکەی دەبەیت... چونکە نەفسی خۆتە و ناتوانیت لێی بێ پێویست بیت. هەمان شت لەگەڵ حەناندا بکە! بەهەمان نەفەس و ئارامگرتنەوە هەوڵی لەگەڵ بدە، لە نەفسی خۆتەوە دەتەوێت هەر لەگەڵیدا بمێنیتەوە.

سەمیر سەری بۆ لەقاند وەک جەختکردنەوە بۆ قسەکانی، ئەمجەد لەقسەکردن بەردەوامبوو:

- ئێستا لەکوێیە؟
- کۆشکەکەی باوکی!
- زۆرباشە، برۆ بابچین صادق بهێنین بۆ ئەوەی لەگەڵت بژی.
- بەم ئاسانییە؟ صادق ڕازی نابێت!
- بەڵکوو ڕازی دەبێت، هەستە بابڕۆین.
- ئەمجەد، صادق منی خۆشناوێت.
- چۆن شتی وادەڵێیت؟ تۆی خۆشدەوێت، تۆ باوکی ئەوی.
- ڕاستی بڵێم، زۆر فەرامۆشم کرد و لەنێوان ئەو و ئیناسدا دادپەروەرنەبووم!

سەمیر چەندین دیمەنی ڕابردووی کەوتەوە یاد، ئەو ڕۆژەی کەوتەوە یاد بەڵێنی بە ئیناس دەدا ئەگەر نمرەی باش بهێنێت دیاری بۆ دەهێنێت، ئەویش وتی: بۆ صادقیش، وایە باوکە؟ وەڵامی دایەوە: «صادق باش هەوڵ نادات»، گومانی وابوو ئەم توندییە سوودی بۆ صادق دەبێت، صادقیش هێندە نارەحەت دەبێت بەقسەکەی سەری دادەخات و تەماشای سفرەکەی بەردەمی دەکات... ئەو ڕۆژەی کەوتەوە یاد کە خۆی و حەنان بەرپرسیاریەتی سەعیکردنی صادقیان دەخستە ئەستۆی یەکتری و صادقیش تەماشای دەکردن.

سەمیر سەری سوڕمابوو لەو دڵڕەقی و خراپ مامەڵەکردنەی لەڕابردوودا.

ئەمجەد بێدەنگیەکی بڕی و دەستی گرت و وتی:

- هەستە، قسەی لەگەڵ بکە، ئەگەر ڕازی نەبوو خۆم قسەی لەگەڵ دەکەم، صادق بەقسەی من دەکات.

- چی پێ بڵێم؟ بەچی دەست پێ بکەم؟

- زۆر بەسادەیی، بیرت بێت ئەو کوڕی تۆیە و ناتوانیت دەستبەرداری بیت، خۆت بەگەورە مەزانە بەسەریەوە... پێشتر مافیت نەداوە ئێستا ڕەزیلی تێدا مەکە.

بە ئۆتۆمبێلەکەی ئەمجەد بەرەو ڤێلاکە کەوتنە ڕێ، لەڕێگادا سەمیر وتی:

- ئەمجەد، ئیناس بەهۆی تاوانی منەوە سزادرا؟

- بێگومان نەخێر، ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾

واتە: هیچ گوناهبارێک گوناهی کەسی تر هەڵ ناگرێ...

مردنەکەی سزا نییە، خودا هێنایە ئەم ژیانە، ڕۆڵی خۆی گێڕا، دواتر خودا ئەمانەتەکەی بردەوە بۆ ئەوەی ڕەحمەت پێ بکات، ئێستا لەژێر ڕەحمەتی خودایە، پشتیوان بەخودا مەلێکە لە مەلەکانی بەهەشت...

سەمیر بە خەمبارییەوە بێدەنگبوو...

گەیشتنە ڤێلاکە و سەمیر دابەزی... ئەمجەد پێی وت:

- دەچم منداڵەکان لەقوتابخانە دەهێنمەوە و زوو دەگەڕێمەوە بۆ لاتان... هەتا دێمەوە خۆتان ئامادەبکەن.

- بەڵام صادق... وتت قسەی لەگەڵ دەکەم... چاوەڕێ بە.

ئەمجەد زەردەخەیەکی کرد و وتی:

- کوڕی خۆتە... سلام علیکم... .

هەڵوێستی صادق چۆنبوو؟
هەڵوێستی حەنان چۆنبوو؟
کۆتا ساتەکانی سەمیر چۆنبوو لەڤێلاکەدا،
کە ئاوەدانبوو بە یادگارییەکانی ئیناس؟
سەمیر لەقوتابخانەکەی ئیناسەوە چ پەیوەندییەکی بۆ هات؟
بۆچی داوایان لێی کرد بچێت بۆ قوتابخانە؟
ئایا هەڵەبوو لەو ساتەی خەیاڵی کرد کە قوتابخانە پێی ڕادەگەیەنن:
کە ئیناس نەمردووە و بینویانەتەوە؟

با بەردەوام بین...

***



# ٢٦

## ئیناسمان بینیەوە!

سەمیر ڕووی کردە دەرگای ڤێلاکە بەڵام ئەمجارە کلیلی ڤێلاکەی پێ نەبوو، دای لە زەنگەکە و خزمەتکارەکەی دەرگای بۆی کردەوە... ڕوویکردە ژوورەکەی صادق و لە کاردانەوەی کوڕەکەی دەترسا... دای لە دەرگا و چووە ژوورەوە...

صادق هەوڵی دەدا زاڵ بێت بەسەر نەفسی و خەمەکانیدا بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بکات بۆ تاقیکردنەوەکان، لە کەشێکدا کە هانی نادرێت: کەس ورەی بەرز ناکاتەوە، ئیناسیش کوپێ قاوەی بۆ ناهێنێت و چەندین قسەی باشی بۆ بکات...

سەمیر بانگی کرد:

- وەرە باوەگیان...

صادق هەستا و لەبەردەمیدا وەستا... گەنجێکی هەژدەساڵ، ڕووخساری پیاوانەیە، منداڵیەکی زۆر خۆش ژیاوە، بەڵام دووربووە لە سۆزی دایک و باوکی و فەرامۆشیان کردووە... بەهۆی هاوڕێ خراپەکانیەوە چەند ڕەفتارێکی خراپی تێدایە، بەڵام لەناخیدا پاکییەک هەیە کە لە پاکی ئیناس دەچێت...

سەمیر تەماشای چاوەکانی کرد و پێی وت:

- صادق، داوای لێبوردن دەکەم باوەگیان... بمبوورە... پێشتر لەگەڵتدا باش نەبووم... تۆ کوڕی منیت، ئازیزی منیت، پێویستمان

بەیەکترییە، ناتوانین دەستبەرداری یەکتری بین... دەمەوێت لەگەڵم بمێنیتەوە و وەک دوو هاوڕێ بین، تکات لێ دەکەم جێم مەهێڵە...

وەک ئەوەی سەمیر بەم وشانە دای لە چینێکی بەردین لەسەر ڕووخساری صادق، لەناکاودا کەوتە خوارەوە و لەژێریدا ڕووخسارێک هەبوو وەک ئیناس! صادق زۆر گریا، سەمیر لە ئامێزی گرت و گریا، گریانێک بۆ کاردانەوەکەی صادق، گریانی خۆشی چونکە ئەم کارەی بۆ ئاسانبوو کە زۆر بەسەختی دەزانی، گریانی سوپاسگوزاری بوو بۆ خودا، دەبینێ دەرگاکانی خێری بەڕوودا دەکرێتەوە، گریانی شەرمەزاری کە چەندێکە گرنگی نەداوە بەم کوڕە باشەی، گریانی دۆزینەوەی ئیناسێکی نوێ لە کەسایەتی صادقدا!

سەمیر کوڕەکەی تێگەیاند لەوەی کلیلی ڤێلاکەی ڕادەستی ئەبو عەزام کردووە و ئێستا شوقەیەکی مامناوەندی بەکرێ گرتووە... بەترس و دوودڵیەوە وتی:

- ڕۆڵەگیان بڕیار بەدەستی خۆتە لەوەی دەچیت بۆ کۆشکەکەی باپیرت یان لەگەڵ من دێت بۆ ئەم ژیانە نوێیە سادەیە...

دڵی بەخێرایی لێی دەدا و چاوەڕێی وەڵامی کوڕەکەی بوو...

صادق بەبێ هیچ دوودڵیەک وتی:

- بێگومان لەگەڵ تۆدا دەمێنمەوە...

سەمیر لەخۆشیدا دەستی هێنا بەسەری صادقدا، ماچی کرد و لە ئامێزی گرت. دواتر خۆیان ئامادەکرد بۆ ڕۆشتن...

حەنان و دایکی هاتن... پێیان سەیربوو هەندێک لەکەلوپەلەکان لەبەردەم دەرگاکە دانرابوو... سەمیریش شۆکبوو لەو دەمەی ئەوانی بینی...

حەنان وتی:

- سەمیر بۆ کوێ؟
- حەنان، وازم لەکارکردن لەگەڵ باوکت هێناوە و شوقەیەکی ئاساییم بەکرێ گرتووە... سەر لەنوێ دەست دەکەم بە کار و ژیانێکی نوێ، هەوڵدەدەم ڕۆزییەکی حەڵاڵ پەیابکەم و پڕ بەرەکەت بێت و خودا ڕازی بکەم. پێم خۆشە تۆیش لەگەڵم بیت.

حەنان وەک ڕەتکردنەوەیەک بەبێ دەنگی سەرێکی لەقاند... شکاو و ماندووبوو... تەماشای صادقی کرد:

- صادق لەگەڵ ئێمە وەرە بۆ ئەوەی لە کۆشکی باپیرەت بژین.
- لەگەڵ باوکم دەمێنمەوە.
- دەمەوێت لە نزیکی من بیت، ئەوەندەم بەسە ئیناس لێم دوورە.

سەمیر پێی وت:

- صادق بەردەوام سەردانت دەکات. هەر کاتیش هاتیت بۆ لامان سەرسەر و سەرچاومان.

سۆزان قسەکانی ڕووکردە صادق:

- صادق، بەڵێنی سەرکەوتنێکت پێ دەدەین کە خاڵۆ عەزامیشت بەدەستی هێنا، لەبری ئەوەی خۆت بخەیتە شوقەیەکی تەنگەوە...

سەمیر خۆی گرت و وەڵامی ئەو شێوازە ناشرینەی نەدایەوە، ئامۆژگاری براکەی کەوتەوە یاد کە سووربێت لەسەر ئەوەی نموونەیەکی جوان بێت و خراپە بە خراپە وەڵام نەداتەوە.

هەموویان تەماشای صادقیان دەکرد... کەمێک سەری لەقاند و پاشان تەماشای دایکی کرد و وتی:

- دایکە، شوێنی گونجاوی من و تۆ لەلای باوکمە... لەگەڵ ئەمەیشدا دەست بەردارت نابم و بەردەوام سەردانیت دەکەم، ئاواتەخوازم ڕۆژێک لەڕۆژان لە شوقەکەی ئێمەدا بژیت.

حەنان و دایکی بێدەنگبوون و نەیانزانی چی بڵێن.

ئەمجەد پەیوەندی کرد:

- سەمیر، لە دەرەوە چاوەڕێت دەکەم،

ئەگەر شتەکانتان ئامادەکرد بانگم بکە بۆ ئەوەی یارمەتیتان بدەم.

ئەمجەد دەترسا سەمیر پێی بڵێت کە صادق لەگەڵیان نایەت، بەڵام شۆکبوو کە لە پەیوەندییەکەدا پێی وت:

- صادق، مامە ئەمجەدت لە دەرەوە چاوەڕێمانە، با خۆمان ئامادە بکەین. ئەمجەد سوپاسی خودای کرد و بۆ کارێکی گرنگیش پەیوەندی بەبراکانیەوە کرد.

سەمیر و صادق پێداویستیەکانی خۆیان کۆکردەوە، سەمیر سوورێکی بە ڤێلاکەدا خوارد یادگاری شوێنێکی دەهاتەوە یاد کە بیستودوو ساڵە تێیدا دەژی!

چووە ژوورەکەی ئیناس، حەنان و دایکی بەدوایداچوون نەبادا یادگارییەکانی ئیناس ببات. سەمیر نەیدەویست لەگەڵیاندا بچێتە موناقەشەوە... بیری لەوەکردەوە بوکەڵەکەی(هودا) ئیناس ببات، بەڵام هەستی کرد خەمێک دەهێنێتەوە یادی کە بەرگەی ناگرێت، پۆشاکی نوێژەکەی هەڵگرت کە خوێنەپاکەکەی پێوە مابوو، شووشە بۆنەکەی هەڵگرت کە بۆنی ئەوی دەهێنایەوە یادی، ئەو قات و بیجامەیەی کە لە پێنج ساڵیدا بۆی کڕیبوو، بەیانیان بەوەوە دەهات بۆ لای. ئەمانەی هەڵگرت و تەماشایەکی ژوورەکەی کرد و مچوڕکەیەک بەگیانیدا هات وژوورەکەی بەجێهێشت.

بەلای مەتبەخەکەدا تێپەڕی: «هێشتا کورسی سەردەمی منداڵی ئیناس لە سوچی مێزەکەدابوو... «لەوێ دامان نابوو بۆ ئەوەی ئەو ڕۆژەمان بهێنێتەوە یاد کە یەک ساڵانبوو، سووربوو لەسەر ئەوەی بە کەوچک خواردن بخوات، خواردنەکەی دەکرد بە گیانی و کورسیەکەدا و ئێمەیش پێدەکەنین»...

لەبـەردەم دەرگای ژوورەکەیـدا وەسـتا، ئیناسـی بیرکەوتـەوە کـە لەبـەردەم دەرگای ژوورەکـەدا دەوەسـتا بۆ ئـەوەی ڕێگری لێ بکات لـەوەی بچێتـە ژوورەوە، ئـەوەی بیرکەوتـەوە کـە دەیـوت « قەدەغەیـە، وەرە یـاری لەگـەڵ منـدا بکـە»... بـە زەردەخەنـە منداڵیەکـەی لەگـەڵ هێـزی کەسـایەتیەکەیدا...

تەماشـای کتێبخانەکـەی کـرد... «لێرەدا ئینـاس دەسـتی دەگرتـم بـۆ ئـەوەی چیرۆکێکـی بـۆ بخوێنمـەوە یـان یـاری لەگـەڵ بکـەم»...

تەماشـای لای قەنەفەکانـی کـرد... «لەوێـوە بـە پەنهانـی دەهـات بـۆ ئـەوەی شـۆکم بـکات بـە سـینیەکی پـڕ لـە میـوە»...

بـەلای حەمامەکـەدا ڕۆیشـت... «لێرەدا ئینـاس کورسـیەکەی دادەنـا و دەچـووە سـەری، دواتـر قـۆڵـی هەڵدەماڵـی بـۆ ئـەوەی دەسـتنوێژ بگرێـت»...

بـەرەو ژووری میوانەکـە چـوو... «لێـرەدا، لەسـەر ئـەم فەرشـە، پارچەکانـی پەزڵەکـەی بڵاودەکـردەوە بـۆ ئـەوەی پێکـەوە چاکـی بکەیـن... ئینـاس گیـان، باوکیشـت ئـاوا پارچـە پارچەبـووە، ئەوەتـا هەوڵـدەدەم خـۆم کۆبکەمـەوە و سـەرلەنوێ خـۆم ڕێـک بخەمـەوە، بـەڵام ئەمجـارە تـۆ لەگەڵمـدا نیـت!»

تەماشـای ئـەو مەودایـەی کـرد لـەلای قەنەفەکانـەوە هەیـە»لێـرەدا ئینـاس بەرماڵەکـەی ڕادەخسـت و بـە پۆشاکەسـپیەکەیەوە نوێـژی دەکـرد... لێـرەدا لەتەحیاتـدا دادەنیشـت و پەنجـە بچووکەکـەی دەجولانـد»...

تەماشـای کتێبخانـە بچووکەکـەی ژووی میوانـی کـرد لەگـەڵ ئـەو چیرۆکانـەی تێیدابـوو... دواتـر تەماشـای قەنەفەکـەی پەنـای کـرد:

«لێـرە، ئینـاس گیـان سـەرت دەخسـتە سەرسـینەم و منیـش لەئامێزم گرتبوویـت و چیرۆکـم بـۆ دەخوێندیتـەوە»...

پێش ئەوەی ڤێلاکە جێبهێڵێت، وەستا و تەماشای ئەو شوێنەی کرد کە خۆی و ئیناس تێیدا دانیشتن دوای ژنمارەبڕینەکەی عەبدورەحمان. ساتی بەئاگاهاتنەوەی کەوتەوە یادی کە بەجوانی نەیقۆستەوە... ئاواتەخوازبوو ڕۆژەکان بگەڕایەتەوە و ئەم بە ئیناسی بوتایە: «ئیناس گیان هەستە با نوێژی مەغریب بکەین.» لە نەفسی خۆیدا وتی: «دواکەوتنی بەئاگاهاتنەوە باجێکی قورسی هەیە، زۆرقورس! بەڵام باشترە لەوەی هەر بەئاگا نەیەیتەوە...»

صادقی بانگکرد و پێکەوە کەلوپەلەکانیان گواستەوە بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکەی ئەمجەد.

حەنان و دایکی لەلای دەرگاکەدا وەستابوون... پێش ئەوەی بڕوات، سەمیر پێی وت:

- « سوپاس بۆ هەموو شتێک»... صادق دایکی و نەنکی ماچکرد و دواتر لەگەڵ باوکیدا ڕۆیشت... حەنان بۆ ئەم دۆخەی خێزانەکەی گریا، سەری خستە سەر سینەی دایکی کە هەوڵی دەدا دڵنەوایی بکات...

لە ئۆتۆمبێلەکەی ئەمجەدا، فاتیمە و عومەر چاوەڕێی مامەیان و ئامۆزاکەیان دەکرد... بەجۆرێک پێشوازیان لێیان کرد کە هەستیان بە دڵخۆشی کرد.

ئەمجەد کەوتە ڕێ و ڕێگای شوقەکەی نەگرتە بەر، سەمیر پێی وت:

- ئەمجەد، لێرەوە نییە...

ئەمجەد زەردەخەنەیەکی کرد وەک ئەوەی شتێک دەشارێتەوە، وتی:

- ڕێگاکەم دەزانم... سەمیر سەیربوو بەلایەوە... پاش کەمێک وتی:

- ئەمجەد ئێمە لە شوقەکە دووردەکەوینەوە.

- ئێمشەو لەلای من دەبن.

- نا نا، سوپاست دەکەم.

- خۆ بەدەستی خۆت نییە...

گەیشتن... خواردن سازکرابوو... سادەیی، کەشێکی خۆشی خێزانی، دڵخۆشبوون بە میوانەکان... سەمیر تێگەیشت بۆچی ڕووحی ئیناس پەیوەست بووبوو بە ماڵی مامەیەوە...

پێش مەغریب، براکانی سەمیر و منداڵەکانیان پەیتا پەیتا دەهاتن... سەعید، عاصم، تالە و مێردەکەی و برازاکانی... هەموویان بەخێرهاتنی سەمیریان دەکرد... چی ڕوودەدات؟ کەشی ئاهەنگێکی مەزنە! تەنها سێ ڕۆژ تێپەڕیووە بەسەر ئەو کارەساتەی هەمووانی شۆک کرد، مردنی ئیناس، هێشتا برینەکەی لە دەروونی هەمووواندا بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا بە لەدایکبوونەوەی سەمیر دڵخۆشبوون! وەک ئەوەی چەندین ساڵە سەمیر نێژراوەو و ئێستا ڕۆحی کراوەتەوە بەبەرا و دووبارە گەڕاوەتەوە!

ئەمجەد ئەم کەشەی دروستکردبوو، براکانیشی تێگەیاندبوو بۆ ئەوەی یارمەتی سەمیر بدەن لەژیانە نوێکەیدا، لەگەڵ ئەو خەمەی هەیانە بۆ لەدەستدانی ئیناس. هەر ئاوایش بوو، سەمیر هەستی بە قەرەبوو و دڵخۆشی و سینەفراوانی دەکرد، ڕووحی بەرز و باڵادەبوو دوای ئەوەی دوو ڕۆژی پێشتر دەکەوت و هەڵدەستایەوە.

لە قوڵایی ئەم ئاهەنگ و کۆبوونەوەدا، سەمیر تەماشای ئەمجەدی کرد، کە سەرقاڵبوو بە دروستکردنی کەشەکە و خزمەتکردنی میوانەکان... تەماشای کرد تەماشاکردنی سوپاس و پێزانین بۆ هەموو ئەوەی پێشکەشی کردووە، بەتایبەت لەسەر ئەوەی وتەکەی دایکی پێ وت پێش ئەوەی وەفات بکات

«هەرچی بکات هەر کورمە... خوا هیدایەتی بدات و لێی ڕازی بێت»

ئەم کۆبوونەوە گەشاوەیە کۆتایی هات کە ناونیشانێکی دیاریکراو یان هۆکارێکی نەبوو، براکانی سەمیر ویستیان هەڵسن و بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە...

لەگەڵی وەستان و پێیان وت:
- لەگەڵ ئێمە وەرە، ئەمشەو تۆ و صادق لەلای ئێمە بخەون...
- «بەڵکوو لەلای ئێمە دەبێت»... ئەمجەد دانە دانە تەوقەی لەگەڵ دەکردن و لە سەمیر دووری دەخستنەوە و بە سۆعبەتەوە پێی دەوتن:
- خوا کارتان بۆ ئاسان بکات... سەمیر هی ئێمەیە و کەستان ناتوانن بیبەن...

سەعید بە سەمیر وت:
- زۆرباشە، بەیانی دێم و پێکەوە دەچین بۆ پێشانگایەک دەگەڕێین... تۆ باشە؟

براکانی سەمیر هەستیان بەکەمتەرخەمیەکەیان کرد بەرانبەری کە لە ساڵەکانی بێ ئاگابوونیدا لێی بێزاربوون، ئیرەییان بە ئەمجەد برد لەوەی ئارامی گرت و لەسەر دەستی ئەو سەمیر گەڕایەوە... سەمیر وتی:
- دڵخۆشم دەکات، بەڵام حەزناکەم لە ئیشت بکەم...
- تۆ پێم بڵێ: کاتژمێر نۆ گونجاوە؟
- بەڵێ.
- زۆرباشە ان شاءالله ئەو کاتە لەلای تۆ دەبم. سلام علیکم.
- سەمیر وتی: «سەعید، یەک دەقە...» سەعید ئاوڕی دایەوە.
- «دەمەوێت خەرجی دەرمانەکانی دایکم بدەم»... هەڵوێستێک هاوشێوەی ئەوەبوو کە پێش بیست و دووساڵ لە نێوان عاصم و سەعیدا ڕوویدا، بەڵام ئەمجارە سەمیر تەنها تەماشایان ناکات کە پێشبڕکێیانە لەچاکەدا، لەگەڵیاندایە لە گۆڕەپانەکەدا... کەوتەوە بیری هەڵوێستەکانی ڕابردوو: دەبوو لە چ شوێنێکدا بێت و نەبوو؟ ستەمی لەکێ کردووە؟ چۆن قەرەبووی ئەوە بکاتەوە کە لە دەستی داوە؟ کارێکی مەزن و سەختە، بەڵام بڕیاریدا پشتیوان بەخودا بەردەوام بێت لەسەری...

سەعید پێی وت:

- سەمیر، تۆ ئێستا پێویستت بەو پارەیە بۆ بازرگانییە نوێکەت.

- تکات لێ دەکەم.

سەعید هەستی کرد بەوەی براکەی پێویستی بەوەیە شتێک ئەنجام بدات وەفای تێیدایە بۆ دایکی بۆ ئەوەی قەرەبووی هەندێک لەوە بکاتەوە کە لەدەستیداوە، ڕازی بوو، سەمیر بەدڵخۆشییەکی زۆرەوە هەموو خەرجییەکی پێدا، براکان گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان.

ئەمجەد و سەمیر وصادق لە ژوورەکەدابوون... سەمیر ویستی سوپاسی ئەمجەدی برای بکات... تەماشای کرد و وتی:

- ئەمجەد، نازانم چۆن سوپاست بکەم لەسەر ئەوەی بۆ منت کردووە.

ئەمجەد قسەکانی پێ بڕی وەک ئەوەی گوێی لەهیچ نەبووە و بابەتەکەی گۆڕی:

- لەسەر سیسەم دەخەون یان لەسەر زەوی؟ چەند بەتانیەک دەهێنم... بەخێرایی ڕۆیشت...

ئەمجەد -لەگەڵ ئەوەی کەسایەتیەکی بەهێزی هەبوو- شەرمی دەکرد لەوەی بیسەری سوپاس کردن بێت، بنیادەمێکی زۆر دڵپاکبوو، چاکەی دەکرد و هەوڵی دەدا ڕووبەڕوو کەس تاریفی نەکات.

ڕۆژی دواتر سەعید و سەمیر و صادق ڕۆشتن بۆ ئەوەی بەدوای پێشانگایەکی بچووکدا بگەڕێن... .لەکاتی گەڕانەکەدا سەمیر پەیوەندییەکی بۆ هات... ژمارەی قوتابخانەکەی ئیناسبوو... زۆر پێی سەیربوو!

قوتابخانەکەی ئیناس چیان دەوێت؟

- بەیانیت باش.

- بەیانی ئێوە باشتر.

- بەڕێز سەمیر، هیواداریـن سبەینێ کاتژمێر نۆ لـە قوتابخانەکەمـان ئامادەبن.
- بۆچی؟
- لێی گەڕێ با سوپرایز بێت.
- زۆرباشە، پشتیوان بەخودا... سەمیر زۆر پێی سەیربوو!

قوتابخانەکـە چ سـوپرایزێکیان هەیـە؟ لـەدوای مردنـی ئـەو چییـان لەمـن دەوێـت؟

شـوێنێکیان گرت بـە کرێ بۆ پێشـانگا کە پێنج بۆ شـەش ئۆتۆمبێلی دەگرت، بـەڵام سـەمیر زۆر دڵخۆشبوو پێی وەک دەرگایەکی ڕزق و ڕۆزی، منەتـی کەسـی بەسـەرەوە نەبوو تەنها خـودا نەبێت، نـە ئەبو عـەزام نـە زاهیـر. سـەعید لەگەڵ براکەیدابوو هەتا ئۆتۆمبێلێکی دەستی دووی کـڕی، بـەو ئۆتۆمبێلـە لەگـەڵ صادقدا گەڕانـەوە بۆ شـوقەکە.

صـادق بـە ورەیەکی بـەرزەوە سـەعی دەکـرد و باوکی هانـی دەدا. دواتـر سـەمیر قـاوەی بـۆ ئامادەکـرد... ئەمـە بـۆ یەکەمین جـارە دوای چەندیـن سـاڵ... پێشـتر خزمەتکارەکـە قـاوەی بـۆ دەهێنـان. قاوەکـە هەڵچوو و سـەر غازەکە پیسبوو، لەگەڵ ئەمەیشـدا سـەمیر دڵخۆشـبوو بـە کارەکـەی... کوپێک قـاوەی بۆ صـادق هێنـا، وەک قاوەکـەی جـاران نەبـوو، لەگـەڵ ئەمەیشـدا صـادق زۆر دڵخۆشـبوو بـە یەکەمیـن کوپـە قـاوەی باوکـی کـە بـۆی ئامادەکردبـوو!

سـەمیر دانیشـت و یەکەمیـن کەسـی کەوتـەوە یـاد کـە فێڵـی لـێ کـردووە: عەلـی، کڕیـاری یەکەمیـن ئۆتۆمبێـل... سـەمیر ژمـارە موبایلەکـەی هـەر لەلابـوو، بەڵکـوو ئـەو نامەیشـی لابـوو کـە وتبـووی: «خـودا تۆڵـەت لـێ بکاتـەوە»... سـەمیر پەیامێکـی بـۆ نـارد: «عەلی برام،

من ئەو کەسەم پێش بیست و پێنج ساڵ ئۆتۆمبێلێکم پێ فرۆشتیت و ستەمم لێ کردیت، لەوەیە ئەم پەیامەت پێ سەیربێت، بەڵام، دوای تێپەڕبوونم بە چەندین دۆخی جیاوازدا، لە خەوی غەفڵەت بەئاگا هاتومەتەوە و دەمەوێت تەوبە بکەم لەهەموو ئەو هەڵانەی ئەنجامم داوە. داوات لێ دەکەم شوێنێک دابنێی بۆ ئەوەی بێمە خزمەتت و بە بڕێک پارە قەرەبووت بۆ بکەمەوە»...

سەمیر بە دوودڵیەوە پەنجەی نا بە دوگمەی ناردندا: « تۆ بڵێی وەڵام بداتەوە؟ ئەی پەیوەندی ناکات و قسەی نەشیاوم پێ بڵێ؟ دووبارە دوعام لێ ناکاتەوە؟»

سەمیر چاوەڕێی وەڵامبوو... دوای کاتژمێرێک عەلی بە نامەیەک وەڵامی دایەوە، سەمیر بەترس و پەرۆشیەوە کردیەوە... دوو دێڕبوو:

- «برابەڕێزەکەم، مادام کارەکە بەوشێوەیە مافەکەی من شیرینی هیدایەتەکە،

لە دونیا و قیامەتدا گەردنت ئازابێت»

سەمیر لەخۆشیدا فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە، دەرگاکانی قبوڵبوون بەڕوویدا دەکرایەوە، گرێکانی ڕووحی دانەبەدانە دەکرانەوە.

سەمیر لەسەر جێگا نوێکەی ڕاکشا، بیری دەکردەوە لەو پەیوەندییەی لە قوتابخانەکەی ئیناسەوە بۆی هاتبوو: «دەبێت چییان بوێت؟

بۆ ساتێک بیری لەوە کردەوە کە پێی دەڵێن: « هەڵەمان کرد، ئیناس نەمردووە، ئیناسمان بینیوەتەوە»... دڵی بەخێرایی لێی دەدا و بزەیەکی کرد، بەڵام دووبارە ئەوەی بیری خۆی خستەوە کە ڕازییە بەو قەدەرەی بۆ دانراوە...

سـەمیر خـەوت، ڕۆژی دواتـر بـۆ نوێـژی بەیانـی هەسـتا و صادقیشـی هەسـتان... خۆری ئـەو ڕۆژە هەڵهات... صـادق نانی بەیانی ئامادەکـرد... پێکـەوە نانیـان خـوارد و بـەرەو قوتابخانەکـەی ئینـاس کەوتنـە ڕێ...

ئینـاس تاکـە خوێندکاربـوو کـە لـەو ڕووداوەدا وەفاتـی کردبـوو، کاریگەرییەکـی قوڵـی بەجێهێشـتبوو...

سـەمیر و صادق گەیشتنە قوتابخانەکە... لەسـەر لافیتەیەکی گەورە نووسـرابوو: «ئینـاس، لەیـادت ناکەیـن»، زۆربـەی خوێندکارەکانیـش باجێکیـان پێوەبوو لەسـەری نووسـرابوو: «ئینـاس، لەیادت ناکەیـن»... حەنـان و دایکیشـی لـەوێ بـوون... مامۆسـتایەک هاتـە نزیکی و پێی وت:

- ئـەم چالاکییـە خوێنـدکارەکان سـازیان کـردووە وەک وەفایـەک بـۆ ئینـاس.

ڕیم، خوێندکارێکی سیانزە سـاڵانە، دوو سـاڵ لە ئینـاس گەورەترە، ئـەو بـە ئینگلیـزی قسـەی دەکرد، قسـەکانی بەم شـێوەیەبوون:

- «ئەمـڕۆ ئێمـە دوای ڕووداوێکی بـە ئـازار کۆبووینەتـەوە، کە یەکێک لـە پاسـەکانی قوتابخانەکەمـان تووشـی ڕووداوێکـی هاتوچـۆی سـەخت هـات، هیـوای سـەلامەتی بـۆ ڕزگاربـووەکان دەخوازیـن و دوعـا بـۆ هـاوڕێ بریندارەکانمـان دەکەین کە بەزوویی چاک ببنـەوە. یـەک کـەس لەگـەڵ ئێمـە نییـە و لـەدوای ئیمڕۆیش لەگەڵمـان نابێت. تەنها دوو هەفتە دەبوو ئیناسـم دەناسی. بەهۆی هەڵوێستێکەوە زۆر نارەحەتبـووم، لەکاتـی پشـووی نێوان وانەکانـدا دوور لەهەمـووان بـووم و دەگریـام. ئینـاس منـی نەدەناسـی، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەیشـدا هـات لەپەنامـدا دانیشـت... .بێدەنگبوو. دواتر پێی وتـم: «ئازیزەکـەم،

مەگری» دڵنەوایی کردم هەتا ئارام بوومەوە، بەخێرایی بووین بە هاوڕێ... زۆر خۆشم ویست! کچێکی پاک و باش و بەسۆزبوو، هەرچەندە ئەویش خەمبارییەکی پێوە دیاربوو کە هۆکارەکەیم نەدەزانی.

ڕۆژی ڕووداوەکە، ئیناس شتێکی پێبوو وەک حیجاب وابوو... ئەو ڕۆژە جوان و گەشییەکی تایبەتی هەبوو! هەستم کرد ئاسوودەیە، لەگەڵ خۆیدا کۆکە و ڕازییە لەخۆی... پێش ئەوەی هەر یەکێکمان سەر پاسەکەمان بکەوین، دەفتەرێکی لە جانتاکەم دەرکرد و وێنەیەکی خەندەئامێزی کێشا»

ڕیم وێنەکەی بە گەورەکراوەی پیشان خوێندکارەکان دا و ئەوانیش پێکەنین:



ڕیم لە قسەکانی بەردەوامبوو:

- «دواتر پێش ئەوەی سەر پاسەکە بکەوێت چاوێکی لێ داگرتم لەگەڵ زەردەخەنە شیرینەکەیدا، نەمزانی ئەمە کۆتا جارە کە دەیبینم... هەرگیز ئەو زەردەخەنەیەی لەیاد ناکەم»

ڕیم و خوێندکارەکان دەستیانکردە گریان و فرمێسک بەچاویاندا هاتە خوارەوە. ڕیم بەزۆر خۆی بۆ گیرا و وتی:

- ئەو ڕۆژە کە هەواڵی مردنەکەیم پێ گەیشت، نەمدەتوانی فرمێسکەکانم ڕابگرم... هەرگیز بەخەیاڵمدا نەدەهات ژیانی گوڵێکی بچووکی وەک ئیناس بەو خێراییە کۆتایی پێ بێت... لەخۆمم پرسی: کەواتە ئامانجی ئێمە چییە لەم ژیانەدا؟ شەو هەتا بەیانی ئەمدیو دیوم بوو نەمدەتوانی بخەوم، ڕۆژی دواتر موبایلەکەم هێنا و لە یوتوب نووسیم: (ئامانج لە ژیاندا)... گەیشتم بە سیمینارێک بەهەمان ناونیشان کە هی دکتۆرێکی ئەمریکیبوو، مولحیدبووە دواتر موسڵمانبووە... گوێم لەتەواوی سیمینارەکە گرت، بوونی منی ئاواژۆکرد... بەهۆی مردنی ئیناسەوە قوتابخانە نەبوو، دووبارە و سێ بارە گوێم لێ گرتەوە... لەهەموو جارێکدا هەستم دەکرد جیهانێک هەیە لەئێمە شاراوەیە گەرچی لەبەردەمیشمانە، شاراوەیەکە هێدی هێدی نەدەما... ئیناس وەک بروسکەیەک وابوو کە بەخێرایی ڕۆشنبوویەوە و دواتر خامۆشبوو، بەڵام دوای ئەوەی ڕێگایەکی پێشاندام منیش گرتمە بەر و جیهانێکی پڕ لەنوورم بینیەوە!

دەستم کرد بەخوێندنەوە بۆ ئەوەی بزانم بۆچی ئەو ڕۆژە ئیناس ئاسوودە و ئارامبوو... لەکۆتاییدا زانیم، ئیرەییم پێ برد و خۆزگەم خواست وەک ئیناس بومایە، بەڵێ... ئاواتەخوازبووم. ئێستا، بڕیارمداوە وەک ئەو بم»... .ڕیم لەچکێکی دەرکرد و کردیە سەری، دواتر وتی:

- ئیناس نەمردووە، وەک چۆن حیجابەکەیشی نەمردووە...

هەمــووان چەپڵەیەکــی توونـدیــان بــۆ لێــدا... ڕیــم وردەکاری ئــەم کارەی بــۆ کــەس بــاس نەکردبــوو، ئــەوەی کــردی لەگــەڵ ئاڕاسـتەی قوتابخانەکەیـدا نەدەگونجـا... بـەڵام مەزنـی هەڵوێسـتەکە و ڕاسـتگۆیی قسـەکان و جۆشـی سـۆزداریی وای لـە خوێندکارەکان و هەنـدێ لەمامۆسـتاکان کـرد زۆر پێـی سەرسـام ببـن و چەپڵـەی بـۆ لـێ بـدەن!

بە دوو چاوی پڕ فرمێسکەوە، سەمیر تەماشایەکی حەنانی کرد، ئەویش دەگریـا، بەڵام ئەمجارە وەک شـانازی کـردن بـە ئیناسـەوە و تامەزرۆبوون بۆی... چاویان بڕیە چاوی یەکتری... سـەمیر هەسـتی بـە سـۆز و خۆشەویسـتی کـرد بەرانبـەر حەنـان... ئـەو هیوایـەی بەهێزتربـوو کـە ڕۆژێـک لـەڕۆژان دەگەڕێتـەوە بـۆ لای و پێکـەوە ڕێگای چـوون بـەرەو خـودا دەگرنـە بـەر...

سـەمیر زۆر دڵخۆشـبوو، ڕووخسـاری ئیناسـی لـە ڕووخسـاری چواردەوریـدا دەبینی، لـە ڕووخسـاری هاوڕێکانـی و لـە ڕووخسـاری بـرا و برازاکانـی و صادقـدا...

بـۆی دەرکـەوت کـە دوێنـێ شـەو بـە خـۆی وت: ئایـا قوتابخانەکـە پێـم دەڵێـن:

« هەڵەمـان کـرد، ئینـاس نەمـردووە، ئیناسـمان بینیوەتـەوە»... خەیاڵێک نەبووە، بەڵکوو ڕاستیەکبوو وەک چۆن ڕیم وتی: «ئیناس لەنێوانماندایـە و نەمـردووە»، لەنێـوان هاوڕێکانیـدا چەندیـن ئیناسـی تریـان بینیـەوە.

پێش ئـەوەی کچەکـەی بمرێت، سـەمیر لەهەمـوو ژیانـی بێزاربـوو لـە ئینـاس نەبێت، بـەڵام ئـەو دەمـەی لـە مردنـی ئیناس پەندی وەرگرت، هەمـوو ژیانـی بـە خۆشـی و پێکەوەژیـان و ئولفـەت دەبینی!

لەقوڵایی ئەم ڕووداوانەدا کەسێک ئامادەیی نەبوو... کێیە؟ ئەشرەفە!

سەمیر لەقوتابخانەکە دەرچوو، بە صادقی وت:

- وەرە بابچین بۆ لای ئەشرەف.

سەمیر دوودڵبوو لەوەی چۆن ئەم شتە سەختە تێپەڕێنێت، چۆن هەواڵی مردنی ئیناس بە ئەشرەف بڵێت؟! بەدرێژایی ڕێگاکە دوعای دەکرد... ئەشرەف هەستی کرد شێوەی باوکی و صادق بەجۆرێکە: خەمێکیان هەیە و شاردویانەتەوە...

سەمیر بەقسەی جوان و پڕهیوا دەستی کرد بەقسەکردن، داهاتوویەکی جوانی بۆ ئەشرەف نەخشاند و چەند مانگێکی تر دێتەوە ناومان... ئەشرەف سەیری لەم قسانە دەهات، ئەمە ئەو باوکەی نییە کە دەیناسێت! ئەم قسانەی تەنها لە ئیناسەوە دەبیست...

دوای ئەم پێشەکیە جوانە سەمیر هەواڵە ناخۆشەکەی پێ وت... زۆر قورسبوو بەلای ئەشرەفەوە... لەسەر ئەژنۆ کەوت و زۆرگریا...

- «ئەشرەف، ڕۆڵەگیان، ئازیزەکەم، دونیا بەردەوامە و لەبەهەشت دەگەینەوە بەیەکتری... ئەوەی لەسەرمانە ئەو چەند ڕۆژەی ئێمەیش لەژیاندا ماومانە گوێڕایەڵی خودا بکەین»... دوای چەندین ساڵ بۆ یەکەمین جار سەمیر بە ئەشرەف دەڵێت: ئازیزەکەم... بەقورسی وتی، بەڵام هەستی بەئاسوودەییەک کرد وەک ئەو کەسەی قەرزێکی قورسی لەسەربووە و ئێستا وردە وردە دەیداتەوە!

ئەشرەف بەزۆر خۆی بۆ دەگیرا، هەستا و فرمێسکەکانی سڕی، باری سەرشانی سووکبوو کە بینی دوای مردنی ئیناس سەرلەنوێ باوکی و براکەی لەدایکبوونەتەوە و ژیانێکی نوێیان دەست پێ کردووە، هەردووکیان قسەی باشیان بۆی کرد و مژدەی ڕزگاربوونیان پێیدا...

سەمیر لە پێشانگا سادەکەیدا دەستی کرد بەکارکردن، ڕووبەڕووی نارەحەتی بوویەوە، قازانجەکەی سنووردداربوو، بەخاوی گەشەی دەکرد، وەک جاران بازی گەورە و بەرزنەبوو، زۆربەی ئەوشتانەی لەلای ئەو پێویستیبوو، بوو بە کەمالیات و وازی لێی هێنا... لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئاسوودە و دڵخۆشبوو، ئەرێنیانە تەماشای خۆی دەکرد و دڵئارامدەبوو بەوەی خودا یارمەتی دەدا، لەدڵەوە هەستی بە نیعمەتەکان دەکرد... ڕازیبوونی خودای نەدەپێوا بەو نیعمەتانەی کە پێی بەخشراوە، بەڵکوو زۆر بەقوڵی لەمە تێگەیشتبوو کە:

(خودا دونیا دەبەخشێت بەوەی خۆشی دەوێت و خۆشی ناوێت، ئیمانیش تەنها دەبەخشێت بەوەی خۆشی دەوێت).

ڕاستە سەمیر چەندین ساڵی لەدەستچوو لە ڕێگایەکی هەڵەدا...
ڕاستە شتی زۆری لەدەستدا و بە قورسی باجەکەی دا...
بەڵام پەڕەی ڕابردووی پێچایەوە،
ئازاری گۆڕی بەهیوا، دواکەوتنی گۆڕی بەپێشکەوتن...
بەرز فڕی، دونیای بە ئەندازەی ڕاستی خۆی بینی...
بەهێز و تواناوەوە چووە ڕێگا و گۆڕەپانێکی ڕاستەوە،
ئەم دروشمەی بەرزکردبویەوە:

﴿وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ لە پێناوی ئەوەدا **پێشبڕکێکەران** پێشبڕکێ بکەن.

***

﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٨٢﴾﴾

# خاتیمەی کەلام

دوای ماندووبـوون و شـەونخونییەکی زۆر، بـە پشـتیوانی خـودا توانیمـان بـە هاوبەشـی لەگـەڵ مامۆسـتا (ئەیـاد فەهمـی) ئـەم ڕۆمانـە ناوازەیـە بخەینـە بەردەسـتی خوێنەرانـی ئازیـز. زۆر سـوپاس بـۆ خوشـکی ئازیـزم (ڕێـکان طـه) بـۆ ماندووبوونـی لەگەڵـم.

خوێنـەری ئازیـز، کاتێـک ئـەم ڕۆمانـە دەخوێنیتـەوە، لاپـەڕە بـە لاپـەڕەی زیاتر ڕات دەکێشێت و تامـەزرۆت دەکات، بـەڵام ئامۆژگاری من بۆ ئێوەی ئازیز ئەوەیە دوای تەواوکردنی ڕۆمانەکە، ١٠لاپـەڕەی سـەرەتای بابەتـی یەکـەم (لەکوێـوە دەسـت پـێ بکـەم؟) دووبـارە بخوێننـەوە، کـە ئـەوەت ئەنجامـدا، ئـەوکات دەزانیـت لەبەرچـی ئـەم پێشـنیارەم کـردووە...

هەتـا بابەتـی سیانزەیەم من وەرگێڕانـم بـۆی کـردووە، لـە بابەتـی سـیانزەیەمەوە هەتـا کۆتایـی (م. ئەیـاد فەهمـی) وەرگێڕانـی بـۆی کـردووە...

لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیم

وەرگێڕ: ڕۆژان عادل وەرمەزیار

***

